

# پەندەکانی پیرەمێرد




کۆکردنەوە:
ڕەفیق ساڵحی

بسم الله الرحمن الرحيم

# پەندەكانی پیرەمێرد


كۆكردنەوەو ساغكردنەوەی:

رە فێق سالە حی

فایەق هوشیار

مستەفا ساڵەح كەریم

مەحموود ئەحمەد محەممەد

محەممەد نوری توفێق

ئەحمەد زرەنگ

| | |
|---|---|
| سرشناسه | پیره میرد ۱۲۴۶-۱۳۲۹ توفیق محمود ئاغا |
| عنوان قراردادی | په نده کانی پیره میرد |
| عنوان نام پدیدآور | توفیق مخمودئاغا |
| مشخصات نشر | : سنندج : هه ژار ۱۳۹۰ |
| مشخصات ظاهری | ۶۵۶ ص |
| شابک | ۹۷۸-۹٦٤-۷٥۷۳-۲۰-۰ |
| فهرستنویسی | : فیپا |
| موضوع | په ند |
| شناسه افزوده | ره فیق ساله حی ۰ |
| رده‌بندی کنگره | ۳۲۷pir/س۷۴۴ت۰ ۹۱۳۹۰ |
| رده‌بندی دیویی | ۲۲/فا۸ |
| شماره کتابشناسی ملی | ۲۲۱۶۸۴۵ |





## ناسنامه‌ی کتێب


نێوی کتێب : په‌نده‌کانی پیره‌مێرد

هۆنراوه‌ی پیره‌مێرد

پیت‌چینی ئه کره م موعته قدی سنه

نۆره‌ی چاپ دووه م ۱۳۹۳

نرخ : ۲۰۰۰۰تمه ن

ژماره‌ی چاپکراوه :۳۰۰۰ دانه

شابک :۰-۲۰-۷٥۷۳-۹٦٤-۹۷۸

ناوه‌ندی بلاوکه‌ره‌وه:سنه بلاوگه ی هه ژار ته له فون

۰۸۷۱۲۲٥۳٦۲٥

## وتەیەک

خوێنەری ئازیز!

ئێمە کە دەستمان‌دایە کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەو لێک دانەوەی سەرجەم شیعرەکانی (پیرەمێرد)، لە پێشەکییەکەیدا بەڵێنی ئەوەماندا کە (پەند)ەکانیشی ساغ بکەینەوە.

هەر چەند خوالێخۆشبوو مامۆستا کاکەی فەللاح لە سەرەتای حەفتاکاندا چوار بەرگی قەوارە بچووکدا ئەو پەندانەی لە چاپ دابوو بەلام ئێمە بە پشت بەستن بە دەستنووسەکانی پیرەمێرد توانیمان بە شێوەیێکی ڕێک‌وپێک گشت پەندەکانی کۆبکەینەوە. (پیرەمێرد) ئەم پەندانەی لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بەروداوا بلاو کردوونەوە، هەمیشە ئەوەی ڕەچاو کردوە کە پەندە کە لە تەک بارودۆخدا بگونجێ، بۆیە هەر پەندی وێنەیێکی کاریکاتۆریی سەربەخۆیە. شاعیری گەورەی کورد (پیرەمێرد) لە دستنووسەکەیدا بەشی زۆری ئەو بۆنانەی دەست‌نیشان کردووەکە پەندەکەی تێدا گوتراوە، هەروەها ناوی ئەو کەسانەشی بردوون کە پەندەکان دەیانگرێتەوە، بەلام ئێمە نەمانویست ئەوانە بخەینە بەرچاو. یەکەم پەندی پیرەمێرد لە ژمارە (۳۲۳)ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوکراوەتەوە، بۆیە ئێمەش ژمارە (۳۲۳)مان بەو پەندە داوە، ئیدی بەرودوا گشت پەندەکانمان ساغ کردونەتەوە، تەنانەت ئەو جیاوازی‌یانەشمان باس‌کردووەکە لە نێوان کارەکەی ئێمە چاپەکەی کاکەی فەللاحدا هەیە بۆ ئەوەی خوێنەر ئەو حەقیقەتە بزانێ کە ئێمە پاش ساغ کردنەوە ئەو جا پەندەکەمان نوسیوەتەوە.

گرنگیی ئەم پەندانە لەوەدا دەردەکەوێ کە (پیرەمێرد) بە شیعرێکی سادەو

ڕەوان قسەی نەستەق‌و پەندی پێشینان‌و توانج‌و پلار لە هەموو کردارێکی نالەبار دەخاتە پێش چاو.

خوێنەری بەڕێز:

ئەم پەندانە وەک لە سەرەوە ئاماژەمان کرد لە ژمارە (٣٢٣)ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا دەست پێ‌دەکات، ژمارە (٤٢٧)ی پەندەکان دواپەندن کە لە ژمارە (٤٢٧)ی ژیان‌دا بلاوکراوەتەوە، لە ژمارە (٤٢٨)ەوە ئیدی لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بلاوکراونەتەوە تا دوا پەند.

ئومێدەوارین بەم کارەمان توانیبێتمان خواست‌و ئاواتی خوێنەران بهێنینەدی کە ساڵەهایە چاوەڕێی ئەم پەندانەن بە شێوەیەکی ڕێک‌وپێک بخرێتە بەر دەستیان، وە بەم کارەشمان کەلێنێکی گرنگمان لە کتێبخانەی کوردی‌دا پڕ کردبێتەوەو گیانی پیرەمێردمان ئاسوودە کردبێ.

لیژنە

کۆتایی ساڵی ١٩٨٨

لەدووی سیاسەت خۆت مەخەرە بەند
ڕێوی قەواڵەی پێ بوو، پێستیان کەند

تخوون بە پیاوی سەرچەوت مەکەوە
بە دەست قەرز بدەو بە پێ دووری کەوە

دوو گوێو زبانێ دراوە بە تۆ
دوو بیبەو یەکێ بڵێ لە سەرخۆ

دوشمنی ناوخۆت ڕەگ دەردەکێشێ
دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقلیشێ

لە هەموو هەورێ باران نابارێ
ڕاز کەوتە زارێ، ڕاست کەوتە شارێ

ئەوکانیەی ئاوی لێ دەخویتەوە
بەردی تێ مەخە تینوەبیتەوە

بە سوێندی درۆ خۆت مەخەرە داو
تاریکەشەوە گەلالی لە ناو

ئەوی ئەیەوێ سەری نەیێشێ
بەقەد بەری خۆی پێ ڕادەکێشێ

گەورە کە یەک بن میللەت سەر دەخەن
دەڵێن دوو ڕێوی شێرێ کەوڵ ئەکەن

ئێشت بە دەست بێ هیوات لێ دەکەن
دار کە بەری گرت پەلی پیا دەدەن



پارە خەرجی کەی، دەبڕێتەوە
بە خەرج نەکردن کۆدەبێتەوە
مەعاشی بەلاش، بێ پێتەو بێ خێر
دەستی ماندوو لە سەر زگی تێر
ئاغای تەماعکار هەر دەڵێ بیدە
کەر بە جۆ بمرێ ئەوسا شەهیدە!
دێی فرەکوێخا ناحەسێتەوە
بزن هەر جارێ دەڕووێتەوە
کەس و کار لە پیاو جوێ نابێتەوە
تفی بەرەو با، ریش ئەگرێتەوە
وەختێ کە ژن بوو بە گەورەی گەڕەک
با ئیتر ئێمە دەست بدەینە خەڕەک
بێ کاسبییە ئەم شەڕو حاڵە
دیارە تەبەقی پڕ، ئاشتیماڵە
وا دامەنیشە بە دەستی بەتاڵ
تیا نەگری، مەمک نادرێ بە منال
ڕاستە دوو میوان لێکیان خۆش نایە
بەلام خانەخوێ لە هەردوو لایە
قەت ڕێک ناکەون گەورەی ئەم شارە
تاریکایی شەو ئێوارە دیارە...



زۆردارو هەژار، وەک سەرماو هەتیو
بزن هەولی گیان، قەساب هەولی پیو
دەولەمەندی رژد خۆی هەلئەکێشێ
پارە مێشێکە لە گووش دەنیشێ
لە قاپی نامەرد مەکە (دەق و لباب)
بێ گوشت بە، نەوەک منەتی قەساب
لە پردی نامەرد مەپەڕەوە
(جەردە) رووتت کا، با لەم بەرەوە
ئەمڕۆ پێویستە تۆ بە دۆست دەرچی
کە باران نەما (کەپەلەک) بۆچی؟
(بەخیل) خۆی نایخواو هەولیشی زۆرە
(مالی خۆنەخۆر)، بۆ (چەکمە بۆرە)
چرای درۆزن ساتێ دەگرێ
بەرەیش هەر لە لای تەنگی ئەدرێ
درۆزن ئاگری لە مال بەربووبوو
وتیان درۆیە، کەسی بۆ نەچوو
سوحبەتی نادان، تال رابواردنە
لە دووری کەر رۆین، تەرس بۆن کردنە
هێندە بەرز مەفڕە، بلێن بێ باکە
دیارە بێ باکی هەر بۆ خوا چاکە
توورەکەی جۆ، بۆ کەری دیز پێوی
تۆپینی دەوێ و زەرەی خێوی



هەرچەند دۆست لە لات وەک براوکەسە
هێنـد ئامشۆی مـەکـە، پێت بلێن بـەسـە!

کــە زانیــت شــەوەو دزت لــە دەورە
دەســت بــە کــڵاوی خۆتــەوە بگــرە!

کــە شــێوەییــت دی، بــڕۆ تێپــەڕە
ســەگــی ســەرملــە، بــە دو لا وەڕە

گۆیی ڕانەکێـشی، زۆر کـەس بێ گوییـە
(کوتـەک) دەزانـێ (قۆنـاغ) لـە کوییـە

بــۆ چــەنــەبــازی کــە نــەزان دووە
لــە بــەهــەشــتەوە کوتــەک هــاتووە

ئەوی بۆ مـەنسەب بـەرچاو چـوو، فێـرن
لـەگـەڵ لـێ کـەوتی ڕوو وەردەگێـڕن



لــە ڕووی جیهــاندا تــۆ وەرە پــاک بــە
ئەوسا لـە واتـەی خـەڵـکی بـێ بـاک بـە
هیچ کەس لە واتەی خەڵک ڕزگار نابـێ
پیـاوی قـین لـە زگ، قـەت بـە یـار نابـێ
بـە هیـوای هاوسـێ بـێ چێـشت ئـەمـێنی
چاوەڕێی دەسـت بی، هـەر خـەو ئـەبـینی
چاو مـەبـڕەرە دەسـت، خـراپ فێـر ئـەبی
بە پارووی خەڵـکی، درەنـگ تێـر ئـەبی!
کـــە قـــەڵـــبی (ئیقبـــال) لابقائییـــە
بـــە کـــەم هـــەڵـــکردن، پادشـــاییە
تاخۆت دۆست نەبی، کەس نایێ بە کەس
چەپڵە لێ نـادرێ، بـە تـەنهـا یـەک دەس
بـۆ دۆسـتت چاکـە، غـەیـر بـێ ئـەنجامـە
مـــاڵ ڕاوەســـتابێ، مزگـــەوت حـــەرامــە
بـۆ دونیـا دەبـێ دەسـت بـدەیتـە دەسـت
هیچ کەسێ، هیچ کەس ناباتە بـەهـەشـت
دەوران دەوڵــەتــت لــە دەســت دەســێنێ
بـەڵام نـاوی چـاک تـا سـەر ئـەمێنـێ
نیـەتـت چاک بـێ ئـیش دەبـەیتـە سـەر
درەخت (زڕ) نەبێ، هـەر بـۆت دێتـە بـەر



کە دوژمنت کەوت تۆ پێی پیا مەنێ
زەبون کوژ مەبە، لای خوا لامەنێ

سەرمایەت بۆ خۆت، زەکاتن بۆ خودا
مێو کە بیبڕی چاکتر بەر ئەدا

زۆر بە سەر دۆستا مەیێی خەتەرە
تانەی دۆست لە تیر دوژمن بەدترە

ڕاستە دوو میوان لێکیان خۆش نایێ
بەڵام (خانەخوێ) لە هەردوو لایێ

تۆ چاکە بکەو بیدە بە ئاوا
خەڵکیش نەزانێ، لای خوا نووسراوە

کردەوەو ئیمان هاتوونە نوشوست
گەورە ئاوی ڕشت: بچووک پێی لێ خست

کە باوەڕت بێ، هیوایشت دەبێ
کە بێباوەڕ بی، چیت دەست ئەکەوێ

هەم پیاوی دونیا، هەم پیاوی ڕێی خوا
ڕەک (بارۆی) ناو جۆ لە دوو لا دەخوا



ئـەولادتـان بـە نـاز پـەروەردە مـەکـەن
چـاک نـابن خۆتـان ڕەنجبـردە مـەکـەن

مــیرات، میقـــرۆبی شـــەڕی ئـــەولادە
بێ ڕەنـج دەسـتکەوتـوو، ئـەدرێ بـە بـادا

بـە مـیراتی عـیلم، کـوڕ ئـەبـێ بـە پیـاو
ئـەولاد بـە ڕەنجـی شـانی دێتـە نـاو

ئەولەمەند هەر چەند خەڵکی لە دەورە
بایـــەخـــی نیـــە ســـێبەری هـــەورە

هیچ کەس مالی خۆی بە کەس نەداوە
کـە چـی ئامـەشـۆی دەولـەمـەنـد بـاوە

دەعوایـان هاتـە سـەر هـەلات بـازی
قـەت دوو کـەس نـابن لـە قـازی ڕازی

یـــاخوا دەردەگـــا نـــەکـــەوێتـــە دێ
پاقلـــە تـــەواو بـــوو، وا باینجـــان دێ

بـێ هـەمـدەم مـاوم کـزو ڕەنجـەڕۆم
منـــیش خـــەریکـــم باینجـــان بخـــۆم

ئـەگـەر خـوا دەگـا تـرێ پـێدەگـا
بێ قرەی گۆمرک من سەرخۆش ئەکا

ئێتــر کــەس ڕەخنــە لــە مــن نــاگرێ
بـــا بـــە ســـەر خۆشـــی نـــاوم بـــبرێ

بـەلام کـە ترێ منی سـەرخـۆش کـرد
ڕەسمـی ئـەسێنێ قۆلـچی دەسـت و بـرد



بە چکە چکە قەرز نابڕێتەوە
سەد بەرتیل قەرزی نابژێرێتەوە
ئەگەر چەسپاندن بێتە سەر تکا
بڵێن تێکۆشان ئابرووی تکا
کە من ئاغا بم تۆیش وەک من ئاغا
بەڕەشڕەمان کێ بێ بۆ داخا
ئەڵێن: ئاو دێنن خۆشی خۆشییە!
بۆ هاوین نەبێ ئاومان بۆچییە؟
کێ معاش بۆ ناو ڕەت ئەکاتەوە
موفتیش شەرابی، مفت ئەخواتەوە
بە گفت سەرو ماڵ دریغی نییە
هاتە کردەوە بایەخی نییە
هەموو ولاتمان شوکر ئاوایە
قەرەداخ ناوی زەردی ئاوایە



کاولەکەی وەتەن هێندە شیرینە
ژاری دووپشکی عەربەت هەنگوینە

ئاو مهند بێ‌و پیاو مۆن، لێیان بترسە
لچ شۆڕ پەریش بێ، هەر ئێسکی قورسە

شەیتان پەلەی کرد بۆیە زەلیلە
ڕاوەستە حەلوا بێ لە بەرسیلە

کار بەدەست، دەستیان لە دەست هەڵبڕی
کاتێکت زانی خوا نانی بڕی

کە خۆت خودبین‌و بۆ خەلک بەدبین بی
نابێ لە دوایی ڕۆژت ئەمین بی

دۆستت ئەوەتە کە ئەتگرێنێ
دوشمن ئەوەتە پێت پێ ئەکەنێ



بە بێ ڕێ مەڕۆ هەر چەند قەدبڕ بێ
نانت گەنم بێ جۆیش هەرزانتر بێ

بێوەژن هەر چەند خاوەن دراو بێ
تۆ کچ بێنە با، کراسی جاو بێ

دڵدارت نەبێ بەهەشت زیندانە
هەرچی دڵ ویستی هەر ئەوە جوانە

کەر کورتان گوم کاو ئێمە بۆی بدرووین
دەستی وەیسکەیەو سووژنی پۆلایین

بە خاڵۆ خاڵۆ هات بەلامەوە
بوو بە تووڵەمار دای بە پامەوە

نازداری بەهار چەند شۆخو شەنگە
ئاخ بێ بەینەتە هێجگار ڕەنگ ڕەنگە

کە خوا پیاو سەرخا بە کەس نانەوێ
ئەم ئاسمانە، ئەستوونی دەوێ

ئەو کەسەی کە خوا قەدری داوە پێی
کەس لێی پرسیوە کە تۆ کوڕی کێی

مەسنەت نادرێ بە زۆری چەنە
لەم زەویە ڕەقە تووریێ هەڵکەنە

ئەوی بە ئاغام بە پاشام فێرە
بەراتی دێتە سەر دوو کولێرە

ئاە خوێندەواری نەزانی لایە
بۆ کردەوەیشمان ڕەهبەری چایە

کە سرکە توند بێ قاپ ئەقلشێنێ
لەش کراسی تەسک دائەتلیشێنێ

قـەل ویـستی وەک کـەو بـەخچـە بـڕوا
ڕۆیتـەکـەی شـێواو واشـی بـۆ نـەلـوا

هـەمـوو ڕاوچـی‌یـەک ئـیـساغا نیـیـە
هەر چی ڕیش سـوور بێ هـەمزاغـا نیـیە

تـەپاڵـە ئـاگری گـڕ ناکاتـەوە
پاشـەرۆک سـەوی پـڕ ناکاتـەوە



کەسی دڵسۆز بێ بۆ هەموو کەسێ
دەرگایشی نەبێ لە دز نەترسێ
بە قاسپە قاسپی کەو بایەخ مەکەن
دیتە بۆ ڕاوی جینسی خۆی دەبەن
پیاوێ دووربین بێ نابێ تەنیا بێ
کە دۆستی نەبێ دەستیشی نابێ
ئەوی بە توندی لە جێی خۆی هەستا
کاتێک ڕوانی ماندوو بوو وەستا
هەر چی ئەزانی بۆت ناچێتە سەر
مەیکە بە خولیاو بەکەڵکەڵەی سەر
نەزان، نەزانێ کە هیچ نەزانە
بەختیش ڕووی تێ کا خانە ویرانە
خود پەسند دیوی نەفسی نەدیوە
خۆی لە ئاوێنەی دیواندا دیوە
مەلا بەدخوو بێو بێ وەعز بدا
بە زۆر غەیبەتی خۆی بە خەڵک ئەکا
ئەو شێخەی مووچەی مرید و مرئەگرێ
دەمی (برنگ)ەو خوری پێ ئەبڕێ
بەو پارەیەی شێخ بەهەشت ئەفرۆشێ
نەتەوەی پیاڵەی مەی پێ دەنۆشێ
گەنجێ بە ڕەنج بێ ئەمێنێتەوە
میرات بۆ (نەوە) شەڕ ئەنێتەوە
ڕۆڵە ئەم پەندەم بە سەرمەشقت بێ
لە سەوداگەری، سەودای عەشقت بێ
بە عەشق ئازادەی هەر دوو جیهانی
کە عەشقت نەبێ لەشی بێگیانی

ئەو سەرەی سەودای عەشقی تیا نییە
کوولەکەی وشکی ئاوی کانییە

خۆشیان ئەوێی هێشوە خۆشناوێ
جنێو فرۆش بێ، باوکتت خۆش ناوێ

لە مەیدانا کەس دەنگی دەرنایە
کە دوشمن شکا زۆر کەس ئازایە

ئەوی هەڵکری بە وشکو تەڕە
لە ماڵی خۆیا شای بەحرو بەڕە

بەڕە شڕ دەشۆی بە ئاوی کانی
قەدری ئاو مەگەر لە چۆڵ بزانی

ئەوی ڕووبەڕوو تۆ هەڵدەکێشێ
پاش ملە بە داخ ئاخ هەڵدەکێشێ

ئێستا کە مووچەی جاسووس نەماوە
لە دوور ئەم نانە بەو ڕۆنە باوە

دیتە کە (بەز)یان بە (کتک) سپارد
چۆن پارەی پەزیان ژماردو بژارد

ئەوی بە کتک بەز دەسپێرێ
دیارە بز دارە پەزیش ئەبژێرێ

ئەڵێن گوێرەکە بە پەموو فێر بێ
دەست هەڵناگرێ زکیشی تێر بێ

کەوتووینە دەورێ جوان پیری ناوێ
ئەو دەورە گوزەشت چوار ژن بۆ پیاوێ

مسکێنو ئاغا لێک لەبیرچوونەوە
قوربانیو قوربان لە بیرچوونەوە

موشیرو سولتان وەک گورزو قەڵغان
هەڵگیران لەگەڵ سفرەی دیوەخان



وەجاخ کوێر ماڵی ئەبەشنەوە
کەر تۆپی ناڵی ئەکێشنەوە

لەم دنیایەدا کەس بێ غەم نییە
ئەگەر بێ غەم بێ بنیادەم نییە

کەوتووینە ڕۆژێ بوو بە وای نەفسی
زۆر کەس هەولی دا خودا نەینووسی

ئەڵێن تەور کلکی خۆی نابڕێتەوە
وای ئەبڕێتەوە کە نەبێتەوە

کورد بە عیبادەت دوعای مەقبوول کرد
لەیلەتولقەدری لە ژنا خەرج کرد

بەهار گیانداری پێ ئەژێتەوە
ئەترسم ماریش بیووژێتەوە

بیستوومە وردە مەئموور دەرئەکرێ
بەرە هەر لە لای تەنکی ئەدڕێ

ئەی ئەو کەسانەی کە کەم وەرئەگرن
دەست بە کڵاوی خۆتانا بگرن

ئیتر لەگەڵ کەس نابمە دەستە خوشک
منو ویرانەی پیرێژنو مشک

وەک جاران بێستان بەرەڵلا نییە
ئەم دووگە چەورە بێ بەلا نییە



بێکـار دەربـارەی دەوڵـەمـەنـد ئـەدوێ
پیـاوی ناهومێـد مـل لـە تیـغ ئـەسـوێ
زۆر پیـاو لـە دەورەی پیـاوێکی پیـاوە
گولـەبـەرۆژە ڕوو لـە هـەتـاوە
زۆر نـان بـڕاوان بـە هیـوا دەژیـن
بەڵام دارو گۆشـت ئاشـنای یـەک نـین
ئـەو کـەسـەی کـە دڵ برینـدار ئـەکـا
خـۆی بـە واهیمـە دەغـەزار ئـەکـا
کـەر خۆڵـەمێـشی بۆیـە خۆشـی ئـەوێ
تێیـدا دەگـەوزێو تێـر وەردەکـەوێ
بەدخـوویی منداڵ لای بـاوک شـەرمە
ژیشک بە بێچووی خۆی دەڵـێ نـەرمە
فـەقـێ بـۆ ڕاتـوو وا لـە بـەردەرگـا
دەچمە (وەکاشـە) کـە بـام لـێ دەرکـا
ئەوکەسەی دڵـی لەگەڵ خـەڵک پاکە
خـۆی پێـی دڵخۆشـەو لـە بەد بێ باکە
ڕۆژێ ڕووی ئـەزەل ئـەت دۆزێتـەوە
بـێ کـەڵـەشـێریش ڕۆژ ئـەبێتـەوە
ئینجـا دەردەگـا ڕووی کـردە وڵات
تـرێ گـەنانـە و چاوێشـە داهـات
بـەڵـێ بـەرسـیلە ئـەبـێ بـە حـەڵـوا
بـەڵام عومریـشت بـە تاڵـی ئـەڕوا
تـا نـەبارێتـێ بـاغ گـەشـکە ناکـا
تـا نـەگارێتـێ،مر، هێلکـە ناکـا

کــەمــی نــەبــینی دەوڵــەتــت بۆشــە
بــەفــراو لــە چلــەی هاونیــا خۆشــە

ئــەوی دەوڵــەتی هــەر بــۆ خــۆی ئــەوێ
خــەوی بــێ خــەفــەت نابینــێ شــەوێ

باڵــەشــۆڕیمان تێکــەوت بــە جــارێ
بۆیــە مــێش زۆرە گــەزو دەبــارێ



بە هیوای خەڵکی لووتی بەرزە بوو
لە باران ڕای کرد تووشی تەرزە بوو

وتی: چەفتاڵی وا مەڵلا ڕمیا
وتی: مەیزە، نمازت بڕیا

سێیەمین وتی: هەر خۆم خاسم کرد
نمازیان بڕیا دەنگم لێ نەکرد

جوولەکە ساڵێ هامان ئەکوژن
زۆردار هەر ڕۆژێ خوێنی ئەمژن

بە جوانی سووتا دەنکە هەناری
بەخت ڕووی کردە دیگونە چاری

سیاسەت بازیی دەردێکی وایە
بۆ دەوڵەمەندیش هەر بێ دەوایە

بۆیە گێڕۆدەن هێندێ بەو داوە
کوێر هەتا ئەمرێ بە هیوای چاوە

هیچ شارێ خۆشیی ئەم شارەی نییە
بەڵام ڕەشەبا بوارەی نییە

چەندم پێ خۆشە لە سای دەوەنێ
دانیشیمو ژن، مەشکە بژەنێ

با سەد تەیارە بۆمبا بە جۆێ بێ
من تەنها شلقەی مەشکەم لە گوێ بێ



دنیــــا ســــێبەرە دوای کــــەوێ دەڕوا
کــە ڕووت وەرگێــڕا ئــەوت دێ لــە دوا
تــا گــەورەتــر بی خــەفــەتــت زۆرە
کاتێــــک خۆشــــە بکــــەویــــە نــــۆرە
گــەورەیــی ئێــستا دەردی ســەردیــە
ئــەچــەوســێتەوەو لــە خــەو بــەرییــە
نایشــــڵێن بــــۆ ئێمــــە جــــستوجۆیەتی
ئــەڵــێن کردوکــۆی هــەر بــۆ خۆیــەتی
ئــەوســا پــشتێنی لــێ دەکــەیتــەوە
کە خــۆت لــە بێ‌کــار جوێ بکــەیتــەوە
ئــەم دنیــــا حیــــزە بــــەری زۆر دوورە
هــەتــا تــۆ بــڕۆی ئــەو حــوارو ژوورە
زۆر جــار چــاوی ڕەش کــاڵ ئــەبێتــەوە
ناڵــێن چــاو بــە چــاو ئــەکــەوێتــەوە
تیکــە قــووت ئــەدەن ناپرســن چییــە؟
ئــەم لوقمــە چــەورە بــێ (لــەقمــە) نییــە
کە لــەســەر خــواردن نــەڵێی نــاوی خــوا
ئــەڵــێن: جنۆکــە لــەگــەڵــت ئــەخــوا
دەستت لــە ئینسانی دڵ شکــست مــەدەن
بــڵی بیــسمیلا جوێتــت پــێ ئــەدەن
ئەگەر پشت بەستی بە دۆستی دوێنێ
(گەزی چی؟ و جاری چیت؟ بۆ دەمێنێ
بــەشــی خواردنــە مانگانــەی چنــۆک
حــەوز پــڕ ئــەبــێ بــە تنــۆک تنــۆک



گاڵتەی منالان هاتەوە کایە
بۆ، مقۆ، مقۆ، بوو بە سەرمایە
وا بە یاری کۆن گاڵتە پێک ئەکەین
لێمان زویر مەبن ناوی کەس نابەین
بە گەنم گەوج تێدەکەوێ
بەڵام (ڕێوی چوو) سیخورمەی دەوێ
(تاشە تەندوورە)ی زەمانە وایە
هەرچی کە سوار بێ شەقی لەدوایە
لەبەر چەپۆکان زۆر جل خوار بووە
(بابی بابی)یە وا کەر سوار بووە
نانی خۆت بجوو وەرکەوە لەوێ
کڵاو بفڕێنی خەڵک دووت ئەکەوێ
لە (سنگەوباز)دا ئەبێ دواکەوی
کە بووی بە خەلفە هەر تێ دەکەوی
کەس ناڵێ حەمام بە فوو گەرم ئەبێ
بە (پشت لێ دانە) کۆڵنج نەرم ئەبێ
ئەگەر (قاڕنەتۆپ) تەواو بزانی
لە (قەل و شار)دا وەستای چوار نانی
هیچ کەس بۆ سێباز هێزی نەماوە
ئێستا (کەوشەکەی عارەبی) باوە
بە خوێندەواری کار نایەتە گیر
مدیریی بووهبە (میرو گزیر)
(پەنای بێ دەنگ)ە تووڕەیی نابێ
ئەگەر سەد گوێچکەی تیا ڕاکێشرابێ

بــۆ بــێ ئابــڕوو زۆر چــشت موباحــە
ئــەوی بــێدەنگــە (کولــکی مزراحــە)

بە گوریسی خەڵک ئەچین بۆ داران
ئــەڵــێی، نــە بامــان دیــوە، نــە بــاران

خــوێن پــەڕییە ســەرت لووتــت ئــەپــژێ
کاســـە کــە پــڕ بــوو ئــەوســا دەڕژێ



که بووی به حەڵقەی بەردەرگای خەڵقی
بە سەرتا ئەدەن لە بەر بێ کەڵکی

دوای تەنگانەیی زۆر ئازادییە
(ش)ی شین زۆر جار (ش)ی شادییە

کفرەحمەد تا مرد قسەی لە خوا کرد
بەو حەقە لای حەق ئیمانی دەربرد

سۆفی ئارەقی لە لا حەرامە
لای من قاچاغ بێ ئەوسا بەتامە

نێرگەلە تووتنی عەجەم ئەکێشم
دووکێش‌و هووکێش خوێشی دەرویشم

ئاسمان ئاهی بێکەس شینی کرد
زەیل جێی ئەستێرەی کلکداری گرت

بێدەست تێی گوشێ زۆرداری بیخوا
دەست لێ مەدەن لە کردەوەی خوا

گەلاویژ هەلات شەوقی ئەگرێ
بەرگی فەقیرو هەژار ئەدرێ

کە بە ڕۆژ چرای نەوت بسووتێنین
لە تاریکیدا دۆش دادەمێنین

کە بە ئاوی پاک باخچە ئاو ئەدەین
لە تینوێتیدا دەم پێکا ئەدەین

ئەڵێن: ئەم بەفرە لە پێشدا ئارد بوو
قوونیان پێ سڕی بێ‌پێزو سارد بوو

زیندو و بووەو ڕاتبەی مەلایان
یاخوا ئەم جارە تا سەر بێ بۆیان

من خەستەی مارو میرووم لە بەر بوو
هەر لەم خاکەدا میری تورک میر بوو



ئـەگـەر ئـەتـەوێ نـەیـێن بـە گژتـا
ئامـادەی شـەڕ بـە لـە هـەمـوو وەختـا

لـە شـێنەیـشدا پـڕ چـەک بنوێنـە
دڵـی دوژمـنی پـێ بترسێنە



چوار کتێبی خوا چوار پەندی تیایە
کە گوێی لێ بگرن وەکوو کیمیایە
تەورات وتوویە قانع بێ تێری
زەبوور وتوویە بێدەنگ بێ شێری
ئینجیلیش ئەڵێ: تۆ دەرکەنار بە
لە دڵەخورپەی دنیا ڕزگار بە
قورئان فەرموویە پشت بە خوا بەستە
ئەختاتە ڕێی راستەوسایە بەستە
دوژمن بە چاکە ئاشت ئەبێتەوە
سەهۆڵ بە ئاوی گەرم ئەتوێتەوە
کە لەگەڵ بەدا هەڵسیو دانیشی
وەک شەکر لە جێی تەڕ هەو دەکێشی
ئەمەندە وێڵی بەرگو خۆراکین
نازنین خۆمان خۆراکی خاکین
کە وتیان مەکە شێت گیرتر دەبین
حەرام بەتامە بۆ شەیتان ئەژین
شەیتان هەنگوینی لە دەممان هەڵسوو
بۆیە ئەم خەڵکە بەگژ یەکا چوو
ئاردی ناو درک چۆنە وان ئێرە
فەرموو دوو دەستەی دۆست هەڵبژێرە
پێکەوە ناڕوین لە ڕێی ڕاستەوە
خوا ئەوە بگرێ شاری گواستەوە
بناغەی ئێرە ساڵی دووسەدە
وا دەردەکەوێ خاکەکەی بەدە

ئـەگێنـە کـە شـار قـەڵاچـوالان بـوو
دوانـزە سـوارەیـان مـەردی مـەیـدان بـوو
ئێـستا کـە مـەیـدان بـە سـەروگوێلاکـە
هــەر مــڕەمــڕە شــەڕی ســەر لاکــە



کچ بە نابەدڵ بۆ پیر چوو بە بووک
مێرد بێزارێ ئەکا شەو بە نووکەنووک
هانام بە تۆیە خوای دەستگیر
نەمکەی بە بووکو بکەومە دەست پیر
پیری پەک ئەخاو (بەستن) بیانووە
ئەمە چیرۆکی دەوری کوانووە
کولە نانی بۆ بەستوو بانگ ئەکەین
لای گولە نانێ بیسمیللا مەکەن
گروگاڵ لێمان کەوتۆتە دوان
گورگ پیر بوو دەبێ بە حەچەی سەگان
بەفرو هەڵەکۆک بە حەسرەتەوە
برجی پیرێژن نزیک کەوتەوە
مەعاشەکەمان بەشی دۆڕانە
بە دوو جەژنانەو سێ پاش تێلاتە
ئەعشارو ئەغنام وشکاییان هات
وردە مەئموران هەموو بووە بە لات
گەرای کوللەمان بۆ بژێتەوە
ئەکجا پێکورە ئەبووژێتەوە
کە مەشکەدڕە نەتەوەی بڕا
مەشکەی مەزبەتەی تەنزیلات دڕا
لاپوورە بە داو داهاتۆتە ناو
خورماڵی گێژ بوون وەک ماسی سەر ئاو
بەمانە خەڵکم لێ تەوەڵلا بوو
مەلا مەلا بوو بوار ئەولا بوو



ئەول نەمردین کەوتینە بەهار
بزانین دیاریمان چیێ بۆ دێ لە شار

زۆر کەس ئەبینین دەچێتە بەغدا
هەر وەک پەتکەو نابێ بە هەودا

ئەگەر هەر تیریک لە نیشان بدریت
بەرگی مامۆستای تیر ئەنداز ئەدریت

ئەڵێن پشتیوان هەر لە بەغدایە
هەر چی ریش سرور بێ بۆچ هەمزاغایە؟

قەساب تەمیزی بۆ دووکان ئەبێ
کە چی بۆ ئیمە گۆشت گران ئەبێ

عیسا میقرۆبی پاک ئەکردەوە
لە عیسایان دا مووسا بووردەوە

ئەڵێن گۆشتەکەی ئیستامان پاکە
بە سەد فلسیش بێ هێشتا چ باکە

نانەواخانە تەمیزو جوان بوو
لەو تولەیەدا نۆکمان گران بوو

نانی گەرم ئەخۆی تامی تامیە
کە سارد بووەوە گەنمەشامیە

رەئیس شارەزای ئەم خووانەیە
بەلام ئاخ مشتەیناو هەمانەیە

زۆر باران باریێ دەغل ژەنگ بینێ
ئاو زۆر مایەوە کرم هەڵدینێ

هەر چی کە کۆن بوو بێ تینە بۆشە
تەنها شەرابە تا کۆن بێ خۆشە

چاوی جوان ئەڵێن: پیاڵەی شەرابە
مەزەی سەرمەستی دڵەی کەبابە

ئەویش کە کۆن بوو کەس لێی ناپرسێ
زەق ئەکاتەوە خەڵک لێی ئەترسێ

نیسان سیوجگەری کرد بە چوار ئانە
بێزووی پێ دەکەین ئەڵبەت هەررانە

لە هەموو لاوە شایی کەوتە شار
دەنگی زورنا دێ بەهارە بەهار

ئەڵێن گیا لە سەر بنجی خۆی ئەڕوێ
وەجاخ زادە بۆچ خەڵکی لێی ئەدوێ

بۆچ مریشکی ڕەش هێلکەی سپیە
بۆچ پەیین فەیزو هێزی زەوییە؟

کە خوا دای هیچ کەس ناڵێ کوڕی کێی
دەستەلاتداری هەر خۆت گەورەی دێی

ئەوەی خوێندوویە بە ئقتیدارە
خانیش نەوەشێ ئەو هەر سەرکارە



نـــازانم بـــۆچی ئـــەم پـــەنـــدە بـــاوە
ڕەمـەزان بـەجـەنگـەو سـەفـەر بـەدنـاوە
پێم مـەڵـێن ریـست وەک خـوری خـاوە
کـوێر هـەتـا دەمـرێ بـە هیـوای چـاوە
ژوور دووکـــەڵـــی بـــوو ڕاکـــە دەرەوە
چـاوی ڕەشـی خـۆت کـاڵ مـەکـەرەوە
پیـاوان هێنـد ریـشیان تاشـی تاسـولووس
وا لـە تورکییـە ژن بـوون بـە مـەبعـووس
بـە خـۆت بنـازی کـارت لـە دوایـە
بـــە مێـــردی نیـــە دەڵـــێن بـــە خوایـــە
مـــەتـــەڵـــیان پرســـی نـــەم زانی کامـــە
ســەری حـەوت لـەشـکر ژێـری شـانامە
دەنـــدووک درێـــژەو ماســـی گـــر نیـــە
هێلکـــەکـــەریـــشە کـــەچـــی مـــر نیـــە
ڕەمـەزان ســێ تـەونی لـێ گرتوینـە دار
حـــــەوترنگێلـــــیو قومـــــارو خومـــــار
دزو خاوەنـد مـاڵ کـردەیـان یـەک خـەن
بـە کونـەبانـا گـاجووت سـەردەخـەن



ئـــەڵـــێن ڕەمــــەزان لاقێکـــی دەیـــە
کـــێ دی بزانـــێ ســـێ لاقـــی هـــەیـــە
لــە مزگــەوتــاندا کــەوتنــە (الــوداع)
ڕۆژوویـان تـەرانـد بـە «وەگـاع وەگـاع»
هێنـد لێـی تـووڕە بـوون بـە شـەڕو هـەرا
لـــە قـــاپی ســـەرا هێجگـــاری تـــۆرا
«لــەیلــەتولقــەدر»یــش ئــەبڕێتــەوە
وەک کـابرای کـوردە خـەرج ئـەبێتـەوە
بـــۆچ وتیـــان ڕۆژو ئێـــسکی گرانـــە
بـە چایـک ڕۆیـی ئـەو بـەستەزمانـە
ڕۆژو و کریـسمیس گـەینە سـەری ساڵ
هـــەر دوو پێکـــەوە گـــەیـــشتینە مـــاڵ
چـەرخو فـەلـەکمـان بـۆ هـەڵـخراوە
بـەلام کـەس هێـزی گوژمـەی نـەمـاوە
ڕاسـت بێـژە هـەر بـەشـی پـلارو پـەڵـە
دەور دەوری دەورەی ماینـە چـەقـەڵـە
«فەرز» گرانـە حـەز لـە سوننەت ئەکـەم
کـە ڕۆژوو نـەگـرم پارشـێو بۆچ نـەکـەم
ڕۆژی بیـــستو پێـــنج شـــایی لۆغانـــە
بـــە تلـــیلی‌لی چـــوون بـــۆ تـــۆی‌یانـــە[1]
پـاش جـەژنی بـۆ مـن ئـەلـلاورمانە
بـــەلام بارانـــەو جێگـــا نـــەرمانـــە
«ژیـان» ئـەلـێ: کـێ گـوێی لـە دەنگمانـە
پـارەی ئابوونـە بکـا بـە جـەژنانـە

١. تۆی‌یانە: بە تورکی مانای بووک هێنانە.

ئەوانەی کە شێو بە پشێو ئەکەن
فیکە بە برای نیوە لێو ئەکەن
زستان خستنیە تاریک‌و لێوە
سەد کوێر چاوساغێ نابا بە ڕێوە
کە هات سەرمەلا دەستنوێژی شکا
ئیتر کێ نوێژی ئەکا لە تەکا
مەلا سەر فیترەی کەمی وەردەگرت
ئیمامەتیەکەی بێ‌دەستنوێژ ئەکرد
ئەوانەی لەهجەی لامیان وەک ڕێیە
ئەزانن پیری شەوکێڵ لە کوێیە
ئەوانەی کە ڕێ بە غەین ئەخوێنن
جیلوەی فێڵبازی دوو قەوم ئەنوێنن
ئەوەی کە ناخواو پارە زۆرکەرە
گردکردنەوەکەی پارە زۆرکەرە
سکەی ئەشرەفی گوم بووبوو بە لاف
وا پێمان ئەڵێن: برۆ هەی ئەشراف



جـاران ئـەچوینـە سـەر بـاوە گورگـوڕ
ئەمان گوت هاتوین بۆ زگ پڕیو کوڕ
باوەڕمان نەکرد شەخسەو پیاوی خودا
تـا هاتـە بـەر پێـی پادشـاو گـەدا
کـوڕێکیوای دا بـە عاسمـە خـاتوون
پۆیلانـەی گـەیـە سـەد هـەزار ئاڵـتوون
ئـەوی منداڵـی نـەبێ نـەوت ئـەخـوا
منالـی ئـەبێ بـە مێـرد یـا بـە خـوا
کـارێکی گـەورەیتـر لـە بـەینایـە
هـەم دیـسانەوە ئـەویـش بـە خوایـە
جێ مەبعووسێکی کەرکووک مونحەلە
زۆرکـەس بـە هیـواو بـە پـەلـەپـەلـە
وەزیفـەی ئێـستا هـەمـووی بـۆ نانـە
لێـی ناگـەڕێـن ئـەم دەوڵـەمـەندانـە
هاتووینـەوە سـەر نـەرێـتی پێـشوو
بۆیـە کچێکمـان بـۆ نـادرێ بـە شـوو
کـە فـرە مـیر بـین بـەر تابـە بنـەسـەر
(بیرسـی یـا پـەڕاو برسـی یـۆزەر)
کاریان لـەگـەڵ یـەک هـەموو بە قینە
بـۆ نـان بـڕین بـێ تـووتن شـرینە
دووبـەرەکیـەو فیتنـە لـە نـاوە
هۆمـان کـەوتۆتـە گـوێرەکـەی لاوە



وا «ڕەشـــەمــێ»یــە مــڕمیاو مــڕمیاوە
بــۆرە ســوار بــوونی (داوود)دەمخــاوە
(مریــەم) بــەرنــادا هێنــدە بــە جۆشــە
تاکــەر لــە بــەغــدا نــەزەڕێ بۆشــە
ئــەمــە شــەرتێکــە بــۆ منداڵانــە
ئێــستا تــا حــەز کــەی هێنــدە ئاســانە
لــە خــەودا ســواری کــەر ئیعتیبــارە
بــەڵام بــە دیمــەن هــەر ئــەو ســوارە
بـورجی پیرێـژن ئـەمساڵ کـەم سـەختـە
ئەو لە پیـاوو زۆرتـر بـە ڕواوو بـەختـە
ئەگـەر بـێ و بیکـا بـە زوقـم و سـەهـۆڵ
هــەزارەکانمــان چــی دەگرنــە کــۆڵ



کە شاخی گوێژە بەفری چووەوە
پەندی پێشینان زیندوو بووەوە
پێم بڵێ ڕۆڵە لەبەرت دەمرم
خشتم تێ بگرێ بەردت تێ دەگرم
کەواکەی خۆمە ئەیکەیتە بەرم
ڕۆنەکەی خۆمە ئەیدەیتە سەرم
کە ژن مل کەچ بوو بە نانی شوانێ
بۆچی لێی ئەدەی بە کوڵە گۆچانێ
کاسە کە پڕ بوو دیارە ئەڕژێ
بەرداش لێک کەون تۆزیان ئەپرژێ
لەگەڵ هاومالا مەکەوە ورتە
لە جێی (سندان)ی تۆ (قوززەلقورتە)
تا دەسندەت بێ قەدرت لە لامە
کەوم بۆ نەگری پێت ناڵێم مامە
کەمتیار ئەگەر پێی بڵێی چاکە
قولەپێی ئەسمی هێشتا دەنگ ناکا
هەنگەلانەکەم هەمووی هەنگوینە
خورمای کورد کوژەم لە لا شرینە!
تەرس هەڵدەرێژێ خورما بە جەواڵ
بۆیە دەکەونە شوێن کەری جەجاڵ
کە لە ناو خۆتا هاتو ڕێک کەوتی
ئیتر لە ترسی لاوە سرەوتی



دڵ ئەڕەنجێنێ پیاوی بێ کەماڵ
بە هەڵەوەڕێ دز دێتە سەر ماڵ

فرژانگ کەستمیو وازی لێ هێنام
زوو تێ گەیشتم کە چۆنی بەردام

بۆ دەرەبەدەرێ مەکەوە سەما
ئەگەر چاک بوایە لە جێی خۆی دەما

گوڵ لە سەر لقی خۆیا ڕەنگینە
بەردیش لە جێگای خۆیا سەنگینە

بچۆرە شارێ کە کەس نەتناسێ
تێر خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ

با، مێخ سندانی تۆڕ ئەدایە دەر
پێچە کڵۆیان دەهاویشتە بەر

خوا منی لە ژوور تووە دانـاوە
هەر چی‌یەکی دیکەی خەیاڵی خاوە

قاچاقچی نەما ڕێژی لە ناوە
بێ‌تونییە ئەم بەندو باوە

دارکیشی ناری نەمردود بوو ئێستر
گوێ درێژی گولە ڕەهبەری حوشتر

دەروێشی بەنگ‌کێش سەر دەنێتە تاق
بۆ بێگانەیە تریاقی عێراق



چاکـەت بـۆ بـەد بـێ هـەتـا ئـەتـوانی
بـەد نـەبـێ قـەدری چاکـان نـازانی

بـاوەژن چـەپـۆک نـەدا لـە هـەتیـو
هـەرگیـز فێـر نابـێ رێـی ئـەمدیـوەودیـو

مـوور تـا نـەیتاشـی نابـێ بـە تـەختـە
بـێ تـەجـرەبـە خـام نابـێ بـە پوختـە

فـەلـەک بـۆ پیـاوی خـودیین بـەکینـە
خـۆت لـە ئاوێنـەی دیـودا مـەبینـە

سـەرمـا نـەمـا، مـار ئـەبووژێتـەوە
بـەڵام زوو سـەری پـان ئـەبێتـەوە

چەنـد خۆشـە کـە پیاو دڵـی پـاکی بێ
لـە تـەنگانـەدا دۆسـتی چـاکی بـێ

مۆریـان ئـەگـەڕێتـە بـن باخـەڵـەوە
خوێنمـان دەمـژێ بـە زاوەڵـەوە

شـوانت لـە کوێخـای لاوە چـاکترە
دەسـتی بێگانـە مـاری پـێ بگـرە

«وەزیـر»ێـک نـەوەی دزی بـەخێـو کـرد
ئـاخری کوشتیـشی و ماڵـەکـەیـشی بـرد

جوولـەکـە ئێـستاش هامـان ئـەکـوژن
دەست ئـەڵمان کـەون خوێنیان ئـەمژن

هـەڵـەکۆک لـەگـەڵ بـەکـرا ناکۆکـە
ئـاگر مـەخـەرە ئـەنبـاری لۆکـە

کـە ڕەگ سـست بـێو هێـزی نـەمێنی
«لاپـورە» پـاروو لـە دەم ئـەڕفێنـێ

خوا هەموو لایێ یەکخاو یەک دڵ بێن
لـە سایەی یـەکـدا وەکـوو یـەک بژین
❀❀❀

خوا عەیبی بزنی دەرخستوەتە ڕوو
کەچی کڵاوی کردوە بۆ بەڕوو
چێشتت بۆ ناکوڵێ بە بێ ئاگرێ
خورمایش موتوربە نەکرێ ناگرێ
دیجلە ئەم هەموو خەڵقەی دیوە
لە لەنجەو لاری خۆی نالەخشیوە
هەر کەلوێ، بەردێ لە تاقی کیسرا
ئایەتێکە بۆ «لەیلەتول ئەسرا»
بە زۆری پەنجەی عەشقێکی خایەن
شیرینی ئەرمەن کەوتە مەدایەن
بێستون بە عەشق لە بن کەنراوە
شۆرەتی شۆری بۆ فەرهاد ماوە
ئەڵێن: فەرهادیش کوردە بەجێیە
ڕەنجەڕۆی وەک ئەو کورد نەبێ کێیە
ئەفسانەی سەودا نەما بەسەر چوو
ئێستا «جیازیی» کچ ئەدا بە شوو
خزمەتی وەتەن گوزەشتەی پارە
هەموو بۆ پارە ئەبین بە پارە
هاوار لیرەی زەرد زرینگەی خۆشە
کە هاتە بەر گوێ خودگیری بۆشە
دەوران دەورانە وەک بابی بابی
مەبعووسی بووە بە نوقلی بابێ
جووجەڵە دەندوک لە هێلکە ئەدا
دووپشک بە بێ‌قین پێتەوە ئەدا



هەڵۆ بەرز فری کەوتە سەر شارێ
تیزی پەری خۆی هێنایە خوارێ

ئەوی نەدیمی پیاوی گەورەیە
ئەبێ «چاکبێژ» بێ دەوران دەورەیە

دڵخۆشی نەخۆش دەرمانی دەردە
خەڵک بێزار ئەبێ نە بگرەو بەردە

دوکتۆرێ هاتووە ئەڵێن کەححالە
تێی وورووژاون ئەڵێی دەججالە

بۆ موستەشفاکەی ژوور شاتر ڕام کێشە
ڕازیانەم خواردو بوو بە زگ ئێشە

دوومەڵان بۆیە پێی دەڵێن زۆڵە
بە بێ توو دەڕوێ لەو دەشتە چۆڵە

ئەڵێن گوڵەژەن لە هەموو ماڵی
ئەگەڕێو دەرپێی لێ دا دەماڵێ

من بۆیە بستەم هێندە خۆش ئەوێ
چی لە دڵدایە ڕاست دەردەکەوێ

وتیان پێغەمبەر بە کوێدا سەرکەوت
وتی پەیژەکەی عیسای بەدەست کەوت

کابرا وتوویە «میفروبی - هەی دێ»
میقرۆب ئەوەیە کە لە لاوە دێ



کـەرەکـەی عیـسا بیـەنـە مـەککـە
بـڵێن: گـۆڕاوە تـۆ بـاوەڕ مـەکـە
زەمانـەی عیـساو مووسـا بـەسـەرچـوو
ڕووی درۆزنی تێـدا ڕەش ئـەبـوو
ئێـستا دەورێکـە درۆ وا دەکـرێ
ئاسمـانیلی یـەو بـە بـاڵ ئـەفـڕێ
مووسـایی هامـان ئـەکـوژن بـێ ئامـان
زۆری وا هـەیـە بیکـەن بـە هامـان
پاپـا «ئافـەڕۆز» ئـەکـڵ لـە بـەر قـین
ئێمـە بـۆچ فێـری «ئافـەڕۆژ» نـەبـین
بۆیفوتـاژ حیسـسی میللـی زیـاد ئـەکـا
ئـەو پیـشە چاکـە نـان بـە زیـاد ئـەکـا
چونکـو موحتـاجین بـە نـانی شـەوێ
بووینـە عیـسایی سـێ خوامـان ئـەوێ



کوردی دۆنەدیو پف لە دۆ ناکا
کە تێریشی خوارد ڕوو لە تۆ ناکا
ئەڵێی تۆفانی نووحە هەستاوە
باوک ئەولادی ژێر پێی خۆی ناوە
بە خاڵۆ خاڵۆ هات بە لامەوە
بوو بە توولەمار دای وە پامەوە
ئەگەر کەڵکی بێ ئەوسا خەڵەیە
ئێستا دەور دەوری سوورە داڵەیە
هەندێکمان هەیە ڕەگی خەو ئەگرن
تا ئیشیان هەیە لەبەر پیاو ئەمرن
ئەمڕۆ لە لایان ساحێب مەقامی
پێت هەڵخلیسکا شێت و نەفامی
سەیر ئەو سەیرەیە ئەمەیش ئەزانین
دێین خۆمان لادەین کە چی ناتوانین
ئاخ خۆزگە هێندەی سەخی و جەسوورین
چێ دەبوو بە دڵ لە یەک بیوورین
ئەو قەومە بەرزو ساحێب مەنزڵن
کە لەگەڵ یەکدا ڕاست و یەک دڵن
ئەوەی بە بەشی خۆی نارەزایە
بە هەولی بێ‌جێ رووی لە قەزایە
تیری دۆست لە پێی «ژیان» درابوو
زۆراب بە تیغی رۆستەم کوژرابوو
بە بەردەباران کورد نەمردبوو
بە گوڵی دۆستێ گیانی دەرچوو بوو



بــە واتــە واتـــە پیـــاو ئـــەبیتـــەوە
خـــووی منداڵـــیمان لـــێ ئـــەژیتـــەوە

سەرو گوێی یەکمان شکاند بە کوتەک
چەند لێک خەرۆ بووین بە شەرە گەرەک

مـن «گـوێژە»یـیمو تـۆ «کانیـەسـکانی»
لـە یـەک بووبووینـە دوژمـنی گیـانی

هیتلـەرو یـەهـوود هێنـدە دوژمـن نـین
ئـەوەنـدەی ئێمـە لێـک هاتوینـە قـین

ئەو ئیشەش کەوا ڕاجیع بە خوا بێ
بـە زۆری بـازووی هـیچ لایـی نابـێ

پـشتیوانەکـەت ئـەگـەر بـەکـارە
بـــاراش لـــە ئاشـــی ژوروو بهـــارە

نەگبنـــا کارمـــان لێـرە لـــە پاشـــە
پێـشەی پیـــشوومان دەوەن بـــە ئاشـــە

جـاران ئیتالیـا شـەرە گـای ئـەکـرد
وتیـــان خراپـــە پێیـــان لـــە نـــاو بـــرد

ئێمـــە بـــەرانو کـــەوو کـــەڵـــەشـێر
تێک بەر ئەدەینو سەگ دەکەین بە شێر

هـەمـوو دەرسـی شـەڕ ئـاخر شـەڕیـە
بۆیـــە هـــەڵـــکردمان کـــوێرەوەریـــە



گەرمای هاوینە گەرمەی میوەیە
ئاخ میوەی ئەمساڵ شەرای پێوەیە
کاڵەک گران بوو تێرم لێ نەخوارد
کە چی کوتوپڕ گەرمای تی بنارد
خوا نەیداوێنێ ساڵێ ئۆخەی کەین
شادی بێ و تاڵی نەکەوێتە بەین
ئێستا وەختێکە بە خۆشی و سەیران
هەمو ئێواران بچینە سەر بێستان
کە چی بە هیچە بۆ قینەبەریی
لە خۆش ڕابواردن خۆ دەکەین بەریی
عەیزاغاو میرزا زیندوو بوونەوە
شێرزادو شێرخان تێک هەڵچوونەوە
ئەوە چاکی کرد بێلایی نواند
لای «معاویە» تیکەی خۆی ئەگلاند
نوێژی لە پشتی «عەلی»یەوە دەکرد
کە بوو بە هەڵدا ڕای کردە سەر گرد
خۆ من نەوسنم بەلام ئەو نانە
کە بۆنی لێ بێ نایخۆم گرانە
لە پشت کەسەوە جەماعەت ناکەم
بۆ ولاتەکەم بە هیوای چاکەم
هەڵدایشم ناوێ بۆی بچمە سەر گرد
ئاخ هەموو لایی وەک منیان دەکرد
ئێمە کە لە سەر هیچمان نەکردن
دوو کەس دەمێنێ شایستەی مردن
خۆزگە بۆ چاکی وا یەک دەکەوتین
بە هیچ قووەتێ دانەدەکەوتین



ئەو دەمە بەختم لێ بوو بە دوژمن
کە کەرە دێزم بوو بە ڕمووزن
ئەودەمە هۆشم لێ شێواو وەستام
کە هەر چی هەڵسا وتی ئاش وەستام
خزمەتی دەکەم هێشتا لێم ساردە
تۆ خوا مەلاگەل! ئەمیشە ئاردە؟!
دەوڵەمەند پارەی بە کەس نەداوە
پارە پەرەستی ئەڕوا لە دواوە
ئەوی پێی بڵێن: وا برۆ دەڕوا
بە هیچ قەولێکی ناکرێ بڕوا
ئەوی جڵەوی خۆی دایە دەس خەڵک
ناوی نراوە زەبوون و بێ کەڵک
زەردەواڵەمان جارێ ئاڵۆزاند
نانی شوانمان خوارد گەوجیمان نواند
لە هەر دوو لاوە تووشی جەزا بووین
تەمێمان نەخوارد دیسان تێ هەڵچووین
تاریکایی شەو ئێوارە دیارە
ئەڵێن خاکەکەی بەدە ئەم شارە



ئـەمـسـاڵ ئینتیخـاب کـەوتـە بـاحورا
زۆر کـەس دەروونی ئـاگری تیـا گـڕا
ئاویـشمان کـەمـە بـۆ ئـاگر بـڕی
ئـەویـش هاتۆتـە سـەر نـۆرە بـڕی
ئـاخ بـۆ مـیراوی خـاوەن مـرووەت
ئـاوو نـووابی بکـا بـە تۆبـەت
مـادام هاتۆتـە سـەر تێکـەو لێکـە
یـەکێ تێگـەیـی زۆر ڕێـکو پێکـە
چونکـو بـۆ هـەنـدێ هینـدە تـەلاشـە
لـە خزمـەت زیـاتر هـەولـی مـەعاشـە
بـارێ دەولـەمـەنـد نـەیقۆزێتـەوە
سالـی هـەواری بگوێزێتـەوە
یـا سـویعو ڕوبعـی بـۆ کـارێکی خێـر
ببـەخـشێو چاوی چـواری لـێ بـێ تێـر
چـاوێ تێـر نـەخـوا بـە بـەشـی خێـوی
گـۆڕ وایـە خـاکی گـۆڕی پـێ بپێـوی
ئـەی ئـەو کـەسانەی بـە خـۆ دەنـازن
تـا دەمـرن حـەسـرەت بـە نـان و پیـازن
هونـەر ئـەوەیـە بـەختـی لـەگـەڵ بـێ
چیمـەتـۆ ئـەبـێ لمـی تێکـەڵ بـێ
جـەوهـەر بـۆ دادی حـەق بـێ بـەهایـە
بـە مێـردی نییـە زۆر جـار بـە خودایـە
مـن سـێ ڕۆژگانـەی خـۆم پـێ بـڕاوە
نـازانم چیمـە لـەم بـەنـدو بـاوە؟



وا گــــرد بوونـــەوە پــــایزە براكـــــان
بەڵكو یەك كەون هیممەتی چاكـان

بـــەڵان وەك ئــاردی نــاو درك وایـــە
بـــرایش لـــەگــــەڵ نایێتـــە كایـــە

خۆولاتیمـــــان بـــۆچ لا چـــا نابـــێ؟
گـوێلكی خۆماڵـی بـۆچ بـە گـا نابـێ

مــەڵــێن: شــیلاوگ مایــەی پــەنــیرە
فیتنــە هـــەوێـــنی نــۆ قـــازان شـــیرە

مەدحـی ڕووبـەڕوو پیـاو ئـەدا بـە شـوو
زۆر دۆستی سەر نان بە دوژمـن دەرچـوو

خـوا مووسـا بـۆ سـەر فیرعـەون ئـەنێـرێ
كە چی جار جار مەڕ بە گورگ ئەسپێرێ

پیاو بۆ بورەپیاو ڕۆحی خۆی سەرف كرد
كە چێ پێی دەگوت بە دەردی خۆی مرد

ئــەو كانیـــەی ئــاوی لـــێ دەخوێتـــەوە
بـــە نایــەكــاری پـــڕی دەكـــەینـــەوە

ئەوەی كە وەفـای بـۆ دوای خـۆی نـەبێ
ئیتـر تـۆ دەبـێ هیـوای چیـت پێـی بـێ

سیاســەت پیـــشەی ئاغـــای بـــێ ڕیـــشە
بۆیـە گـەڵـێ پیـاو بـێ ئـیش و ڕیـشە

زۆر ڕیـش و سمـێڵ تاشـراو وەك ئـەوان
خۆزگـە ڕیـش ئـەبـوو بـە مـژدەی ژنـان

ئۆخەی ژنان بوون بە گـەورەی گـەڕەك
ئـەبـێ دەسـتەی تـر بچنـە بـەر خـەڕەك

ئینجــا هێنــدێکیان چــۆنی دەڕێــسن
لــەگــەڵ گوێچنــە بــەرزە بلێــسن

بــە نارنارۆکــە ســەر دەڵــەقێــنن
دەم بــۆ یــارۆی خــەڵـک دا دەچـەقێـنن

ئــاخ خوێنــدەواری فریامــان کــەوە
بــۆ عالــەم ڕۆژە بــۆ ئێمــە شــەوە



جـــالینۆس ئـــەڵـــێ: تـــاقیم کـــردەوە
هـــەر قـــەومـــێ ناســـرا بـــە پێـــی کـــردەوە
هیندیو حـەکیمـی، فورسو تـەکـەبـور
تـورک ئیتاعـەت، ئـەرمـهـن سـفرەدڕ
عـــارەبی بـــەڕیو میـــوان پـــەروەری
کـــوردو ئـــازایی، بـــە مـــاڵو ســـەری
حەبـەس سـەداقـەت، شـامیو شـەئامـەت
مـەلاو چرووکـی، زەنگـی و حـەماقـەت
کـورتو فیتنـەیی، دریـژیو بـێ هـۆش
لە دوو جەژنـان بـوو شـێخی نـوێژ فرۆش
ئـاینو ئـۆینی مـوزەردی چـاو کـاڵ
شەهوەت پەرەستی ڕەشـی ڕوو بـە خـاڵ
کـوێرو حـافیزە جوولـەکـەو حیـساب
بـەنـگو کـەسـاسـی دەولـەتو شـەراب
جـاف بـۆ زیـانی، هـەمـەوەنـد بـۆ شـەڕ
شـێخو تـەفـرەقـە، زەنگـەنـە بـۆ گـەڕ
پـشدەر جـەنگـاوەر ڕێکـنو یـەکـەن
شـوانو دزەیـی لـە ناویـان ئـەکـەن
بانـەیـی دەڵـێن: ئـەسـحابە کـوژن
سـیوەیلـی ئێـستا قامـک دەمـژن



بە ڕیسی خەڵکی بۆچ ئەڵێی: پەتە
زوبانــت بێــڵێ ســەرت ڕەحــەتــە

پیــاوی زۆر بــڵێ بــۆ دۆزەخ بــەرە
لــەویــشدا ئــەڵــێ: ئــارەکــەی تــەڕە

وەختــێ ئـەتـوانی بـە گـژ مـن دا بێـی
بــۆ بــەر هــەڵــستی زۆری مــن بــشێی

پێ لە مار مەنی هەر چەنـد سرپش بێ
مـەچـۆ ڕێـی بـەراز لـە ڕەو بـرپش بـێ

تــەنهــا گاجوتــێ زیــان ئــەنوێنــێ
کـە چــی گاگــەڵــی تێــوە ئـەگلێنــێ

ئێــستا مــن بۆیــە نــاوم پورێــە
خـەتـا ســوورەییـەو لـە خـۆم ئوورێـە

دنیــا شــێواوە بــە شــرم بــرم
دەســت بـە کـلاوی خۆمــەوە دەگـرم

هێــشتاکوو، بێــستان بــەڕەڵا نیــە
ئـەم دووگــە چــەورە بـێ بـەڵا نیـە



بە حوشتریان وت: خوا کورت باتێ
وتی: من بێ بار، نامێنم ساتێ
تا کار نەشێوێ ناگاتە سامان
وەختە بۆ هەنگوین بچمە هەورامان
ئاوی پاییزان لە بەفراو ئەکا
ئەوی تێر نەخوا چی لە ئاو ئەکا
شارێ بێ کاری ژوور بە کار کەوێ
پیاوی پیاو هەرگیز تێیدا ناسرەوێ!
دیی فرە کوێخا ئاوەدان نابێ
پیاوی زۆر بلێ، نوکتەدان نابێ
هەر چی خەڵک لە ژوور خۆیەوە بگرێ
ئەوی دەیناسێ لە بەری دەمرێ
ئەوی بە لۆقە ڕێی دۆست ئەبەستێ
با بە لۆقیش بێ! زووتر دەوەستێ
هەوا پەرەستی هێند لووتی بەرزە
لووتی ئەبێتە کولکی تەرزە
یەک دڵ و یەکسان چەند خۆشە یاران
بێ خەم، بێ پەروا لە تەرزەو باران
پێنجو دوو ڕۆژێ دنیا ڕابوێرین
دوشمن لە پردی نامەرد هەڵدێرین
بەڵام وەک دەستمان خۆیشمان بلاوین
یەک ناگرین بۆیە وا بێ کلاوین



سەرما هات بەرگی هەتیوی دڕی
هەور لە خەرمانی چەڵتووکی خوڕی
ئەمساڵ ناترسم کە لافاو بمبا
هیچ گوێش نادەمە فیشاڵی بۆمبا
من دەورەی حەربی عومموومیم دیوە
ئەوەی بترسێ دەستی بڕیوە
بۆیە حەز ئەکەن باران ببارێ
لەم بێ ئاوییە ڕسگار بێ شارێ
هەموو لە تینوا ئاخ هەڵدەکێشن
هێشتا بۆ ماڵان ئاو ڕادەکێشن
ماکینەی گەورەی ئەلەکتریک هات
خوا یار بێ نووری فەن کەوتە ولات
نان و گۆشت نرخی کەم کرایەوە
پارەی «کیلۆوات» وەک خۆی مایەوە
بۆ حەسحەسانە پیاو ئەخنکێنن
کەچی لە ماسی ڕەسم ناسێنن
بۆ مەستی توتن ئەپرسنەوە
قاچاغی (ماسی) ئەبەشنەوە
بەنی گرژ خەرجی هەوسار هۆنینە
دەزووی خاو تەنها بۆ لارز برینە
ئەسپی بێ هەوسار زوو بێ جل ئەبێ
پیاو سەربزێو بێ ئەستۆی شل ئەبێ



لێرەدا چاکەو نەزاکەت گەڕێ
کوتەک لە بەهەشت هاتوتە دەرێ
زۆر جارم وتوە خەڕۆ بێ گوێیە
کوتەک دەزانێ قۆناغ لە کوێیە
ئەگەر خوا باڵی بە فیل بدایە
ئەبوو سەربانمان گشت برووخایە
خۆت هەڵمەکێشەو مەڕۆ بە عینوان
تفەنگ بۆ نیشان ئەسپیش بۆ مەیدان
ئێستا وا لێمان کەوتنە بەهانە
بە دەست خەڵکەوە بێڵ زۆر ئاسانە
شوهرەت ئافەتە لێت نایێتەوە
جام بشکێ بەلام نەزرینگێتەوە
شەڕی ئیتالیا گرانی پێیە
گەر لە کوێ کەوتو کوندە لە کوێیە
تۆ خوا لێی گەڕێ با حاڵمان وا بێ
تاڵعی ئێمە ئەبێ شوڕبا بێ
بە تەقویم سەرمای ئەمساڵ خەتەرە
مەکتەبەکەیشمان لە شار بە دەرە
لە مەعاریفدا هەر شار بەدەرین
بۆیە وەک خاکین هەر خاک بە سەرین



شەوی پاییزان پیرانن نانوێنێ
کەلەشێریکیش نیە بخوێنێ
کەلەشێر لە دێی (ماوەتە)
کەلەشێر کوشتنم لایان لەعنەتە
شەومان درێژەو ڕۆژمان بە هەورە
نمەکمان سوێرەو پلاومان چەورە
هیچ کەس نابیتم دڵسۆز بێ بۆمان
زوو پیاو ئەگۆڕێ ئاوی (کانیەسکان)!!
گونای کەس نیە خەتای خۆمانە
جێگای هیوامان «گردی سەیوانە»
هەندێ بە کێلی باوکیان ئەنازن
هەندێ بۆ ئاشووب ئاواتە خوازن
هەندێ کتکیان لە لا وەک شێرە
هەندێ هێندەیە تا سکیان تێرە
ئەڵێن مردوو شۆر پارەی بەرێ زوو
خوای دەکرد مردوو گۆڕ بە گۆڕ دەچوو
پەردەی بینایی ئەسپ و شێر وایە
سامی ئینسانی وەک دێو لە لایە
ئەگینە ئێمە چۆن سواریان ئەبین
دوو هێندەی ئێمەن لێیان ناترسین
ژن تەلاق ئەدەین شوو ئەکا زۆر باش
ئەڵێین قەی ناکا بۆمان بوو (بە جاش)



بــۆنی گـــوڵ لــە لای قالۆنچــە دەردە
ژن بـــێ ڕووســـووری ناچێتــە پــەردە
«برا! ئـەم پیاگـە سـەیـری چـەنـد خۆشـە
مــن بێــژم: نێــرە، بێــژێ: بیدۆشــە»
ئۆخـەیـچ کـە ئێـستا زۆر دار بـێ هێـزە
لـە بیرتـە ئـەیگـوت گاڵــت وەگـوێزە
نەک ئەمری وەزیر فـەرمـوودەی شـا بـێ
لــەم زەویــە ڕەقــە چــەوەنــدەر نابــێ
کە تۆ خۆت شل کرد لە ڕووی ناکـەسـێ
ئـەڵــێ: بڕوانــە چــۆن لــێم ئـەترسـێ؟
چاکـە لـەگـەڵ بـەد خـراپ نـاو ئـەبـرێ
کە گورک بەخیو کەی خوای مەڕ ئەت‌گرێ
مێرووڵـە کـە خـوا غـەزەبی لـێ گـرت
کاتێــک زانی لــە پــڕ باڵــی گــرت
خـــانوێکم هـــەیـــە زۆر ناتـــەواوە
دارو پــەردووی بــاش ئێــستا نــەمــاوە
ساڵــی ســێ جــاری هــەڵ دەگێڕمــەوە
لـــە پـــڕ دەڕووخـــێ ناحـــەویمـــەوە
ئـەمـساڵ مـەبعووسـی هـاتوەتـە ڕەواج
ڕەسمـی ئیفتیتـاح کـەوتـە بـەر میعـراج
بـــەلام عـــومرو ڕزق لـــە بـــەراتایـــە
بـزانین بــە بــەرات کـــێ دیتــە کایــە
شـــایی شـــایی کـــەر لۆغـــەی دراوســـێ
لـــە تازیـــەی ژنـــان ســـە رم دەئاوســـێ



وا ڕەمـــەزان دێ ئــەبـــێ بـــە کوێخـــا
پـەکــی کــەشــکەکو گێـپــەم ئــەخــا
ئــەگــەر مـــن بــڵێم: ڕەمـــەزان نییـــە
کــێ لــێم دەپرســێ جــەزاکــەم چییــە؟
چونکـــو گونـــاهی لـــەوە گـــەورەتـــر
ئـــەمـــەنئـــە زۆرە بـــە بـــاری حوشـــتر
بـــاقڵ دەچینـــە پـــەردەی ئیعتیکـــاف
جنۆکـە دەبـەن بـۆ پـشت کێـوی قـاف
نـــەوەڵـــڵا ڕەســـــتو داو هێندگرانـــە
بـــە قـــەد ڕکـــاتی تـــەراویحمانـــە
تاریکــە شــەوەو ئــەحــزاب لــە نــاوە
«ڕەمەزان» بە جەنگەو «سەفەر» بەدناوە
لــە ئــەفــەریقــا بــووە بــە گــەردەش
دونیــا شــێواوە وەک مــووی قولــەڕەش
جــاران جوولــەکــە خــومی ئــەشــێوا
ئـــەکـــەوتـــە درۆو قـــوڕی دەپێـــوا
ئێـستا بــێ ئــەوەی کــە خــۆم بـشێوێ
درۆی وا دەکــەیــن بــە قــەدەر کێــوێ
ئەڵێن: بۆ مـەئمـوور مەنـشوورە دراوە
خـــانرو خـــۆتر بـــۆ کــەس نــەمــاوە
کــە چـــی پێکـــوڕە داشـــی دامـــەیـــە
نــازانین تــەقــیو شــەقــی کامــەیــە



یەكێ تەعریفی قانونی پرسی
وتی: ئەیزانی ئەگەر نەترسی
وتم من ئێستا لە دونیادا نیم
بە خواردەمەنیو زەماوەند ئەژیم
قانوون بۆ بەزمو بۆ زەماوەند
گۆرانی لە سەر «قانوون» پەسندە
جاران ئەیانگوت (قانوون) ڕێبازە
بەو ئەندازەیە هەرگیز مەنازە
بۆ سلێمانیش قانوون نەبووە
قانوونی خوامان لا بەسەر چووە
هەندێ بە ئەحزاب خۆیان هەڵدەنێن
نوقتەی سەرەوەی لای ڕاست دائەنێن
ئێمە كە فێری شەڕە گەڕەكین
كە بوینە ئەحزاب كێ دەڵێ یەكین
هەندێ بە عیلمو خووی چاك ئەنازن
تا دەمرن حەسرەت بە نان و پیازن
وەكوو ئاغاكەی دێی (سیا مەنسوور)
مەدحێكی زۆریان كرد بە واتەی دوور
كە هاتە ئێرە منیش هەر وام دی
كە چی وەهەدی دا زوو هێنایەدی
بەوە تێگەیم كە نابێ بە پیاو
چونكە بە درۆ (رجال) دێتە ناو



جاران کاسەی دۆ کەوچکی تیا بوو
بە ڕیزە هەر کەس نۆرەی جیا بوو
ئێستا هەر کەسێ پیاڵەی خۆی پڕ کا
بەشی کەس نادا بشڵێ: وا خنکا
(ئەسکەمل) جاران کە سیرمەدار بوو
هەر چوار تەرەفی لێوە دیار بوو
ئێستا گەورەکان «قۆڵتوغ» نشینن
ئەم لاو ئەولاو دوای خۆیان نابینن
خۆزگە ئەو عەقڵەی پێش چووهە سەرکار
لە سەردا ئەماو ئەتهێنایە کار
خۆزگە بەڵێن وەک ماست سپی دەبوو
بە سەر لێوەوە شوێتێکی دەبوو
ماستو ڕاست ئێستا بوونە مۆدەی کۆن
شەرمو تەریقی نەهێشتوە «پاردۆن»
بیستم ئاغاکەی دێی (سیا مەنسوور)
ئەحوالی منی کردووە لە دەستوور
وتوویە تاکوو پیشەی درۆ بوو
موتەسەرریف بوو هەم سەربەخۆ بوو
بووبوو بە عوزوی مەجلیسی عالی
زۆری نەما بوو ببێ بە والی
ئێستا کە تەرکی درۆی کرووە
چاوەڕێی کەوشو پاڵتۆی مردووە
ئەو ماڵ وێرانە بۆچ وا ڕاست ئەڕوا
ئەو ڕاستگۆییە ئەوی خستە دوا



ساف دەروون، داری دەستی بەدکارە
بۆیە شەڕەدار زۆرە لەم شارە
ئەو قەومەی پیشەی دەوەن بە ئاشە
سێبەری ڕوەو ڕۆژە لە پاشە
ئەو پیاوە گەوەری کە خۆش باوەڕە
بە دەست خەڵکەوە مێکوتی ساوەرە
زینهار خوار دەستت بە کەم مەبینە
بۆیە بە کینە لێت نا ئەمینە
هی وامان هەیە دیتە لات خۆشێ
بە خۆت نازانی، تا دەتفرۆشێ
بە بەندیخانە پیاو عاقڵ دەبێ
هەندێ سەرچڵو زۆرە مل دەبێ
هەندێ بە فریو گەیوەتە پایە
شەیتان لە بەرگی فریشتەدایە
کەسی بوێرێ بیسمیللا بکا
وەڕە سەیر کە چۆن ئابڕوویان تکا
سەلاحییەتی ساڵحانم نییە
بڵێم: ئەمە ڕەش، ئەمە سپییە
کە کەلیمەی «ڕەش» وەرگەڕێتەوە
دەبینی شەڕی لێ دەبێتەوە
جەژنی میلادو ئێمە یەک کەوتن
ئێرە بۆیە یەک ناکەون چەوتن
جاران حاجیلێ بە خێری باوبوو
لە بەختی ئێمە گوێزی بێ ناو بوو



پیاوی ناوەجاخ مەخنەنە سەر کار
هاوڕێکانیشی دەکا بە بێعار
ئەوی تێکۆشێ و ئیش بکا بێدەنگ
(دەماوەریک) دێو دەیکت بە پارسەنگ
ئەگەر پێم بڵێت ئامشۆی کێ دەکەی؟
ئەڵێم یا خراپ یا بە جێ دەکەی
هەر چشتێ زۆر بێ هەرزان بیکڕە
عیلم تا زور بێ بەهای زۆرترە
ئەدەب تاجێکە لە نووری یەزدان
بیکەرە سەرو بچوورە ئاسمان
بێ ئەدەب ئاوی ئەدەبخانەی دێ
بەردی تێ گرێ پرشکت بۆ دێ
«بە خۆوە نەدیو» دەم قاڵی دەوێ
لە سەرخۆش گەڕێ ئەو خۆی دەکەوێ
بۆ خۆهەڵکێشان زەعیم بوزورگن
هەندێکی‌تر هەن سپڵی لاورگن
شەوچەرە لەبەر (سپڵە) دامەنێ
کە خواردیو ڕۆیی پێت پێدەکەنێ
بەلام تۆ بیدە بام پێ نەزانن
لێیان بیوورە قوڕی زستانن
ئاخۆ گەردشی کورسی چی لێ هات؟
هیوا بۆ قابسز ترس بۆ دەستەلات
بێ (دۆ) بە هیوای شیری مەڕ ئەژی
کاتێکی زانی بەرخ مەڕی مژی

(بــــابی بــــابی)یــــە کایــــەی زەمانــــە
ئــەم چــەرخــە کۆنــە دەوران دەورانــە
پــەنــدی پێشینان هــەر چــەنــد پــەســەنــدە
پــەنــدی ئــەم پــەنــدە جــائیزەی بــەنــدە



ئەگەر سەعادەت زۆر دەستی لێ دەی
ئاخری تێک ئەچێ ئەبێ فڕێی‌دەی
بە سەر دۆستا بێی بە دیارییەوە
لەوە چاکترە کێن بشاریەوە
کە ئیشێکت کرد زانیت خەتایە
بگەڕێیتەوە بوزورگی تیایە
ئەگەر لێ‌بوردی بێ پەشیمانی
ئەنجا لەزەتی عەفو دەزانی
ئەگەر بێی بە قین تولە بستێنی
خەوی ڕەحەتی لای خۆت نابینی
ئەوە جنێوت پێ دەگەیەنێ
کەوا جنێوت پێ دەگەیەنێ
کە دوو کەس ئاشت بن بە تۆ چاکترە
هەر ڕۆژی سفرەی لایە حازرە
کە سەری هەودای ویجدانت بەردا
ئەم‌دیو ئەودیوت زۆر دێ بەسەردا
ئەڵێن: پیرێژن بە تەفرەو مە کرە
کە چی جوانەکان کەوتوونە دەورە
بورجی پیرێژن هێشتا ماویە
جوانەژن پێشین بەندو باویە
ئەیشزانن جێی کەس بەوان نادرێ
ئیسان هەوڵ ئەدەن خەڵک نانی ببرێ
ئەوی بە ناحەق نانی خەڵک ئەبرێ
نەنگەویستی‌و ترس بۆ خۆی ئەکڕێ
بەڵام هەندێ کەس نائەهل‌و بەدخوون
خۆیان چاوەڕێی دەرکردنی زوون



جێگای تەنگ بوو بوو ئەمجارە ژیان
گاڵتە کەوتە پاڵ پەندی پێشینان
پیاوێک ژنی مرد قوڵێکی هانی
وتیان چۆن لەگەڵ قوڵدا ئەتوانی؟
وتی بۆ ماتەم پیشەی دێرینە
سەراپا بەرگی تازێدار شینە
من بەرگی ڕەشم کردەبەر جێیە
کە ماتەمگێڕیی عائید بەوییە
من سەگم دیوە لە سەرەنوێڵک
قەپاڵی دەگرت لە گۆشتی تووتک
دەستم دەرمانی سەر زگی قەبزە
خامەم ڕەوانە شارەزای نەبزە

سێ بەڕۆ...

مایێکی بۆرەم بوو سواری دەبووم
ڕۆژێ بە ئیشێک بۆ دێیەک دەچووم
نزیک ئاوایی ژنێکی نازدار
بانگی مردە من وتی بۆرە سوار
سێ‌بەڕو دارم ئارامم نییە
لە تۆ دەپرسم دەرمانی چییە
وتم لەم دەردە ڕسگارت دەبێ
ئەگەر بێ و دڵی من بێنیتە جێ
وتی ناچارم دڵت بێنمە جێ
بەڵام یاخوا تۆیش ئەمەت بێتە ڕێ
هارو مار (ودمی) باوەشابان بوو
هەر چی هار ئەیگرت بۆ ئەوێ دەچوو

لـەگـەڵ پـەنچکـێ نانیـان بـۆ دەچـوو
نـووتکی دەهاویـشت ڕسـگاری دەبـوو
ئـەمـەنـدە هـارو ماریـان چـاک ئـەکـرد
کە چی (شاپیاو)یان بە گورگی هـار مـرد
حەکیم لـە دەردی کـەسـی خـۆی کۆڵـە
بۆیـــە خزمـــانی دەکـــەونــە بۆڵــە



هەندێ کە لە پڕ بەرزە ئەبنەوە
کە کەوتنە خوارێ ئەبوورنەوە

کە بە توونچیتی بووی بە حەمامچی
خۆت لێ ناگۆڕێ، لە ڕێ دەرناچی

بەلام کە لە پڕ هاتی بووی بە کۆڕ
نان خۆرێ دەبی، سپلەی سفرەدڕ

ئەگەر پێ بە پێی هاوڕێکات بێی
پێت نالێن کابرا! نازانن تۆ کێی

هەر موویە لە ڕێز ڕێزە تێپەڕێ
مەقەستی وەستای دەلاک ئەیبڕێ

نەخوازەلا وا (زەیل) کەوتۆتە ناو
هەرچی بەرکەوێ، ئەڵێن کلک بڕاو

بۆ کلکەقولێ دەچنە لای داپیر
ئەمانێرێتە لای بزن بۆ شیر

شیری داپیر خۆر، بێ کلک ئەمێنی
سەگ بە هێزی کلک ئێسقان ئەشکێنێ

پیرەمێرد هات، پێی وتم پیرێ
هەر کەس لە باری خۆی گوێز ئەژمێرێ



مـانگی ڕەشـەمـێ دووکـەڵ دەرناچـێ
خـاتو زەمهـەریـر پـرچ هـەڵـئەپاچـێ
لـەقلـەق هاتـەوە نیـشتە سـەر هێلکـە
مـەیـدان خاڵـی بـوو بـۆ پـەڕەسـێلکە
کلکـــی دووفــاقی نموونـــەی زەیلــە
شـارەزوور ئـەمساڵ لـە ڕاوکـەر کـەیلـە
عـەینـەمـەڵ دەرکـەوت، ساڵـی کـوللەیـە
بـەڵام بـۆ ئـەودیـو ئـەزمـڕ پلـەیـە!!
بـای بـەهـار دەشـنێ!کـۆلارەی دەوێ
بـزانین بـە پـەتی کـێ سـەردەکـەوێ
کـۆلارە ساڵـــێ نێـرەو ساڵـێ مـێ
ئـەمـــساڵ بـــرەوی ژنانـــە کـــەمـــێ
بـە هـۆو بـە هیـوای داری پـەڵـکەوە
وەک فرفرۆکـەیـن بـە دەس خـەڵـکەوە
بـەڵام لـە لـەشـی چالـەکـە دەچـین
هـەتـا لێمـان دەن پێـی قـەڵـەو دەبـین
هێنـــدە کـــە بـڵێی کـــەمتیـــار چاکـــە
قولـەپێـی دەسمـی هێـشتا دەنـگ ناکـا
بـە کـەر نـاوێرین بـە کورتـان شـێرین
وەک سووره والەیـن بـە خاڵـمان فێـرین



ئای بۆ ئەو ڕۆژەی ترس دێ بەسەرا
کونە مشک لامان ئەبێ بە سەرا

کە کەوتینەوە کۆمەڵی یاران
ئەڵێی نە بامان دیوە نە باران

کوێخا جوامێری هەمەوەند دەیگوت
های جوامێر ڕۆم‌و عەجەم وا لە دووت!

سەرێ کە شاهان بە تەمای نەبن
بۆ ئەوە دەشێ هەڵکەنرێ لە بن

ئەوسا کە جوامێر دەنگی دلێر بوو
تیپی هەمەوەند ژنیشیان شێر بوو

ئێستا من هەسم دوڵدڵم پێیە
ئاخۆ ناپرسن لەشکرت کێیە

لە هەمووی خۆشتر خەیاڵ بازییە
حوکمی سەری بەنگ یەکتازییە

خەیاڵبازیە چارەی دڵتەنگی
شەراب بە گەردش بەنگ بە بێ دەنگی

بەلام بەنگ‌کێش بی مەچۆرە گوێ ئاو
جۆگەڵەت لە لا ئەبێ بە شەتاو

هەر خۆم ئەیزانم شەراب بکەم نۆش
گوێ زەڵم‌و ماسی‌و سەوزی‌و هەوای خۆش



جووجەڵە دوو خووی بە ئێمە داوە
کە بێین پێش کەوین بۆ پێمان داوە
یەکێ کە سەری لە هێلکە جووقا
تویکلی شڕ دەکا لە ژێر دەندوکا
دووەم بێ دەعوای میراتی باوک
یەکتر کوێر دەکەن بەشەڕە دەندووک
ئێمەیش ئەو خاکەی جێ سروشتمانە
ژێر لەقەی ئەدەین، خوو ڕەوشتمانە
دەڕوانی هیچمان لە ناودا نییە
ئەمان لە گەڵ ئەو بۆ شەڕ شەقییە
کەویش خوویەکی خۆی پێ بەخشیوین
دیارە بۆ ئەوە شایستەی دیونی
کەو دەبەنە ڕاو بە فێڵ دەخوێنێ
هاوجینسی خۆیان بۆ کوشتن دێنێ
ئێمەیش تەسبیحو زیکرو ئیستیغفار
کە چی کەشکوڵمان پڕ لە ئیستیخبار
دەبینین برسیو کەسیرەو کزین
دانمان ئەدەنێ دەستیان دەگەزین
بە زەیلی زەیلیش نابێنە ژێر بار
(زەیل) درێژەی بەست وەک ڕۆژی بەهار
تا نەبڕێتەوە ئەو نابڕێتەوە
وا دیارە تا دێت ئەتەنێتەوە



دنیاکەی فانی کاروان سەرای ڕەنگ
نیوەی دڵشادەو ئەو نیوەی دڵتەنگ

ئاوێنەی دەوران دوو چێشت دەنوێنێ
خەتە میزێنێ و کڵاو فڕێنێ

بە عەشایەریی دەعوا حەل دەکەن
شاگرد شەق ئەخواو وەستا تێ دەخەن

لە خەت دەرمەچۆو مەکەوە دەورە
دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگرە

لە کەری تۆپیو مەگەڕێ بۆ ناڵ
ڕۆژێکیش دەبێ تۆیش دەخەنە چاڵ

دەستەی خۆی دەوێ کە خاوەن دەستە
دەستە کەوتە دەست، دەستەتر پەستە

ئەو کار بەدەستەی کە کار شوناسە
کردەوە ناسە خاتر نەناسە

ئەوی بە خاتر ئەم ڕۆ دامەزرا
کە ئەرخەی گۆڕا پەتی ئەو پچڕا

ئەو پیاوەی پیاو بێ ئەو ئیشەی ناوێ
وەک ماین چەقەڵ هەر کەسە تاوێ

ئەوی بە هیوای ڕەجاو بەرتیل بێ
ئەبێ گوێی دایم لە زیلەزیل بێ

یا وجوود ئیستا عەکسی ئەوەیە
ئەبینین دەوران بۆ یەک شەوەیە

دیارە ئەو باخە کە نایەتە بەر
«بریسی یا پار ئەو بری بۆزەر»



بە حشتریان گوت حوشتر کورت بوو
وتی لە ئەستۆی من بار لا نەچوو
بە زەیلداریان گوت چی بوو ئەم کەتنە
وتی مەرگ لەگەڵ ئاوەڵان جەژنە
زیلەی زەیل کەم بوو بۆ دڵە لەرزە
لە باران ڕام کرد کەوتمە بەر تەرزە
داخلی تەشویکەم ناخۆم کە دەیبەن
بۆ ئەوە ئەگریم دەمەسۆی دەکەن
توخوا بزانن تەشویکەی قەپتان
دەست کێ دەکەوێ؟ ئەڵڵەت دەست نەزان
هەندێ مەعاشی تەقاویتییان
زۆریشە، لێیان بوو بە ماخولان
هەولی وەزیفە ئەدەن تیر ناخۆن
تا دیسانەوە دەبنە کەوا کۆن
زەیستان لە سەر کاسە سوێند ئەخوا
کە چلەیشی چوو عوزری‌تر ناشوا
خاکی شارەزوور پەستەو بێ‌هەوا
بازیان پڕە لە هەراو داوا
کاسبیش چونکوو دەعیەی تیا نیە
هیچ مەئموورێکی پێ ڕەزا نیە
هەی داد هەی بێداد، دەڵەمەنەکان
بۆ پارەی میریی کەوتوونە مەیدان
ڕێی خۆ چەسپاندن ئەدۆزنەوە
جێی فەقیرەکان ئەقۆزنەوە
بە (مندیل) کلکی گوێرەکە ئەگرز
ڕێی شیاکەکەی لە هەژار دەبڕن



بـــــواره ڕەش‌و ســـــپی دەردەخـــــا
ڕێکــەوتــە نــادان جارجــار ســەردەخــا

شــانس ســپیاوێکە بــە عــارەق دەڕوا
عــەیــبی ئــەخلاقــی ناپۆشــێ کــەوا

ئەگەر بە عیلم‌و عەمەل پەسەند بی
لــەوە چــاکترە کــە دەولــەمــەنــد بــێ

پــاره چــڵکێکە لــە بــەری دەســتا
بــە مــشت قوچانــدن لــە دەســتا وەســتا

پــارەبــو خێــوی زینــەت و فــەڕە
ئاخ بــۆ مــیرات خــۆر میقــرۆبی شــەڕە

عــیلم بــۆ قــەومــێ ڕێگــا دەنوێنــێ
عــالمیش نــاوی چاکــەی دەمــێنێ

دۆست چاکەی دۆستی لێک ئەداتەوە
دوژمن لەگەڵ دۆست ئاشت ئەکاتەوە

ئەوە دۆست نیە بە هیوای پۆست بێ
نەیەوێ دۆستی لەگەڵ کەس دۆست بێ

بڵێن: قەڵەم زەن کەوتوتە بەر زەیل
قەڵەمچی بۆچی کەوتوونە واوەیل

کردمان قەڵەمچی بە تووتن دەم تاڵ
(وەی من وەی منی) چیەتی بەقاڵ

دیارە لە ئێمەیش بووە بە کردەوە
لـــە عیـــسایان دا مووســـا بـــوردەوە

کەس نالێ قەساب گۆشتت بە چەندە
جامباز بانگ ئەکا وەرە (خەر) بەندە

یاخوا هەر بژی دائیرەی ئەشغال
نەکرێ کاریی دەمکوت بوون کەم حاڵ



ئـەڵـێن: باخـەڵـت پـڕ بـێ لـە پـارە
خــزم‌و بێگانــەت لــە دەورەو دیــارە
مـن ئـەڵـێم دۆسـتێ کـە بـۆ پـارە بـێ
ئـەبـێ چـاو بڕسـی‌و گـەدا چـارە بـێ
ئــەنیـنـە دیـارە پیـاوی دەوڵــەمــەنـد
پارەی خۆی بە کەس نادا بێ گۆبەند
دۆست ئەو دۆستەیە بۆ کردەوەی چاک
خۆشـەیـستت بـێ بـە دڵـێکی پـاک
دۆستی چـاک چاکـەو بەرچـاو تێرییـە
بـۆ ئـەمـری ویجـدان گـوێ رادێرییـە
بــارانی نیــسان دانــەی گــەوهــەرە
فەیزی بۆ بەدبەخت هەر کەوای تەڕە
ئیتـر وا ئیـشغاڵ کـەوتـەوە سـەر کـار
خریـدو فرۆخـت کـەوتـە ناوبـازار
یـاخوا ماکینـەی ڕێوبـان نـەوەستێ
ڕێـی گـوزەرانی هـەژار نـەبـەستێ
زۆر چـەتـوون دەڵـێن نـان وا لـە خاکـا
بـە کـرێ کـاری (چـەتـە) چـت ناکـا
ئەمجارە پەکمان کەوت لەبەر باران
هـەفتـەی ئایینـدە دەچینـە سـەیـران



وا دەڵــێن: ئــادار نــاڕوا بــە بــێ دۆ
دوای ئـەو نیـسانیش نـاڕوا بـە بـێ جـۆ
بــارانی نیــسان جــۆی خــسته دواوه
بـا ڕەحمـەتـیش بـێ تـامی نـەمـاوه
پاشـکەوتـنی جـۆ بـە کـەن مـەژمێـره
خواردنــێ چوارپــێو دووپێــە لێــره
دووپـێ بـە چوارپـێ ئـەڵـێ ڕووبـەڕوو
نوخشه بێ لە تۆش نوخشەمان دەرچوو
بـاران سـێ‌پـەرەی گـەیانـده خایـە
نــانی چوارپێکــان وا لــە ڕۆنایــە
چوار پێ لە دوو پێ بەدخوو چاکتره
بـە (جـۆ) هـەڵ دەکـاو دڵـی پـاکتره
ستەمگەر کە مرد خاک نایگرێتە خۆ
بـە دڵ خـوا شـوکر، بـە دەم ئاغـا ڕۆ
وا شـەمـەنـدەفـەر بـوو بە هـی خۆمـان
تـا وەفـد زۆر بـێ قارانجـە بۆمـان
توججار هەموو چوون شێخان لە تەکدا
ئـەڵـێن: (هـەم چـونین بـڕۆ تـا بـەغـدا)
نــاوی وەفــدمان هێنــده لا خۆشــە
هـەر بڵێن: وەفد، زۆر کـەس بە جۆشـە
ئـەگینـە هـەمـزە لـە هـەباسـی چـی
چرچـە قـەلایـی لـە مۆریاسـی چـی
زۆر لــە بــارانی نیــسان ڕادەکــا
بـە دەنگـی بۆمبا خـەڵـک سـەما دەکا



ئەو پیاوە گەورەی خۆی بە کەن ئەگرێ
لە ئەندازەی خۆی زۆرتر سەرئەخرێ
ئەوی خۆی لە ژوور خەڵکی دەنوارێ
با پایەیشی بێ دەی هێننە خوارێ
لەش و عەقڵ و دڵ ئەم سیانە ساغ بێ
ساحێبیان دەبێ هەر بە دەماغ بێ
لەگەڵ خۆهەڵکێش خۆش باوەڕ مەبە
ئاڵتوون بە محەک پیاو بە تەجرەبە
گوێی ڕاستت سووک بێ بۆ چاکە بیستن
گوێی چەپت کەڕ بێ لە فیت هەڵبەستن
قسەی چاک زەحمەت ئەگاتە جێی خۆی
واتەی بەد زۆر کەس پۆستەچییە بۆی
ئاگری دزان شەوێ دەگرێ
چەقۆی بێ پۆلا دوو ڕۆژ دەبڕێ
دەوران دەورانە دەبدەبەی شایی
ڕەواجی نەما بێچوو و سێ شایی
کوا گرمەی تەپلی بەگزادەی جافان؟
کوا بەزم و ڕەزمی مێولێ و تافان
ئێستا کە باوی قەشەو مالوومە
سوێند هەر بە سەری (ئەورام شالوومە)



وا گـەرمـا داهـات پاقلـە پـەیـدا بـوو
سەودایی مەشرەب شێتو شەیدا بوو
جـاران ڕێ ڕاوی زەڵـم لـە نـاوا بـوو
ئێستا مـیری سـوور ڕێگـەی ئـاوا بـوو
پـەنـدی پێـشینان ئـەکـەوتـە بـەر دڵ
ئێـستا لـە زۆر کـەس بـووە بـە چڤـڵ
هـەر چی لـە خۆیا چشتێ شـک بـەرێ
هـەوڵـی ئـەوەیـە (ژیـان) بـدڕێ
تـێ گـەیـشتنمان ئـەمجـار تـەواوە
کەر لـە کـوێو کونـدە لـە کـوێ دراوە
سم سمی (هەرە) چنگ چنگی ئاسێ
لـەم کـردو هـەوڵـە سـەرم ئـەماسێ
ئـەگـەر تـۆ پیـاوی لێکـی دەرەوە
کردەی بەد لە خۆت، خۆت دوور خەرەوە
ئـەگینـە دەمـی خـەڵـک کیـسە نییـە
ئـەبینـێو ئـەیـڵێ گونـاهی چییـە
ئەو شیعرە خۆشـە لای مـن زگ تێر کا
چـشتی نایـابی خـواردنم فێـر کـا
کـە (بامیـە)ی تـازەو (تـەماتـە) دەرچـوو
بـا بـڵێن: ڕۆستـەم مـێ بـوو یـا نێـر بـوو



ئەم ساڵ ئەمەندە هەور ئەگرمێنێ
تریشقەی دڵمان ڕادەچەنێنێ
قینی بێدادی لە هەورامانە
هەورامان لووتی لە ئاسمانە
بە تەرزەو لافاو لووتی نانەوێ
قەزای ئەمدیوی لەودیوی کەوێ
هەورەتریشقە با کێو بسمێ
گشتی ئاسانە هەر (سان) نەجمێ
با دنیا لێمان نەبێژرێتەوە
خۆڵمان بەسەردا نەبێژرێتەوە
ماران گەز هەموو شوێنێ دەپرسێ
لە خشەی مارو مێروو دەترسێ
لە تەقەو ڕەقە دڵم زۆر تەنگە
خودا نەکەرۆ بوواچان جەنگە
خزمەتی وڵات هەر بە عیلم ئەکرێ
بە چرای خوێندن پێ دەردەکرێ
بار ئارد بەرەکی بۆیە لە پاشی
هەر کەسێ بە لای خۆیا داتاشی
ئەویان بە ماڵی ئەویتر خرە
قاپی مەحکەمە بۆیە وا پڕە
تا حەوڵو قووەت لە سەر ڕەجا بێ
ماڵی بێ‌ماڵان نابێ ئاوا بێ
هەندێ ڕەجاکار سەیری زۆر خۆشە
پێی ئەڵێی نێرە ئەڵێ بیدۆشە
هێندیکیش بە هیچ تەریق نابنەوە
بە دووی ڕێویدا ئەچنە کونەوە



ڕامـەکـە لـە دوای کـاری پـڕوپووچ
هـەڵ نـەخلیسکێیە لـە پڕ لینگـەو قـووچ
ئەوی بـە چاکـەی خـۆی خۆشیان ئـەوێ
دەست گیری زۆرە ئەگـەر پێش کـەوێ
کـــە بـــە وەزیفـــە دڵ بـــڕەنجێنـــێ
دڵـــی ناســـرەوێ ئـــەگـــەر بیـــشمێنێ
هـــیچ پایـــەدارێ پایـــەدار نییـــە
هـیچ سـەرمـەستێکیش بـێ خومـار نییـە
بیـانووت پـێ بگـرن خـۆت لادە لـەوێ
لە سەرخۆش گەڕێ ئەو خـۆی دەکـەوێ
کە نەنگەویستیت بـوو لـەگـەڵ بـەدکـار
دوعـای بـۆ بکـە زوو بچێتـە سـەر کـار
دوعـــای پیرێـــژن ئـــاخر خێرییـــە
خـــۆش گـــوزەرانی بـــە زک تێرییـــە
هەندێکیش هـەیە لـەگـەڵ تێری خـوارد
دەوری برســـییەتی ناکـــەوێتـــە یـــاد
گـەورەت کـە کـردی بـڵێ مـن یـارم
(لـەکـت) دی بـڵێ مـن ورمزیـارم
ورچ سەر پردی گـرت بـانگی کـە خاڵـە
ڕەنـج لـەگـەڵ گورگـا مـەدە بـەتاڵـە
لـــە شـــێر مـــەترســـە ئـــەو ناتـــشکێنێ
چـــەقـــەڵ خراپـــە لێـــت ڕادەمێنـــێ

ئەڵێن: هار چل شەو ئەژی درۆیە
کوا لە ماڵی هار شین و ڕۆڕۆیە
کوشتەی عارەقمان، وا لە پێش چاوە
ئێواران هیچمان لە بیر نەماوە
ئینسان لە نیسیان دروست کراوە
چاوی بە پەردەی غەفلەت پۆشراوە
تا ساتمە نەکا چاو هەڵ نابڕێ
ئەکەوێتە چاڵ پەلوپۆی ئەبڕێ
بەدکار لە چاکە خراپەی چی دی؟
ئاواتی بەدی خۆی دێنێتە دی!
ئەزانی خوا بۆچ بەد ئەژێنێ
ئەگەر بەد نەبێ بەدکار نانوێنێ
تا نەمان بەنە گردەکەی سەیوان
چاکەو خراپە نایێتە مەیدان
فورمەی وەزیفە کە بوو بە کفن
دەستو پێ لە پیاو ئەبێ بە دوژمن
کە مەڕ نەموو کە چاو زەق کاتەوە
ئاغایی لە بیر پیاو ئەباتەوە
ئەمانە ویزەی بەر گوێی بێعارە
کەس ناڵێ مردن هەیە لەم شارە



موقتەزای خولقە کێچ پیاو ئەگەزێ
ئەو دڵە دڵە کەوا نەلەرزێ
ئەگەر بمێنین کای تازە دەرچوو
وا چاکە کارت حەواڵەی خوا کەی
خوا ڕەگی بەدکار لە بن دەردێنێ
تۆڵەی کارژۆڵەی بێ شاخ ئەسێنی
هەندێ بە گاڵتە ئەڵێن بڕوانە
هەرچی مزگەوتە هەمووی وێرانە
ڕاست ئەکەن ماڵی خوا بەڕەڵلایە
زۆر لێی ناپرسێ کە (حق‌الله)یە
بەلام بەدادە بۆ (حق‌الناس)ێ
قوڕگی بەد ئەگرێ هەتا ئەتاسێ
کە تۆ لەگەڵ خەڵک بە بوغزو کین بی
نابێ بە مەکری خوا ئەمین بی
سەرم لە کاری خودا سوڕ ماوە
بۆچ پیاوی چاکی خستۆتە لاوە
دەوران دەورانەو ئێمە بێ‌سەبرین
نابینین پێچکەی زۆر تابووت ئەگرین
پێستی حوشتری ساڵح ئەگوروین
کورتانی کەری جەجاڵ ئەدوروین
با یەزید فەرمووی وشکیانو تەڕیان
«کلی، غرقش کن ما هم در میان»



هـیچ کـەس نازانـێ کـە ئـەم دنیایـە
چەند هەمەچیزەی ڕەنگ ڕەنگی تیایە
یەکێ هەر لە شوێن پارە عەودالە
لە مسکێن بوە بە زەردەوالە
وەک هەنگ لەمو لەو هەنگوین ئەگرێ
کە پێیەوە دا کەچی خۆی ئەمرێ
کەم پارەدارم دیوە تێر بخوا
بۆی دێتە بەرهەم لەپڕ خۆی دەڕوا
پارەی میراتیش میقرۆبی شەڕە
برای میرات خۆر دەست بە خەنجەرە
وەرە بنوارە دەعوای مەحکەمە
زۆری میراتە دەعوای تر کەمە
هەندێکی تریش کەوا بێ پارەن
هیچ قەدریان نیە لەگەڵ ئاوارەن
هەر بەداخەوەن ئەڵێن ئاخ پارە
دنیا بۆ پارە لەگەڵتا یارە
دەولەمەند پارەی بە کەس نەداوە
ئەم گشت عالەمەی ئەڕوا لەدواوە
هێندێ کەوتوونە دەریای سیاسەت
بە قینەبەری بوونە سیاسەت
قینیان لەوەیە ئەم داهیانە
زادەیش نین سەریان لە ئاسمانە
کردەوەت باش بێ چاکیو بەڕێو جێی
کە خوا دای هیچ کەس نالێ کوڕی کێی

هـەنـدێ خـوا بـۆ شـەڕ هێناونیـە دنیـا
وەزەنـدی خـەڵـکیان ئـەوێ بـە تـەنیـا

کـەرە جـەلاد بـوو دەیـوت دەقچێـنم
بـە لینگـەفرتـێ نـەشـئەی خـۆم دیـنم



دیسان خومخانەی بەهوودی شێوا
درۆی باڵداری لێ کەوتە هەوا
دەوەن بەئاشەو دووبەرەکییە
پیر، لێی تەریکەو تیا دەرەکییە
یەکێ بە گورزی لەندەوور ئەخورێ
نانو دۆی تیرەی شێرزادی دەبرێ
ئەویتر دەڵێ: لەندەهوور کێیە
شێرزادی نامەی فەتحیان پێیە
شەڕی عەنتەرو ڕۆستەمی دەستان
لە ناو ئێمەدا بوو بە داستان
یەکێکیش دەڵێ لای خوداو بەندە
سوورەتی (یاسین) گەلێ پەسندە
خۆ ئەگەر (یاسین) (طه)ی لەدوا بێ
کە خوێندت ئەبێ کارت ڕەوا بێ
کابرای خۆمان سەر مەلامانە
بەو حەل ئەکرێ ئەم ڕازی نیهانە
ئەڵێ: بە هیوا کەس لێت ناپرسێ
دەنگی تۆپ نەبێ هیچ کەس ناترسێ
حاجی (ئەمین)یش ماچۆ بواچە
نوێژی جەعفەری‌و تشربی پاچە
منیش ئیمانم بەوە مەتینە
عالمی بەکار دائیم ئەمینە
وتیان مەلا هات وتی بە تۆ چی
وتیان تێ پەڕی! وتی بە من چی

پـارەی دەوڵـەمـەنـد لـە قاسـە دەنـوێ
فـەقـیر لێـی ئـەدوێ تـا چـەنـەی ئـەسـوێ
وا دەزانـــن ئـــەو یـــا ئـــەم بێتـــە نـــاو
ئێتـــر بـــۆ ئێمـــە تێـــر پـــڕە لـــە چـــاو



عــادەتی دنیــا بــە ســات ئــەگــۆڕێ
زۆر دەوڵــەت هــەیــە لــەپــڕ ئــەدۆڕێ
هاونــشینی بــەد زوو تــەئــسیر ئــەکــا
زۆر دۆســتی گیــانی لــێ دڵگیر ئــەکــا
چــەنــد قــەزای دیــزە کــەوتــووە لــە گــۆزە
ڕەش هەر ڕەشــە لای ئــەهلــی ئــەم کــۆزە
کــە قــەڵــەڕەشمــان ڕێ پیــشاندەر بــێ
ئــەبــێ گــەورەمــان هــەر دەربــەدەر بــێ
ئــەمــە دوو جــارە ئــەکــەوینــە چــاڵ
زەرەر دەبیــنین بــە مــاڵو بــە حــاڵ
هێــشتا پیــاوی چــاک لێــک ناکــەینــەوە
گــرەو لــە پیــاوی بــەد نابــەینــەوە
تــا ئیمــڕۆ پیــاوی خۆمــان ناناســین
بــە گوریــسی بــەد ئــەبــێ بتاســین
هــەنــدێکمان هــەیــە دوڕ دەقــەڵێــشن
کــەچــی بــە تــەفــرەی بــەد دڵ بــەئێــشن
هــەی لــە ڕێــی خــوادا کــە دێنــە قــسە
ئــەرەســتو لامــان هیچــەو ناکــەســە
کــەچــی بــە (بلــۆف) ئــەمــان ترسێنن
لغاومــان دەکــەن دەمانــڕەتێــنن
نــازانین چــاکو خراپمــان کێیــە
بــۆ گــردی ســەیــوان ئــەچــێ ئــەم ڕێیــە



ئەووەڵ پەردە بوو لە سینەمای چەرخ
بـــزانین چۆنـــە! ئینجـــا بـــازی بـــەرخ
کەس بە بازی چەرخ پشتی نەبەستێ
هەر چی کەچرەو بێ ئاخری دەوەستێ
رێـی راسـت ئـەمینە ئـەگـەر پیا بـڕۆی
لە لای هەموو کەس بێگانە نیت خۆی
دوو بـەرد پێکـادەن یـەکـێ شـکابێ
ئـــەوی تریـــشیان بـــێزدەدە نابـــێ
ئـەوی لـە دوژمـن تۆڵـە دەسـتێنێ
ئـەو ئینتیقامـەیـش بـۆ ئـەو نامێنـێ
ئەوانەی دوێنێ کە لە ڕوو دۆست بوون
وا ئەمڕو دەرکەوت بە تەمای پۆست بوون
کە دۆسـت رۆیـی‌و تـۆ بـێوەفـا بـووی
دیـارە لـە ڕێـزەی پیـاوەتی دەرچـووی
هـەنـدێ وەفایـان بـۆ دوایـان نییـە
ئێـــوە هیواتـــان بـــەوانـــە چییـــە
چـەنـد خۆشـە پیـاوێ ناوچـاوان دەرخـا
بە پیاوەتی خـۆی قسەی خـۆی سـەرخـا
چەند خۆشە دۆست ناوچاوان پاک بێ
لـە بـەرەو ڕوویـی درۆ بـێبـاک بـێ
ڕوو لــە پاکیـــە بــە خێــر ئــەم نــاوە
گامـــان گـــرووە کلکـــەکـــەی مـــاوە



دەمێکــە قــەتــرەی حــەیــا تکــاوە
بۆیـــە وا زوبـــان تـــەڕو پـــاراوە
وای ئــەفــەنــدمو کۆمــەڵــی یــاران
ئــەڵــێی نــە بایــان دیــوەو نــە بــاران
زۆر پیاو وەک درەخت موتربە دەکرێ
هــەرمێیــەو جارجــار تــرۆزی دەگــرێ
لـــەم هاوینـــەدا کـــۆلارە زۆرە
بۆیــە لــەگــەڵ ژن هــەر ئــاڵ و گــۆڕە
ڕاســت ئــەکــەن ئێــرە ڕەشــەبــای زۆرە
لــەگــەڵ فیــشاڵدا کــەوتۆتــە نــۆرە
تــازە وەســتاحمەد شــەو ڕوودۆز ئــەمــا
بــەر دوکانــەکــەی تــەپو تــۆز ئــەکــا
حــوکمی ڕاپــۆری ڕەشــۆل نــەمــاوە
قــەتــارو قۆڕیــات شــان بــە شــان بــاوە
جــارێ بــا بــزانین ســاڵ بــەری دوورە
من لــەمانــەم چــی شــای مــن ئــەنگــوورە
مــەجلیــسی دەوری حــەوزەکــەی خۆمــان
ترێو کاڵەک و شــووتێو ســێوی جوان
ئـــەمانـــەن شـــاەو وەزیـــرو موشـــیر
خــۆش گــوزەرانی پێویــستە بــۆ پــیر



فیرعەون کەوتە نیل وتی لە ترسا
ئیانم هێنا بە ڕەببی مووسا
«ئەبوتالیب»یش بە تەعنەی ژنان
بە پێغەمبەری نەهێنا ئیمان
ئەویان بۆ ژیان ئەم عیززەتی نەفس
بێ عیززەتی نەفس کەس نابێ بە کەس
وەک کابرای کوردە شیریان نایە سەر
(نووحی) گوت بەڵام نەیگوت پێغەمبەر
لای هەندێ ماددەی نامووس بەتاڵە
لە مووداراداا وەک پەشتەماڵە
لە قۆمیدیادا ئافتوری ماهیر
هیچ فاڵسۆیێکی لێ نابێ زاهیر
هەندێکیش فوو بای زوو دەردەکەوێ
مایە پووچییان هەر بەردەکەوێ
نیسکی مۆریاس و هەرزنی ڕەنگاڵ
بێ بەرو پشتن بۆ کەس نابنە ماڵ
ئەوانە ڕاستیان چۆن دێتە سەر لێو
دەم بە پێکەنین دڵیان پڕ جنێو
لەگەڵ یەک زاهیر دۆستی دەنوێن
خەریکن ملی یەکتر بشکێنن
هاکا لە ڕووی کار پەردە هەڵگیرا
تەنافباز قۆڵی لە قەڵبە گیرا
وەزیفەی گەورە زۆر پیاو گێژ ئەکا
پیری شاعیریش فرە بێژ ئەکا

کـە خـوا سروشـتی ئێمـەی خـستەڕوو
(و خلقنـــاکم اطـــوارا)ی فـــەرمـــوو
هەندێکمان هـەیە کـە گۆشـت نـەخۆرە
گۆشـتی بـۆ ئـەبـێ بـە زگـەشـۆرە
هـەنـدێکیش بۆنی پیازی کـرد هـەڵـدێ
هەندێ بە کشمیش دڵـی تێک هـەڵـدێ
هـەنـدێ لا لایـان کـە قـەزوان ئـەخۆن
هێندە تورە دەبن ئەڵێی خۆێن ئەخۆن
هـەنـدێ بـە جیـرەن دان بێ‌هـۆش ئـەبن
هەندێ بـە بۆنی خۆش نـەخۆش ئـەبن
هەندێ کە هەنگوین ئەخۆن قـەبز ئـەبن
هەندێ بـە قۆخێـک تووشـی لـەرز ئـەبن
هـــەنـــدێ لغـــاوی شـــەیتـــان کـــراوە
هیچـی لـە ماڵـی خـۆی پـی نـەبـڕاوە
هـەنـدێکیش ئـەیخـواو ئـەیبـەشێتەوە
دوو چـەندانـەیـشی زوور بـۆ دێتـەوە
چـــاو نابڕێتـــە مـــەســـەنـــدو پـــارە
بـۆ ئێـشی فـەقـیر وەک خزمـەتکـارە
هەندێ وەک دووپشک چزوی پڕژارە
تـــەبعـــەن مێـــڵمی کـــەوتـــو هـــەژارە
ئـەبینێ بـەدکـار کـە چـی بـە سـەردێ
عیـــبرەت نـــاگرێ‌و نایێتـــە ســـەر ڕێ
جوولـەکـە شـەمووی هـاتبوو بـەسـەردا
مسـلمان ئـاگری لـە ڕیـشی بـەردا

گــاور جگــەرەی پــێ دادەگیرســاند
شـیعەش بـە کـیردە کولـە دەیترسـاند

رەســــم و ئــــایینی زەمانـــــە وایــــە
لـــە رۆی رەشدا کـــێ بـــەوەفایـــە

ئیکرامـــی فـــەقـــیر بـــە کـــانو دۆیــە
لـــە هـــەمـــوو شـــوێنێ کـــەوا بخۆیـــە



هاوینــە هــەورەو گرمــەی ڕەشــەبـا
ئـاخۆ مــەڕەزەی كــێ شــەرا ئــەیبـا
تــووی ســەرو دانــە ســەوزو پــاراوە
بـێناوی كنـگ ئـاو بـۆ یێكـەس مـاوە
هــەرچـی بــە ئــەرخــە تــەعـین كـراوە
لــە ترسـا دڵــی وەک (بی) نــاو ئـاوە
مــوژدەیــان بــەنــێ هیچیــان بـۆ نابــێ
بژاریان دەبـێ وەک پـووش لە (کـا) بـێ
كـار بـە دەسـت ئـەگـەر بـێكـارە دەركـا
ئەبێ لەگەڵ خەڵک خۆی تووشی شەڕ کا
ئەگەر هەر وایش بێو ئومێی کاتـب بـێ
ئیـشی دەوائــیر ئــەبــێ ڕاسـیب بــێ
ڕاسـت بـۆ دەفتـەردار ئـەمـەی ڕوو داوە
وای لــە قوونێــەو وای لــە دۆشــاوە
لــە نــاو (ســنە)دا ئــەم پــەنــدە بــاوە
یێــــژن ملیچـــــک وا بــــە هـــــەواوە
ئـەفڕێو ئـەخنێو یێژێ بـە هـوو هـوو
ئەوەی کە کریا وەک بـەفری پـار چـوو
ژنی فــرە مێــرڕ بــەر ناباتــە بــەر
بریـــسی یـــا پـــەر ئـــوبیری بـــۆزەر
تــا ئـیش بــۆ خزمــان بدۆزینـــەوە
ئــەبــێ لــە هــەوار بگوێزینـــەوە
خـۆ ئـەگـەر بـۆ ئـیشو پیـاو بگـەڕێـن
بـۆ كـار ڕەوایـی ئینجـا لـە سـەر ڕێـن



باران کە ناوی ڕەحمەتی خوایە
بۆ کشتو کاڵمان ئەوە سەرمایە
زۆر جار هێلانەی بەدبەخت تێک ئەدا
لە شۆڕەکاردا دڕک لێک ئەدا
خوا تەجەللی خۆی بەم کوردە نواند
(لیلەتولقەدر)ی بە .... با دۆڕاند
حەوتەوانەمان بۆ دێتە بەر ماڵ
ئێمە ئەیدەینە بەر گورزی بەرماڵ
خەڵکی بۆ یارمەت پشت ئەدەنە یەک
ئێمە بۆ تۆران پشت ئەکەینە یەک
نیشان بەو نیشان ئەمجارەی دەربەند
لای دۆستو دوژمن پشتمان لە یەک سەند
کەس دەربەندی کەس نیە بو مردن
ئەو دەربەندەیە زاماری کردن
بەخیل سێ نەوعە لەم دنیایەدا
یەکێ نایەوێ خۆی بەکەس بدا
دووەم نایەوێ چاکەی کەس بۆ کەس
سێیەم دەربارەی خۆیشی فریادڕەس
ئێمە لە دەستەی سێیەم بەخیلین
لە چاو شاراندا بۆیە زەلیلین
ئەڵێن: بۆ ڕێوبان ئەمەندە پارە
ئیسرافە دڵمان پێی برینداره
هەرچی ئەیکوتم ئاسنی سارده
سا نوخوا مەلا ئەمیشە ئاردە



گەنەی پەیدا بوو ئەم پیرو کۆزە
قەزای دیزەیە وا کەوت لە گۆزە

گوێرەکەیەکی لەڕ کەوتە پەموو
گاگەل بە زبان ناویران هەموو

لافاو دارو بەرد تێک ئەڕووخێنێ
قەزا لە قەزا تۆڵە دەسێنێ

من ماسیم نەهێشت لە ئاوی زەڵما
کەچی لەشی تەڕ بۆ خەڵکیتر ما

من شەکرو ڕۆنم ئەکرد بە حەلوا
کەچی بۆ خەڵکی ئەبوو بە لوا

پێنجو دوو ڕۆژە خەوی ڕاگوزەر
هەرکەسە دەورەی خۆی دەباتە سەر

ئەی دنیای فانی کاروان سەرای ڕەنگ
نیمێ بە دڵ شاد نیمێ بە دڵ تەنگ

لایێ چل فەردەی شەکراو بەش ئەکا
لایێ تۆپەڵێ قورەڕەش ئەکا

خوا هەر ئەو خوایە قەڵەندەرخانە
ئێستا چۆن بووە وەک (چروستانە)

کاڵەم هەموو لە ژووردا تەپی
خۆم بۆ سەر چۆپی چوومە ناو قۆپی

خوا یار بێ هەموو دێتەوە کایە
سەبری پێ دەوێ ئەمە دنیایە



پــەپــووی ســـلێمان مـــزگێنی هـــانی
کـــــەوا ئاســـــەف دێ بــــۆ ســـلێمانی
لــەهــەمــوو لاوە خــەڵــک کۆبوونــەوە
بـــۆ مـــــەراســـیمی بــــە پیرچونـــەوە
دار لـــە بـــاز جـــارێ کـــامی دێتـــەدی
خـــوا ڕەوای بینـــێ شابازیـــشمان دی
ئـــەم جـــارە قـــەدری ئـــەم شـــارەم زانی
هێنـــادە میـــوانی عـــەزیـــزی هـــانی
ئـــەم میوانانـــە دیـــاری‌یـــان دیـــار بـــێ
ئـــەشـــێ ئـــەم شـــارە تاڵـــعی یـــار بـــێ
بـــەڵام کـــە خۆمـــان داری بـــێ بـــەر بـــین
کـــەوا کۆلـــەکـــەی تـــاقی زەفـــەر بـــین
ئەڵێن دەشتس ڕەی جێی حەوت لەشکر بوو
تـــەختی ســـلێمان بـــەشـــەرەفتـــر بـــوو
ئەوێ جێی شەڕ بوو ئێرە جێی دەعوەت
ئەوێ جێی زەحمەت ئێرە جێی ڕەحمەت
ســـا چـــی بکـــەم بـــەخـــتی مـــن شـــۆڕەزارە
بارانیـــشی بـــێ هـــەر خـــەس‌و خـــارە
وەزیـــری بـــەغـــدا یـــارەی پـــەســـند کـــرد
هات کـــانی دڕکەی سکانی هـــەڵ گـــرد
ئێمەیش هەر کەسێ بەخت ڕێ کەوێ بۆێ
ئـــەبێتـــە دزی گـــاو گـــوێرەکـــەی خـــۆی
هـــیچ کـــەســـێ نـــەفعی عومـــوومی نـــاوێ
بۆیـــە دەخنکـــێین بـــۆ کاســـە ئـــاوێ
هـــەرچـــیش دەبـــینی دەڵـــێ: زەعـــیمم
لـــەم نـــاوە هـــەر مـــن هـــەتیـــوم



ئـەو سـەرکـردەیـەی بـە ڕاسـت ئینسانە
بـەنـدو زنجـیر لای ڕوتبـەو نیـشانە
بەلام نەک قەومی توش کاو خۆش ڕاکا
وابـێ ئیتـر کـەس بـڕوای پـێ ناکـا
ئـاخ ئـەمـە ڕەنجـی داویـن بـە بـادا
لـەشـکری نـادان پـشتمان بـەرنـادا
تـا عـەقـڵ کـاری لێـک ئـەداتـەوە
جـەسـوور گـرەوی خـۆی ئـەباتـەوە
تـەمـاع وەک ئـاوی شـۆری دەریایـە
هـەر ئـەیخۆیتـەوەو تـەسـەلـلات نایـە
ئـەوەی قانیعـە بـە وشـکو بـە تـەڕ
نـاوی تـراوە شـاهی بـەحـرو بـەڕ
هەر چی ڕاست ئەڕوا لە تەوەککولدا
خـەم و خـەفـەتی نـایی بـە دڵـدا
خـوا ڕێ لـە بـەنـدەی بـەدکـار بگـۆڕێ
تابیتـە سـەر ڕێ تـا لێـوی گـۆڕێ
هیوامـان وایـە دەسـتەی خوێنـدەوار
بۆمـان پـێ بگـەن بکـەونـە ڕووی کـار
بـا وجـود ئـەگـەر مـەکتـەبمـان وا بـێ
خـەرمـانی هیـوا ئـەبـێ هـەر کـا بـێ



زستان شـەوارە بـوو بـە چـرای نـەوت
زۆر کەس بە هاوین بە شەوارە کەوت
بـە چـرای گـەرچـەک یـەکتـر نـابینین
بۆیە وەک چرای گەرچەک بێ تینین
شـەوقـی کـەهـرەبـا هاتـە کایـەوە
جـۆم بـۆ لـە کـادا نـەشـارایەوە
یەکێ لە (کفری) لەڕێ (کفر)ی کرد
خەڵق بە خیرەومەند ناویان ئەبرد
یەکێ خێر ئەکا بۆ ڕێی خانەقا
کە چی بێ ئینساف کافری دەکا
شـێخی بایـەزیـد ناحـەقـی نـەبـوو
فەرمووی وشکو تەڕ با بسووتێ هەموو
قـەزا ناحیـەو مـەکتبـەکـەمـان
هـەمـوو شـاغیرین ناکریتـە خـەرمـان
دونیـام لـە لامیـەو بریـانی پـڕ کـرد
هێشتا (بسم الله) بـسمیللای نـەکـرد
هـەر چـی باینجـان خـۆر بـێ لـە ژوورە
(بـسم الله» وەرە تـۆیش لێـی ببـوورە
تاکەی ئەم چەرخە وا چەپ دەگەڕێ
تاکـەی کـەرە دیـز بـە جـۆ دەزەڕێ



ئەگەر دیکانی خاوەن بەخت نەبێ
شاخی ئەزمڕی وا بۆ تەخت ئەبێ
کە عەدالەت بوو «قەوییان» زەعیفە
زۆر کەم بوو باوی جینسی لەتیفە
هێشتا تێ ناگەین لە چاکی ژنان
زەعیم خۆی خستە کراسی ئەوان
بە هاوار وتم ئاخ، هەورا! ئامان
مەیکەرە تاڤگەی زەلمی هەورامان
تەختی هەورامان بەختی هەڵپێکا
کۆی ئاتەشگایان بوویە ئاتەشگا
گەردشی دەوران ئەم دیوەو دیوە
ئەم خاکە زۆر جار ئەم حاڵەی دیوە
من ئەمگوت «زەڵم» ماسیی لێ بڕا
کە چی هێند زۆر بوو گونیەکەی دڕا
ئۆتۆمۆبیل چوو، بۆ قەڵادزە
دەچمە سندۆلان بۆ ڕاوە بزە
مەنسووری هەڵلاج بە چەکەو کەوان
تۆتۆمۆبیلی بردە سەر کێوان
پێشینان دەڵێن خوا، هەر ئەو خوایە
ئێستا کە بزن وا سواری گایە
بەراز کوژ دووسەد فلس وەرئەگرێ
بۆ بەرازی شار بۆچ نرخ نابڕێ
لۆقەتەچیمان خرە لامبۆزە
بێ بسم‌اللەیە، چێشتی پڕ تۆزە



بـه ئیـستریان گـوت: بـاوکی تـۆ کێیـه؟
وتی: ڕەسـەنی دایکمـم پێیـه!
چونکـه دووڕه‌گـه‌و تـووی حـه‌رامـه
هێـشتا جاشـکی خـۆی نـه‌دی ناکامـه
تـانجی لـه ڕاودا هونـه‌ر دەنوێنـێ
نه‌تـه‌وەی سـه‌گـه‌و گـورگ ئـه‌خنکێنـێ
عابید مشکی کـرد بـه کچـی سـه‌رپـشک
ئـاخری نـه‌وەسـتا بـوەوه بـه مـشک
ئەڵێن: گیا لـه سـه‌ر بنجـی خـۆی ئـه‌ڕوێ
بـه‌لام بێـستانیش بـزاری ئـه‌وێ
بێـستانه‌کـه‌مـان پـڕ لـه بـژاره
بۆیـه مالـیان مافـه‌تـه‌داره
بەرازی نـاو شـار شـه‌رحـێ نەبـوو بـۆی
هـه‌ر چـی دەبینـێ ئـه‌یباتـه سـه‌ر خـۆی
کرکـرەی ڕادیـۆ بـواری نایـه
بـه‌ش بـه حالـی خـۆم بلـوێر بـۆ گایـه
ڕەحمەت لەو کەسەی ئەسپێ ئەکوژێ
لـه باخـه‌ڵـتایه‌و خوێنـت ئـه‌مـژێ
دەربـارەی ناکـه‌س پیـاوەتی مـه‌کـه
بیبـه‌یتـه کـه‌عبـه دیسان (لـه‌ک)، لـه‌کـه
هـه‌نـدێکیش دەلـێن کـه ئێمـه نـه‌بـین
ئـه‌هلـی مـه‌ملـه‌کـه‌ت ئـه‌کـه‌ونـه شـین
نـازانن خۆیـان شـه‌ینـیش‌و شـینن
تـه‌نهـا قـازانجی خۆیـان ئـه‌بیـنن
ئـه‌گـه‌ر خـوا دەکـا خوێنـدن دێتـه کـار
ئـه‌وسـا ئـه‌جـرەبـه دەگاتـه بـوار



پــــایز ڕووی زەردی خــــەزانی هێنـــا
ڕەعدیش قامچی خۆی لە هەور داهێنا
دەمێکـــە بـــەرگـــی هـــەتیـــو دڕاوە
ژوور لە بێدەستان لای چەرخیش باوە
ئاسمــان ساڵــی چــوار جــار ئــەگــۆڕێ
بەختی کــورد هــەمــوو ڕۆژێ دەتــۆرێ
خــوا کێــو ئــەبینــێ بــەفــری تــێ دەکـا
بەنــدەیــش ماستاوی ساردی لــێ دەکـا
سورشتی ئەزەل وەک (باز) و (کەو)ە
لــە جێیــەک ڕۆژەو لــە جێیــەک شــەوە
دوێنــێ خــەتیــب مــرد ئــەمــڕۆ شــایە
بۆیــە دەڵــێن عــەبــد لــە خــۆی بایــە
ئــەگــەر قابینــە جــار جــار نــەگــۆڕێ
ســـەودای وەزیریـــی دەچێتــە گــۆڕێ
ســـەری بـــێ ســـەودا تـــۆپی فتبۆڵـــە
ماڵــی بــێ ئاهــەنــگ کــەلاوەی چۆڵــە
بـزەن بـەڕ ڕەنـدان هـەر چـی بـادا بـاد
بــە بــادە غــەمــی دڵ بــدە بــە بــاد
سیاســەتی ڕاســت مـــەڕۆ مـــەڕۆیـــە
ترسنـۆک بــەشــی هــەر باوکــەڕۆیــە
شێر چۆن لــە دەنگی دەهۆڵ ئــەترسێ
کە ژنی خــۆی بێ کــەس لێی ئەپرسێ
کــەری خۆمانیــان کــرد بــە ڕمــووزن
بــوو بــە قاڵــەی دەم گاڵــەی درۆزن
شـــەریـــف پـــەلاس بـــۆ تـــەوقــات
وەختە دەست بکـەیـن بە تۆقات لێدان



کەوتووینە دەورێ هەر چی بۆی بلوێ
دەستی چەوری خۆی بە خەڵکا ئەسوێ
وتی: فلانی وابووم بە کەباب
خوشکتیان دیوە چۆتە جێی خراپ
وتی: برادەر ئەمە بوختانە
وتی: منداڵی ئێمە دیویانە
مەلا وەعزی دا کە ڕووەو کابە
میز کردن کفرە هێجگار خراپە
کە چی خۆی ڕووەو قیبلە بە پێوە
میزی کرد چاویان لێبوو لە دێوە!
وتیان وەعزی خۆت لە بیر نەماوە
وتی: من سەریم بۆ وەرگێڕاوە
عاشووراغا بوو لەگەڵ ئاسێخان
کە لە سەر تەختە هەڵیان ئەپەڕان
ئێستا ئەوانە بوون بە ڕۆح لە بەر
بەو هەڵپەڕکێیە کار ئەبەنە سەر
ڕۆحێکی گران لە کەسدا نییە
ڕۆح سووکیان ئەوێ ڕۆح قورس بۆچییە
وا خەفتیان دی ئیتر هێجگاریی
زەمین نایمێنێ سوڵتەی بێداریی
ئەگەر نەمردین هەتا بەهار دێ
بۆ دەستەی ئێمە کورتان لە شار دێ
بەو کورتانەوە ئەچنە بەغدا
هەروا دێتەوە هەوسار بەرەڵدا



پەڵە، وەک پەڵ دای لە سەرو گوێلاک
دارو خەڵووزمان لێ بوو بە تریاک
باران رەحمەتەو خەڵک لێی رادەکا
خۆ رۆژەوانیش بەرد بە با دەکا
مەزلووم جوێن ئەداو گوناى بارامە
رەمەزان بە جەنگەو سەفەر بەدنامە
بە نەوتی قیرتاو سەوز ئەبێ شاوریی
خەتای بارانە کە زۆر دەباریی
خەڵک لە مالی خۆی رۆژوو ناگرێ
سۆفی گوناهی حکومەت ئەگرێ
بێ نەواییە شەڕی گوێ کوانوو
بادار نانی خۆی کردە بیانوو
چەتە، کە کزبوو نوێژکەرەو چاکە
گورگ کەڵبەی نەشکێ چاوەڕێی لاکە
رەمەزان سێ تەونی لێ گرتووینەدار
حەوت ترنگیلیو خومارو قومار
ئەڵێن فلان بەگ خۆی بەرۆژووە
دوای خۆی بڕوانێ کە کێی لە دوورە
بە تەنها گوڵێ بەهارمان نایە
هەر مێزێ بگری کولێرەی تیایە



تــۆ تــەنهــا نانــت لــە (منّــان) بــوێ
لــە (دون) ان، دوو نــان ســنانى ئــەوێ
بــەخــشین عیــزەتــەو داوا، داوى عــار
دوایــیش داواكــەى بیــێ، داوى عــار
هـەر عیلمـە داواى بكـەى عـەیـب نییـە
چـاو بـەرەو ژێریـى لـەززەتى چییـە؟
كـە چـاو ببڕیتـە دەسـتندەى خـەڵكى
ئەكـەویـە ژێـر بـار دیـارە بـێ كـەڵكى
ئــەوى دوژمنـــەو بـــە زمـــان دۆســـتە
(الخنـــاس)ێكـــە ئـــادەمـــى پۆســـتە
نزیـــك نـــادانى مـــەغـــرور مـــەكـــەوە
هـەر كـەسێ پیـاو بێ ئـەو قینى لـەوە!
تـا بـە چـاوى خـۆت چـشتێ نـەبینى
ڕاســـتى مـــەزانـــە، علمـــەلیـــەقـــینى
چونكـــە دەور دەورى درۆو بوختانـــە
ڕاســـتى مـــەزانـــە، درۆ هـــەرزانـــە!
ئـەوى لـە خـەڵكا بـە عـەیبى ئـەگرى
كـە لـە خۆتـا دیـت شـاد مـەبـە، بگـرى
لـە قـسەى خـەڵكا زوو هـەڵ مـەدەرێ
ڕەوایـــە ئـــەگـــەر بتكـــەنـــە دەرێ
هـــەڵــكردت بێتــە ســەر نــانێكى جــۆ
زینـــهار لـــەماڵـــى ڕژد نـــانى مـــەخــۆ
هـــەزا دۆســـتت بـــێ هێـــشتاكوو كـــەمـــە
تـــەنهـــا دوژمنـــێ زۆر زۆر ســـتەمـــە

هەر چەند کە سەفەر سەنگی محەکە
ئەوی نایناسی هاورێیە مەکە

کەمت لە زۆری خەڵکی چاکترە
گۆشتی چۆلەکە لە داڵ پاکترە

لە دڵی خۆیشتا، خۆت هەڵ مەکێشە
لە خودپەسەندیی دۆستت دڵرێشە

نادان سەد جاری هەڵگێڕیتەوە
دیسان هەر لەفزی خۆی ئەگرێتەوە

مێشەسەگانە کە سەگ مەگەسە
وەریشی گێڕی هەروا ناکەسە

بۆ (فرۆ)ش بزنی خەڵکی مەدۆشە
شیری تۆ بەرن چهند لات ناخۆشە

هەر چی چاکەی کرد، چاکەی دێتە ڕێ
درەخت بنێژی دیارە بەر دەگرێ



ئەگەر تۆ باوکی خۆتت خۆش ئەوێ
جوێن مەدە، نە وەک جوێنی بەرکەوێ
کە ئێشی دەرزیت بێتەوە بەر چاو
سووژن بە خەلکا ناکەی ناحساو

مردوو کە شەیتان یەخەی بەرداوە
هەر چی جنێوی پێدا بەدناوە
نوێژ بە قەزا بوو دەگێرێتەوە
سوحبەتی یاران، چوو، دەبرێتەوە

ئەوی حەق ناسەو بە حەق رازییە
چ ئیحتیاجی بە شاو قازییە
زریی زانیت کە کردە بەرت
تاجی ئەدەبیش بنێرە سەرت

دڵ ئاوێتە بێ رووناک ئەنوێنێ
ئاگاداری بە ژەنگ هەڵئەهێنێ
لە ئاهو نزانی مەزلووم بترسە
ئاهی چەند ماڵی رووخاند، بپرسە

لەوە بترسە لە خوا ناترسێ
دەم مەنێرە دەم ئەبلەو ناکەسێ
بزانە گەوهەر چۆن بە بەرد ئەشکێ
مەرکەبی رەش پێتا ئەلکێ



دە پــەنــدەو یــەکــی دە دینــار دێنــێ
دیــاری (ژیــان)ە خــەڵــکی بیخوێنــێ
لەگەڵ خــودادا ســەر ڕاسـت بی چاکـە
هــیچ لــەو گــوم نابــێ خراپــەو چاکـە
لــەگــەڵ خــەڵــکیدا ئینــساف بنوێنــە
هــەتــا دەتــوانی نــەفــست بــشکێنە
بـۆ هـەژار دڵـسۆز بـۆ گـەورە حورمـەت
بۆ لە خۆت خوارتر لوتف و شـەفـەقـەت
بۆ دۆست ڕابەر بە بـۆ دوژمـن بـە حیلم
بـە تـەوازوع بـە لـەگـەڵ ئـەهلـی عـیلم
لەگەڵ جاهیـلدا بـێ دەنـگ‌و خـامۆش
ئەم دە پەنـدەی مـن نـەکـەی فـەرامـۆش
کلیلــی گــەنجــی پــەنــد دیانــەتــە
دیـن نـەبـێ پـەنـدت لـە لا زەحمـەتـە



شوهرەت ئافەتەو شوهرەت فەرەنگیی
زۆر بلێ نەگبەت، عیززەت بێ دەنگیی
تێ هەڵچوو دائیم سەر لا بەلایە
گۆشەگیر هەرگیز کێشی بەرنایە
سەر خۆش بە، بەلام دەنگت دەرنەیە
دلت گەرم بێو کزەت لێ نەیە
بەوە دڵخوش بە کە لێت بپچرن
نەک پارەت بەنێو مەردیت بکرن
تا تاڵو سوێری دنیا نەچێژیی
هەر چیت هاتە دەم ئەوە ئەبێژیی
بە قال کراوی کە هاتیە کایە
گوێزت لێ بارکەن خرەت لێ نایە
ئەگەر رەفیقت کەوت دەستی بگرە
هەر چی بێ ئەویش ئەوەی لە فکرە
بەلام بۆرە پیاو بە هیچ نازانێ
قەدری مەگرە، بە لەتە نانێ
هەندێ کەوتوونە سەودای مەبعووسی
زۆریان هەوڵدا خودا نەینووسی
ئەم جارە نۆرەی تازە قەڵدایە
بگرەو بەردەیە هەوڵو هەڵدایە
خەڵک وا دەزانن بە دەست ئێرەیە
هەر ئەو خەرمانەو هەر ئەو گێرەیە
گای بنە وەک گای ژێر زەمین بەندە
بە ئێمە ناڵێن: کەرت بە چەندە
باز هەڵدەن (مەبعووس) پێی بێتە کایە
بەلام باز چاوی لە گۆشتی گایە



قەدری خۆت زیاد کە بە قەدرزانیی
خۆت نەبێ هیچ کەس بە سووک نەڕوانیی
وەک گلێنەی چاو عالەم دەبینێ
تەنها وجودی خۆی لا نانوێنێ
هەر چەند دەور دەوری خۆ هەلکێشانە
خۆ هەلکێشان وەک سنگ هەلکێشانە
لای هەندێ جنێو ئەدەبیاتە
هەندێ بە خەیار ئەڵێن: زەلاتە
هەندێ کە پیاو کەوت پێی ئەڵێن کەرە
هەتاوە ڕووی کار ئەڵێن جەوهەرە
قەترەی حەیایان لە لا تکاوە
ڕووبەڕوو شەرمیان لە لا نەماوە
ئەگەر ئەمانە وا نەبوونایە
بە چاکیی بۆمان ئەهاتنە کایە
تۆ لەو کەسانە هەمیشە دوور بە
لە کونجی خۆتا، هەڵکەو ڕوو سوور بە
نەسیحەتێکیان کردووین زۆر چاکە
ئەڵێن خاکیی بە، ئاسڵت لە خاکە
گەر بۆ کەڵکی خۆت گەورەییت بوێ
بڵێ: خانووێک، ئەکەم، بۆ شەوێ
گەورە ئەوەتە کە چاکەی عام بێ
نەک ئەورو پشتی خۆی لێ بە کام بێ
چەند خۆشە ئینسان خەیاڵپەروەر بێ
بە خەیاڵ بەرگی شاهیی لە بەر بێ

هەر چی ئەیناسێ بیکا بە مەئموور
خزمانی شادکا چ نزیک چ دوور

مادام خەیاڵە لە ڕەنج بەدەرە
خورمای بێ ناوک خۆ چەوەندەرە

ئەوی تۆ ئەمڕۆ ئەی بینی بە چاو
سبەینێ لە لات خەیاڵێکە خاو

وا بزانە کە تۆیش مەبعووسی بووی پار
خاوەن کەش و فش ئۆتۆمۆبیل سوار

خۆ ئێستا هەموو لێک ڕاست بوونەوە
تەنها تۆ دەنووی بە پشتێنەوە

فەرزکە ئەم جارەیش ئەچەسپێتەوە
بە هێلم پێوە ئەلکێتەوە

نە مێوت هەیە بۆ کەس نە هەنگوین
مەگەر چزووی خۆت بکەی بە پەرژین

ئای جاران یاسین (صلی الله) هووی بوو
ئێستا نایخوێنن مەگەر بۆ مردوو

هەرچی جیکمەتی ئەمە بزانێ
ئەبێ بە (ئاسف) بۆ سلێمانێ

تۆیش سلێمانیت های سلێمانی
یای نیسبەتت بوو بە یای نیسیایی



شـێره بـەفرینـەیـش وا توایـەوه
بـۆ ئۆتۆمۆبیـل ڕێ کرایـەوه
زۆر کـەس بـۆ بـەفـر چاویـان ڕشـتووه
زۆریـش لـه هیـوا دەسـتیان شـشتووه
کـوێر تـاکوو دەمـرێ بـه هیـوای چاوه
لیـستەی یـا نـسیب زۆری نـەمـاوه
دیم بووکیـان هێنـا بـۆ مالـی زاوا
لـه سـەر مـارەیـی بردیانـه دواوه
سالـێک مـەبعووسـێ ڕەئیـی بـۆ درا
کـه چـی یـەکێکـی تـر داخـل کـرا
نیـسیبو قـسمەت علمـی غـەیبیـه
ئەسـوەده ئـەحمـەر چابووک دەستیه
ئیمسال مـەبعووسـی ئێنجـەی پـەنهانـه
علمـی غـەیـب زانـین لایـق پـەریانـه
یـەکـێ شـەمالـەی بـۆ ئـەگرێتـەوه
یـەکـێ دانـوو لـه ئـەبـەشـێتەوه
بـه زینـده خـەوی پـرو پیرێـژن
زۆر کەس به سـەیـران بۆ بـەغـدا ئـەچن
وتیـان: تـۆ بنـوو، بیبینـه بـه خـەو
وتی: لـه تـاوان خـەوم نیـه شـەو
خـوا لـه مـەجنوونی پرسـی سـەوداسـەر
عیبـادەتی چیـت هێنایـه مـەحـشەر؟
وتی: هێنـد عـەشـقی لایـلام لـه لا بـوو
لەکـوێ هۆشـم لای خـوای تـەعالا بـوو

لــــه ئــــادەمـــــەوە تـــا ئــــەم زەمانــــە
ڕێگــای خێــرو شــەڕ بــە دەســت ژنانــە
کۆنـــــە دەماخــــــان هــــەروا نــــادانن
هــیچ قــەدری جنــسی لــەتیــف نـازانن



ئــەلفـــی مـــرادت فـــرێدا، مـــەردی
شــوێن مـراد کـەوتــێ، بـۆ درەم مـردی
ڕۆژوو نمـــازت کـــە بـــۆ نیـــاز بـــێ
وەک عاشـقێکی کـە پیشەی گـاز بـێ
نـــــوێژی زۆر، پیـــــشەی پیرێژنانـــــە
ڕۆژویـش ئـەسـڵەکـەی بـۆ ڕەمـەزانـە
ســیاحەتی حـــەج ســـەیـری جیهانـــە
ئـەوی بـە کـار بـێ بـەخـشینی نانـە
کابـــە بناغـــەی برایمـــی خـــەلیلـــە
دڵ نـــەزەرگـــاهی ڕەبـــبی جـــەلیلـــە
دڵ دەشـــکێنیو دەچـــی بـــۆ کایـــە
مـەچۆ، مـەزالـیم لـە سـەر خـۆت لابـە
مـــن زیـــارەتی کابـــەم کـــرد بـــەلام
زیـــــــارەتی دڵ پێـــــــشترە لـــــــە لام
لـــە دەشـــتی مینـــا قوربـــانی دەکـــەی
بـۆ گـورگو چـەقـەڵ دیـاری دەبـەی
لێـرەی سـەربـڕیو بیـدەی بـە برسـی
دەبێـــت بـــە قـــەلای ئایـــەتولکرسی
دەزانی کـــــەوا دنیـــــا فانییـــــە
وای دەگـری تـا سـەر زینـدەگانییـە
ئـەگـەر تـۆ تـا سـەر هـەر بژیایتایـە
ئـەشـیا بـۆ دوای تـۆ جیگـا نـەمایـە
وەک پێش تۆ جێگای خـۆی داوە بـە تـۆ
تۆیش جێی خـۆت بـدە بـە یـەکـێو بـڕۆ

ئەگەر پێ داگری و بڵێی من نارۆم
تۆیش وەک یارۆکان دەهاونە بن گۆم

گا لە سەر پشتی ماسی دانرێ
ترە کەڵەکێ دیارە سەر ناگرێ



گەرمتر لە تین، کەنارو بۆسە
ساردتر لە تەرزە دڵی مەئیووسە
زۆر دڵ مەدەرە مەسنەدی دنیا
تا سەر نەدراوە بە تۆ بە تەنیا
نەخوازەڵڵا وا بە مەنسووبی بێ
شەرتی ئیستیحقاق نامەحسووبی بێ
لەگەڵ قابینە پێویست بوو گۆڕرا
هەر وەک (ڕیدینکۆت) مەنسووب داکەنرا
ئەوسا هەناسەی سارد وەک ڕەشەبا
نامەی ئومێدت بە بادا ئەبا
خوا دایتێ ئەهلی عیلمت پێ بڵێن
بە چرای (گەرچەک) لە دووت ئەگەڕێن
ئەگەر کەم خۆری دایبم خۆر ئەبی
(ئینتەلا) ناکەی خاوەن زۆر ئەبی
خۆ ئەگەر چاوت لە دمبەی چەور بێ
ڕۆژێ دێ سزات بە کلکە تەور بێ
بەهار هات دیسان دیجلە لێی ئەترسێ
قەسری نزیک ئاو خەڵک لێی ئەترسێ
با وجود دیجلە زنجیر کراوە
ئەو هێزو گوڕەی بەرووی نەماوە
بەلام تۆ نابێ لە ئاو ئەمین بی
تۆفان لە یادە، دەبێ تێبین بێ
بەمانە ئەڵێن: واتەی بێهوودە
غەیرەز خواستی خوا هەموو بێسوودە

خوا بێ قەزای کا خوایش کردەی وایە
ئەوەی ئەو دەیکا بە عەقلا نایە

تەلیسمی جامی چل کلیل دەرکەوت
کەر ئێسقانو سەگ کای کۆنەی بەرکەوت



خـوا ڕەوای بـینی وا كلـك هـەڵـگیرا
داپیرمـــان خنكانــد لــە بــیری شــیرا
مـادام لـەكـەی كلـك نـەمـا لـە نـاوا
عــەداڵــەتێكــی شــەرعیمــان مــاوە
شـەرع هـەمـوو كارمـان بـۆ دەبڕێتـەوە
(كـە مـانیع هـەڵسا مـەمنـوع دێتـەوە)
ئێستا هـەر كـەسێ بچێتەوە جێی خـۆی
لجنــەی انزیبــات حــوكم بـدا بـۆی
مەلای مـەزبـوورە كـە چوبـوە نـاو گـۆڕ
گـۆڕەشــاری دا میــسلی ئێــسری تـۆڕ
پرســـیان چۆنــــە ئـــەوەو دنیایـــە
وتی: ئـاخ ئـەویـش قـەتـارچی تیایـە
بـەخـوا ئـەگـەر تـۆ عـاڵو سـاڵ ئـەبی
لــە هــەر دوو دنیـا بـێ سـوئاڵ ئـەبی
بــەڵام دنیــەی چــەور بـێ بــەلا نییــە
شـوێن چــەتـە كـەوتـن بـۆ تالانییـە
تــەماتــە ماســی بگــریو تــەڕ نــەبی
قوماربـــازیش بـــێو ئاخرشـــەڕ نـــەبی
شـــترمرغ ئــــەڵـــێن وەرە هــــەڵـــفڕە
ئــــەڵـــێ: نـــابینی ملـــم وشــــترە!
ئـەڵـێن بـار بـەرە ئـەڵـێ: باڵــدارم
تــەنهــا بـۆ خــواردن ئـازاو بــە كـارم



بووکــە بارانـــێ کـــەوتـــە کۆلانـــان
خۆی کـردووە بـە بـووک تنۆکی بـاران
دەغلودان مل‌کەچ، عەلـلاف بە دەماخ
هـەژار وشـکەڕۆ، دەولـەمـەنـد چـالاخ
ســەیرانگــا جێگــای نــوێژی بارانـــە
جۆشـــی گریـــانو فرمێـــسک بارانـــە
خـەتیـب فـەرموویـە کـە دیـن نـەمـاوە
غـــەزەبی خوامـــان وا لـــێ گـــیراوە
هەڵپەڕکێو سـەیران کـە کـەوتـە شـارێ
لـە بـاتی ڕەحمـەت غـەزەب دەبـارێ
ســەیرانکـــەر مـــنمو واعیـــزیش ئـــەوە
لێـــک ناکرێتـــەوە ئـــەم ڕۆژو شـــەوە
بـۆچ تـەنهـا ئێمـە بـێ بـاران مـاوین
کـــە وا فـــەرمـــانی کفریـــان داویـــن
یـا ڕزقـی ئوممـەت هـەر بـە بارانـە
کـــە وابـــێ تـــەنهـــا بـــاران خوامانـــە
کەس ئەو بێ، کەسە کە لە بێ‌کەسە
نـەهـری هـەڵـقولاند بـۆ ئێمـە بـەسـە
ئـەگـەر خـوا ڕزقـی بـە نـوێژ بدایـە
ئـەشـیا غـەیـرە دیـن نـانی نـەبوایـە
نـە ڕزق بـە دینـەو نـە مـاڵ بـە زانـست
ئارەزووی خوایەو ڕۆژی ڕۆی (ئەلەست)
زۆر کـــەس مـــەعاشـــی زۆری دیتـــەڕێ
هاتـــە وەرگـــرتن ڕێـــی لـــێ دەگـــۆڕێ

لای چـاوی سـاغی بـۆی ئـەژمێـرن
دز بـۆ لای چـاوی کـوێری ئـەنێـرن

کـەوەکـە وتی بـە بـازی ئـەحمـەق
نـەینێنـە تـەبـەق مـەیێـژە سـەدەق



ئینسان لە نیسیان دروست کراوە
پەردەی غەفلەتی پێ داکێشراوە
بۆیە کە هاتە سەر کورسی مەسنەد
وا دەزانێ قەد، ناجوولێ ئەبەد
کە یەکێ دەبەێن بۆ گردی سەیوان
لەوێ دەست ئەکەین بەشین و گریان
کە گۆرخانەمان لە پێش چاو گوم بوو
بە هەتاسەیێک مەرگمان لەبیر چوو
باشە با بڵێن لە مەرگ ناترسین
لە دڵ ئازاری بۆچی نەپرسین
ئەوانەی ئەمڕۆ بە دوومانەوەن
لەگەڵ لێکەوتین غەیبەت گێڕەوەن
پیاو ئەو پیاوەیە بە چاکە پیاو بێ
نەک بە وەزیفە ناوی بە ناو بێ
هەی وامان هەیە گەیە ئاسمان
کە هاتە خوارێ کەوتە بەر زمان
ئێستا ئەوانەی کە دەڵێن ئەزم
بە چێوی دیوان وا هەڵدەبەزم
کە بەرگی کاریان نەما لەبەردا
کەس و کار پێیان ئەنێن بەسەردا



لەوە بترسە لە خوا ناترسێ
لە حەقی دۆستو ویجدان ناپرسێ
وا زێ ئەكەوێ بەد پەسند ئەبێ
بەلام دوایی كار تووشی بەند ئەبێ
كەسێ بە بەدكار ناوی نەزڕێ
ئاگری دز تەنها سالێ ئەگرێ
بەدكار دوو نەوعە یەكێ نەزانە
مەڕوانە ئەوە، عەقڵ میوانە
نەوعێكی تریان سروشتی بدە
ئەوەیان سزای بە داری حەدە
پیاو خراب نەبێ چاك دەر ناكەوێ
تا تاریك نەبێ كێ چرای ئەوێ
بەخشین هونەرو وەرگرتن نەنگە
چاو برسێتییە سەرمایەی جەنگە
ئەوی لای خۆشە تۆ نانی بخۆی
دڵی مەشكێنەو بیخۆ ئەگەر خۆی
ئەگەر دەزانی بە خواستن زویرە
داوای لێ مەكە ئەگەر وەزیرە
ئەگەر نان بدەی لە ماڵ ناترسی
لە هەموو ماڵێ دەخۆی ناپرسی
بەرماڵی دەرماڵ هەردوو وەك یەكن
كە عالم نەبن كەلوڕو لەكن
لە تەنگانەدا خودا ئەناسی
كەوتیە فەرەحی دیسان بلباسی

مــار کـــە زۆری خـــوارد دەئاڵـــێتە دار
بـــەوە ئـــەزمـــەبـــێو دەبـــێ ڕســـتگار

سۆفیش کـە مالـی حـەرام زۆر ئـەخـوا
بـە نـــوێژو تـــەزبـــیح گونـــاهی ئـــەڕوا



ئـــەوەتی دنیـــا ئـــەڵـــێن دنیایـــە
ئیعتیقـــاداتی غـــەریـــبی تیایـــە
گاهـــێ گـــوێرەکـــەی بـــەنی ئیـــسرائیل
بـــۆ قـــەومـــی موســـا ئـــەبێتـــە دەلیـــل
گـــاهی کـــەرەکـــەی عـــوزێر لـــە پێـــشە
گـــا، لاتو عـــوززا ئـــابین و کێـــشە
گـــا ئـــەتاشـــکەدەی زەردەشـــت ئـــەگـــرێ
گاهـــێ ژۆپیتـــەر بـــە بـــاڵ ئـــەفـــڕێ
ئـــەمانـــە هـــەمـــوو ئـــەفـــسانەی کۆنـــە
لـــەم خـــەرافاتـــە ناپرســـن چۆنـــە
تـــەنها ئـــایینی شـــوومی گـــورگی بـــۆز
خـــەریکـــە کلکـــی ئـــەکـــەویتـــە تـــۆز
نـــازانن، ئێـــرە بێـــشەی شـــێرانە
گورگ بۆز بێ، ڕەش بێ بۆ تـێهـەڵدانە
ئـــەفـــسانەی شـــەڕی ڕۆســـتەم عـــەنتـــەر
دەوەن بـــە ئاشـــە وا کـــەوتـــەوە گـــەڕ
لـــە هـــەمـــوو خـــاکی عێراقـــا بـــاوە
کـــە ئـــەڵـــێن ڕۆســـتەم عـــەنتـــەری گـــاوە
ئـــەم هـــەتیـــو بازیـــە لـــەوەوە داهـــات
بۆیـــە لـــە ئێـــران بـــووە بـــە بنیـــات



خـەیاڵـێكی وا، هـاتوە بـە سـەرما
لـە عالـەم پرسـم بـۆ گـەرماو سـەرما
بـزانم ئـاخۆ لـەم دوانـە كامیـان
چاكـەی زۆرتـرە بـۆ نـەوعـی ئینسان
ئەیزانم فیكری دوو كەس یەك ناگرێ
وا چاكـە بـابی فـەتـوا داخـرێ
ئـەوی قـەڵـوەو دڵـی پـڕ جۆشـە
دیارە كـە دەڵـێ، هـەر سـەرما خۆشـە
ئـەوی كـە لـەڕەو بـێ هێـزو تینـە
ئـەڵـێ سـەد شـكور كـە وا هاوینـە
پاڵـتۆی فـەردەیـی‌و قۆنـدەرەی پۆسـتاڵ
لە كۆڵمان كـەوتن بووبووینە حـەمماڵ
ئەتـوانین لـە دەشـت بێ لێفەو سـەریـن
بـە سـەر ئـازادی شـەو بـەسـەر بـەریـن
بـەلام دووپـشكو مـار پـەیـدا بـووە
قـەیناكـا پیـشەی سـاڵانی زووە
هـاوین هـیچ نـەبـێ بامیـەو باینجـان
لـەگـەڵ تـەماتـە زۆرە بـۆ لێنـان
هـەنـدێكمان هـەیـە كـە باینجـانین
هـەنـدێكی‌تـریش غـەریـب سـنجانین
هەمەدان جێگـەی غـەریـب سنجان بـوو
زۆر كـەسـی ئێمـەی پـێ ماڵویـران بـوو
دەردی هـەمـەدان كـەوتـە دەرگـەزیـن
مونـەووەران بـوون بـە مـەلا بـەزیـن

کەس لە سەر حاڵی پێشوو نەماوە
سوێندی درۆمان بە شەرف باوە
ڕەحمەت لەو کەسەی کە جنێو ئەدا
ئەڵێ: هەی ئەشراف لاچۆ تووخودا
لافاو سیروانی لێڵ کرد بە یەکجار
ماسی زل کوێر بوون کەوتنە کەنار
دەردەگایش زۆرەو کوللە لە ناوە
تەرزەیش کوتاینی هیچمان نەماوە
خوا بکا ئافەتی ئەشرافمان نەبێ
زموستان شەبێ، زو پیران تەبێ
قەی ناکا مەعاش لە جێی خۆیەتی
گوڵ بە دوو بەهار ڕەنگو بۆیەتی
بە ئیعتیادیو فەوقولعادە
دوو بەهارین (دەی) ساقی سابادە



کە لەگەڵ بەددا دانیشیو هەستی
پشت بە خراپەی چاکان ئەبەستی
تۆ دەڵێی چی بکەم قسەیان خۆشە
نەتیجەی قسەی گاڵتەو گەپ بۆشە
پیاوێ زەرەری لە خەڵکی دابێ
دڵی ناسرەوێ هەتاکوو مابێ
ناپیاویش هەبێ لە لاتی چاکە
کردەوەی بەدەو هێشتا بێباکە
خووی بەد وەک میقرۆب حیسەی ئیرسییە
دەوران بەدخوایەو پیاوچاک برسییە
بەلام ئاگری دز ساتێ ئەگرێ
کە دەورەیاندا هێلێکی دەبڕێ
ئەمە کاری کۆنە کە بە بای دەکەین
تەسەللای هەندێ خەڵکی پێ ئەدەین
ئەگینا ئێستا دەوران دەورانە
بۆ چلۆ چۆکەر ڕۆژی مەیدانە
یەکێ بە درۆ یەکێ چاوەڕاو
یەکێ بە ئاغام، پاشام هاتە ناو
مادام نیایەو ئەمانەی تیایە
پیاوی دنیایی لە بەرەودایە
ئەوی ناسرابێ بە عیلمو ئەخلاق
ئەبێ بچێتە جەزیرەی واقواق
ڕۆنو برنجو گۆشتمان گرانە
تەنها هەڵبەستی «ژورنال هەرزانە»[1]

---

١. ژورنال: مەبەست لە رۆژنامەیەو مەبەستیش لە پرۆگاندەی بێ ئەسل و ئەساسی رۆژنامەکانە.

جورئــــەت بـــۆ ڕۆژی گرفتارییـــــە
نــەتیجــەی فیــشاڵ شــەرمــەزارییــە
گەر تۆ خەریک بی خەڵکی بشکێنی
تــۆیش لــە حورمــەتی خۆتــا نــامێنی
گەورە ئەوەیە خەڵک گەورەی بگرێ
نە وەک وەک دۆوک تەنها خۆی بخورێ
ئەگەر لە بەدیی دڵت پاک نەبێ
گلەیی مەکە کارت چاک نەبێ
ئــــەوی بـــە گونـــاە زرێ دەپۆشـــێ
دوعــا نایبــڕێ ســەد شــێخ تێکۆشــێ
(کاک ئەحمەد) دوعای بۆ باجگر دەکرد
ئەیگوت: بمێنێ نەمرێ دەست و برد
نــەک یــەکێکــیتــر لــە موسوڵــمانان
وەک ئەو ڕێگر بێو دەرچێ لە ئیمان
بە بمۆمبا ماسیی دەکەوتە سەر ئاو
ئێستا عەمەلەی ئەشغال کەوتە ناو
بـــە کرێکـــاری بـــەڕێـــوەدەچـــوو
هــەروا بزانــە جــەرئــە پــەیدا بــوو
ئەڵێن: تەبەقی پڕ ئاشتیی ماڵە
ڕاست ئەکەن ئەمە زۆر جەسبوڵحاڵە
سواڵــکەر پێـــشرەوی ســـوپایی بکـــا
ئــۆردووی جــەنگیـزی لــە بــەر ڕادەکـا
کــە لــە هێلانــەی بێچــوە چۆلــەکــە
مــارێ پێــوەدای گلــەیــی مــەکـــە
هەر کەس عەقلی خۆی لە لا پەسندە
فائیــدەی نیــە ئــەم بــەنــدو پــەنــدە



دەستەی تیاترۆی بە عیشوەو زۆران
گەیشتە سەرمان فەسڵی باینجان
دەنگی دوومەڵەک کە گەیشتە گۆش
سەودای سەرو دڵ تێکڕا دێتە جۆش
شەوقی کارەباو بۆیەی سپی‌و سوور
بە شەو پشیلە دەکا بە سموور
ئێمە نەزەرمان هەروا کەچ بینە
ڕەنگی سنعیمان لە لا شیرینە
بە دوو فیشاڵی لا پف هەڵدراو
ناڵە پێ‌پانمان لا دەبێ بە پیاو
جاران بە تەقەی دەمانچە پیاو بوون
بە دزە کوشتن بە ناوو داو بوون
ئێستا بە تەقەی زبان ناودارن
تەنها بۆ نەفعی خۆیان بە کارن
پیشەی پێشوویشمان لێ دەژێتەوە
ئاغایی لە نوێ ئەگەڕێتەوە
خوا کێو ئەبینێ‌و بەفری تێ‌دەکا
ئەوە بەدنامە قسەی لێ دەکا
ئەڵێن خشت هاوێژ پاداشی سەنگە
بۆ واتەی گاڵتە قەسدی کوشت نەنگە
بەلام خوویکی گرتمان بە شیریی
ناتوانین تەرکی بکەین بە پیریی
مەگەر ئەو خوایەی کە حاڵ ئەگۆڕێ
جەهلمان لەگەڵ نەخاتە گۆڕێ
خۆ من قەڵەم‌و زمانم سوا
هیچم پێ نەکراوە خستمە دەست خوا



شـــاریٚ ئـــاویٚکی خـــەرەویتیـــان بـــوو
ئەیانخواردەوە عـەقڵیان تێک ئەچوو
یـــەکـــیٚ لـــە لاوە هاتـــە نـــاو ئـــەوان
بـــەشـــێتیان زانی کـــەوتـــە بـــەر زبـــان
هیچ کـەس لـە عـەقڵی ئەو ڕەزا نەبوو
لێک کەوتنە ڕوو مابەینیان تێک چوو
دوایـــی کـــە زانی تـــەنهـــا مایـــەوە
ئـــاوی خـــواردەوەو کـــەوتـــە کایـــەوە
بـە (ورپاطلاسـون) بـە (چـال اونیاسـون)
خۆشـیان ڕابـوارد ئـەوانـیش وەک مـن
بـەلام مــن بـە بــیٚ ئـەوە دەبـەنگـم
قـەلـەنـدەریٚکـی بـیٚ نـامو نـەنگـم
ئەوەنئە هـەیە یـەک ڕوو یـەک دڵـم
لـــەمـــەتانـــەدا پـــەروەردەی گـــڵم
هـەنـدیٚکی وا هـەن هـەسانی مـەککـەن
سـەمـا بـە دڵـی بزورگـان ئـەکـەن
بـە مێچکـە مێچکـە پـیٚ ئـەلێـسنەوە
کـە هـەڵ خلیـسکا خـۆ ئـەکێشنەوە
ئـەمـە تـەجـرەبـەی ئـەوەنـدە ساڵـە
هـەر چـی بـاوەڕیـان پـیٚ بکـا منداڵـە
بـا وجـود ئیٚـستا منـداڵ پـەسـندە
کـەس بـە پیر ناڵـیٚ کـەرت بـە چەنـدە
پـیر قـران داهـات، تـو خـوا بـا بمـرن
خـووی چـلوچۆیی ئـەم دەورە نـەگـرن



ئـەوانـەی دوڵـەت بـە هـیچ نـاگرن
بـە مـەردی تـرِی دنیـا دەبـرِن
وا بزانـە هـەزار فـەردە توتنـت بـوو
ئـاورت دایـەو ئـاگری تـێ بـەربـوو
هـەر تـووتن نیـە ئـەو کـلۆکۆیە
دوو بەشـی قرچەی ناو جەرگـی تۆیـە
ئـەگـەر دەر ئـەزەل هیچـت نـەبوایـە
ئـەتگـوت بـە نـەبـوون هـیچم لـێ نایـە
بەڵام تـۆ پارەی بـەغدات لـە سـەر بـێ
لێرەیش تو تنەکەت ئاگری تێ بەربێ
ئینجـا بروانـە ئـاگری دەروونـت
رەنـج بـە خـەساریی‌و دەردی نـەبوونـت
دوژمنـیش دەڵـێ: دە بـرِۆ گـۆرِت بـێ
کـە بـروا بـۆچی ماڵـی زۆرت بـێ
من سەربـەست ئـەژیم رەنـدو قـەڵـەنـدەر
سەودای مەبعووسیم بۆچ کـەوێتـە سـەر
ئەویش چەند رۆژێ سەهەرەو سەیارە
بە قسخی!! بەغدات لە دوور لێ دیارە
تـووتن سـووتانو وەرگـەرِان یـەکـە
حـەز لـەحـەمـامی زەواجـل مـەکـە
کـە بـۆ کـەوتـن بـێ بـلند بوونـەوە
مـەفـرە بـە هـەوای بـەرزییـەک شـەوە



قـەت نوقلانـەی بـەد لـە دەسـتت مـەدە
بـــەدی هـــاتنی لـــە ســـەدا ســـەدە
کـە تـۆ بـە یـەکـێ بـڵێی ئـاخر شـەڕ
ڕێـی ئـاخر شـەڕی هـەڵـبەت دێتـە بـەر
دوعـــای پیریـــژن بـــۆ ئـــاخر خێریـــی
زوو گـیرا دەبـێ بـە بـەرچـاو تیریـی
چلـەی هاوینـەو چـوار چلـە هـەیـە
نـــازانین چلـــەی ئێمـــە تـــا کـــەیـــە؟
مـــەلای مـــەزبـــوورەو حیـــسابی ڕۆژوو
بەردیشی تێخست باز هەم بەسەرچوو
بـە چلـە بـەفـرو قـیر ئـەتوێتـەوە
سـامی بـاحورایش زوو ئـەبڕێتـەوە
بـۆ (کـل نفـس ذائقـەالمـوت)
تـەفسیری وابوو هـەر پیری بـەرکـەوت
هـەنـدێ لـە بـورجی مـشیدەدان
لـە ئیدراکی مـوت بـێ ساتو سـەودان
کاتێکیـان زانی کـە ئـەیـانێژن
خۆیـشیان ئـەزانـن چاکیـان نـایێژن
بـا ئـەوان بـڕۆن جێگایـان بـۆش بـێ
قـەیناکـا لـەوێ خـوا لێیـان خـۆش بـێ
خـوا کێـو ئـەبینـێ و بـەفـری تـێ ئـەکـا
نـەزان بـێ هـوودە قـسەی لـێ دەکـا
مـن نـازانم چـیم لـەمو لـەو داوە
خـوا ڕەوای بینـێ میـوەم تـەواوە



لەوە بترسە لە خوا ناترسێ
لە خوا نەترسێ لە کەس ناپرسێ

ڕێوی کە هاتو بوو بە فاقەوە
فێڵبازیی دەنێ بە گوێی تاقەوە

دەگەوزێ بە دەم واقەواقەوە
کلکی شۆڕ دەبێ بە لای لاقەوە

شەرع ئەڵێ: «کل مضر یقتل»
بە پارەی میریی بەراز ئەکەن پەل

میری گوێی بەراز بە پارە دەکڕێ
چونکە زەرعاتی خەڵک هەڵئەدڕێ

ئێمە ئەمانە بۆیە ئەنووسین
کە بیگرنە گوێ، بەڵام مەئیووسین

خوویێ کە ئینسان گرتی بە شیریی
لێی نابێتەوە تا ئاخری پیریی

(واریتە) گورگی کرد بە پیاوی مەڕ
بە چاوی خۆم دیم پووشی خستە بەر

ئێمە وا گورگی بۆز ئەپەرستین
نادانی دەستی زانستی پەستین



قـەزا دەسـتێکە پێـنج پـەنجـەی هـەیـە
کـە هاتـە جونبـوش وەک ماکینـەیـە
دوو پەنجەی بۆ چاو دووی تری بۆ گوێ
یـەکێکـیش بـۆ دەم حـوکمی دێتـە جـێ
پشت بە دنیای پوشت مەبەستە زینهار
شـەویکـی بـەس بـوو نـادری نـاودار
گـەورە بـە غـرور دێتـە نوشوسـتی
حەمە پاشای جاف پیاوی خۆی کوشتی
مەحموئاغای سیوەیل ئەو ڕۆژەی کە مرد
نۆکـەر خـوا شـکور ئاغـاڕۆی بـۆ کـرد
تـەرسـی کـەرەکـەی جـەجاڵ خورمایـە
بۆیـە کـە هـەستا خـەڵکی لـەدوایـە
زسـتان نانـەوا هـاوین بـەفـرکێش
بۆیـە ناپرسـێ لـە قـەوەو لـە خـۆیش
ئـەو کـەسـەی ماسـی بگـرێ تـەڕ ئـەبـێ
بێـستانەوانـیش تووشـی شـەڕ ئـەبـێ
بیـستانڕن گـورزی خـۆی دەوەشـێنێ
بـۆ زرکـێ بنکـێ لـەبـن دەردەێنـێ
زۆرم دی چاکەی دەربارەی خەڵک بوو
کـە کـرد جنێویـان پێـدا زوو بـە زوو
دنیا وەک مووی قـول چـەرخـی گـەڕاوە
بـە شـانەشـی کـەی هـەر تێـک ئـالاوە
چەند خۆشە ئینسان پەریزی پاک بێ
لـە چـەنـدوچۆنی دنیـا بـێ بـاک بـێ

ئەسکوێ بێ لە ناو دیزەی دنیادا
کەس نەبێ پەنجەی ئیجلالی بادا
هەر چی وەک سرکە توند بێ و بڕ لە با
بیکەیتە شووشەیش ئاخری شەێ ئەبا
لە هەر ئاشووبێ عەقڵێ وەرگرین
ئەتوانین لە ڕێی بڵند لێ خوڕین
خۆ ئەگەر ژێر پێی یەکتر بتاشین
دەستشمان بگرن هەروا لە پاشین



وا گردبونـــــەوە پـــــایزە براکــــــان
بەڵکوو یەک کەون هیممەتی چاکان
بــەلام وەک ئــاردی نــاو درک وایــە
بــرایش لــەگــەڵ یــەک ناینــە کایــە
خۆولاتیمـــان بـــۆچ لا چـــا نابـــێ
گـوێلکی خۆماڵـی بـۆچ بـە «گـا» نابـێ
مــەڵــێن شــیلاوگ مایــەی پــەنــیرە
فیتنــە هــەوێــنی نــۆ قــازان شــیرە
مەدحی رووبەڕوو پیاو ئەدا بە شوو
زۆر دۆستی سەر نان بە دوژمن دەرچوو
خـوا مووسا بـۆ سـەر فیرعـەون ئـەنێـرێ
کە چی جار جار مەڕ بە گورگ ئەسپێرێ
پیاو بۆ بۆرە پیاو ڕۆحی خۆی سەرف‌کرد
کە چی پێی دەگوت بە دەردی خۆی مرد
ئــەو کانیــەی ئــاوی لــێ دەخوێتــەوە
بـــە نابـــەکـــاری پڕیـــەکـــەینـــەوە
سیاســەت پیــشەی ئاغــای بــێ ڕیــشە
بۆیــە گــەلــێ پیــاو بــێ ڕیــش و ئیــشە
زۆر ڕیـش و سمـێڵ تاشـراو وەک ئـەوان
خۆزگـە ڕیـش ئـەبـوو بـە مـۆدەی ژنـان
ئۆخەی ژنان بوون بە گەورەی گەڕەک
ئـەبـێ دەسـتەی تـر بچنـە بـەر خـەڕەک
ئـەنجـا هـەنـدێکیان چـۆنی دەڕێـسن
لـەگـەڵ گـوێ چـەنـە بـەرزە بڵێـسن

بــە نارنارۆکــە ســەر دەلــەقێــنن
دەم بـۆ پـارووی خـەڵـک دا دەچـەقێـنن
ئــاخ خوێنــدەواری فریامــان کــەوە
بــۆ عالــەم ڕۆژە بــۆ ئێمــە شــەوە؟



لــە تــەئــریخ پرســە کــە ڕابــوردووە
هــەر دانــە بــەردێ جێــی مــەردێ بــووە
تــۆیش بگــەیتــە ســەر ئــەو دانــە بــەردە
شەخسی خۆت لە لا مەردی نەبەردە
بەلام بە خووێـک ئـەکـەویـە خـوارێ
ئـەبـێ بـە پـەنـدی گـشت هـەرزەکـارێ
ئــەتــەوێ دلــت نــەخــەیتــە لــەرزە
مــەچــۆرە ســەر ئــەو دەندووکــە بــەرزە
لـە تـەک کـەسـێکا ئـەوا دانیـشتووی
بـە چـاو ئـەیبیـنیو لـە گـەلـیا ئـەدووی
کە دوور کەوتیەوە لە پێش چاوی ئەو
ئــەو دیــدەنیــەت لا ئــەبــێ بــە خــەو
خۆ ئەگەر ئووری بوو بە مانگ و سال
وەک دیمو نـەدیم ئـەبـێ بـە خـەیـال
ئــەمــە ئــەحوالــی دنیاکــەمانــە
هــەر چــی کــە بتبــێ ئـاخری نــەمانــە
کە چی پێی خەڕۆین ئەلێن تا سەرە
جـا، وەرە لـەگـەل خـەلـکا دەربـەرە
چـەنـد خۆشـە ئینـسان ئـەمـە بزانـێ
هــەر وەک ســینەمــا لــە دوور بــڕوانێ
بــە شــیعرو بــادە غــەم بــدا بــە بــاد
بـــە دنیـــا بـــلێ: بـــڕۆ بـــێ بنیـــاد
هەندێ کەس بە شیعر سەریان ئەئاوسێ
سیــسرک بــۆنی گــول بکــا، ئــەتاســێ

مــر، هــات لاســایی قــازی کــردەوە
هێلکـەی زلی کـرد کـەچـی بـووردەوە

ئێـــستا پـــاییزەو ســـەیـــران بـــوارە
ئـەرخـەوان سـوور بـوو ئـەڵـێن بـەهـارە

قـەومـێ قـەلـەڕەش بکـا بـە پێـشڕەو
ڕۆژی وەک باڵـی قـەل دەبـێ بـە شـەو

مـن خـۆم پـەروەردەی دەهـۆڵو زۆرنـام
لـە ئینجـە سـازیی دنیـا تـەوەلـلام

بەلام هـیچ وەختێ لەگەڵ زەڕەی کـەر
هـەڵـکردم نابـێ بـۆم ناچێتـە سـەر

ئێـستا وا ڕێمـان لـێ بـوو بـە دوو ڕێ
یـەکـێ بـۆ عاممـە، ئـەوی تـر بـۆ کـێ



هەر چی یەک ڕوو بێ‌و یەک زیان و پاک
وەک شمشیر خۆیتی دەبێ بە خۆراک
دوو ڕوو دوو زیان شانە ی سەر سەرە
وەرە لەم قوڕە دەرکە ئەم کەرە
لەم زەمانەدا ڕاستیمان نەدی
خۆمان هەڵگرین بۆ دەورەی مەهدی
ئەوسا گورگ‌و مەڕ تێکڕا ئاو ئەخۆن
ئەمە ئەفسانەی کۆنەی من تۆن!!
گورگ هەتا کەلبەی نەشکێ مەڕ ئەخوا
پیاوی بێکارە ئەڵێ بەد بە خوا
خوا خزمەتکاری قاپی تۆ نیە
کوتەکی دایتێ دوعات بۆ چیە
خوزگە پیاو خراب وەک هەنگ بوایە
لەگەڵ پێوەدان گیانیان دەرچوایە
بەلام لە شفرەی یەکانە ئەکەن
بە قامیش بڕین ددان تیژ ئەکەن
خۆم ئاگام لێیە ڕۆژێ کاک ئەحمەد
دوعای ژینی کرد کرد بۆ پیاوێکی بەد
وتیان باجگرە بۆچی نەمرێ
فەرمووی با کەسی‌تر جێی نەگرێ
پیاو چاک مەمنوونی بەدی بەدکارە
چاک بە کردەوەی بەدا دیارە



چەند خۆشە ئینسان شێوەی شەمعی بێ
خۆی بسووتێنێو نەفعی جەمعی بێ
چەند خۆشە ئینسان خووی چاک بگرێ
ئەوە بگرێتە باوەش کە دەمرێ
چەند خۆشە ئینسان کە بە ڕەنجی شان
کۆی بکاتەوە بۆ ئەرکی میوان
نەک لە مەڕ چەور کا بیدا بە گورگان
خۆی مایەپووچ بێو ڕووزەردی دیوان
هەندێ چی دەست کەوت هەر تێ دەپەستێ
لغاوی شەیتان دەمی دەبەستێ
ئەو پاشەکەوتە بۆ مێردی ژنە
بە زیندوویی خۆی ژن لێی دوژمنە
هەر چی خوارد ئەڵێ: ئاخ نەمخواردایە
ژمارەی سەدەی تەواو بوایە!
کە چوویشە گۆڕێ ئەڵێ: هەی بیداد
من کۆم کردەوە کێ پێی بوو بە شاد
ئەمە دیارە لە پێش چاومانە
کە چی پیشەمان خۆ تەفرەدانە
ماڵی خۆ بە خۆر بۆ چەکمە بۆرە
گەرمە گۆڕ نەبێ پیاو گۆڕبەگۆڕە
ئەمە توانجی بێ دەوڵەتییە
منیش کە بمبێ گوێم لەمە نییە
بێ دەوڵەتییە وا بێکارە بووین
بێ پارەییە پارە پارە بووین
پارەمان نەبێ بە چی دەخوێنین
ئاو نەبێ درەخت بە چی ئەڕوێنین



بــە ڕەمــەزانــان ئــەبـێ بترســی
لــە برســی ڕۆژوو پیـاوی چـاو برسـی
وا برســی ڕۆژوو تــا ئێــوارەیــە
بــەلاَن چاوبرســی دەردە هــارەیــە
هــەنـدێ بـۆ ئـەمـەی بـلێن بـەڕۆژوون
کاتێــک زانی بــە گژتــا هــەلـچوون
خۆ هەندێکیش هەن بە جەژنیش تووڕەن
قــەی ناکــا جــارێ وا تــازە کــوورەن
زۆری پــێ ناچــێ کــە خانیــان ســوا
باویــان نامێنــێ! ئــەکــەونــە دوا
بۆیــە گرانــە تــرێو ناســکەرمــێ
تێتیخــاب کــەوتــە مــانگی ڕەشــەمــێ
خــۆ ئــەگــەر بێتــە شێوەی هــەورامــان
لە دەست کاک ڕەشید یا ڕەبی ئامان
نــەعــرەی دەگاتــە شــیوی ئــابلاخ
نــەقــشی پانتۆلــی ئــەبـێ بــە بــەیداخ
هــەمــوو دەعوایێــک لــە نــەبوونیــە
ئــەم ئــەحوالانــە نــە بــێ تووتنیــە
ئــەلـێن تــەبــەقــی پــڕ ئاشتی مالــە
چــاوی ڕەشــی زۆر هیــوادار، کالــە
مــەڕوانــە ئێــستا هیــوادار زۆرە
ئــاخری وای لــێ دێ ئــەکــەونــە نــۆرە
ئــەو شـایە خۆشـەی کـە کـەم دەوامـە
کـە هـەلـسای لـەخـەو وەک ئیحتیلامـە

خـۆ، ئـەوەی ڕێگـەی چـەسـپین نـەناسـە
وەک (سـوورە خاتـە مـەکـە)ی بـڵباسە
کـــچ پـــارە ناکـــا ئـــەم تـــەقو دەوە
بـــە ســـەر کێـــوەوە نیـــشتەوە ئـــەوە
ئـەو قـەڵـەنـدەرەی کـە بـێ هێوایـە
ســـەیـــری جیهـــانی لا ســـینەمایـــە



بە تورکی پایز کە (سوک بەهار)ە
ئەم ساڵ نموونەی دەرکەوت لەم شارە
چواڵە گوپکەی کرد ئەرخەوان پشکووت
قارچک هەڵتۆقی لە لووتو بزووت
بەڵام ئەو کارگەی زوو سەری دەرکرد
لێرەو لە کەرکووک زۆر کەسی پێ مرد
ئەترسم تارای ئەرخەوان وابێ
خومی جوولەکەی دەوران شێوابێ
خێرا! دەرووی خێرە، خواکردیەوە
دایکی گرانی (ئاڵ) بردیەوە
یاخوا ئەمەمان لێ بگەڕێ بە ڕاست
بۆ شیر داو ئێمەیش تێر بخۆین لە ماست
کە ماست پەیدا بوو نۆرەی پەنیرە
بەدکار هەوێنی نۆ قازان شیرە
ئافەرین لەوەی کە شیری پاکە
شێری مەیدانە لە شێر بێباکە
ئەو دڵەی کە وەک مەنجەڵ ژەنگ دێنێ
شیری تێ مەکە ئەیبزرکێنێ
من تویکڵە شوتیم کرد بە مەرەبا
خەڵک ئەیخاتە ژێر پێی خەڵک ڕەت بیا
ئەوی خەریکە دۆستی خۆی بخا
کاتێک زانی وەک دیوار، ڕووخا
هەر چی لای گەورە واتەی ڕەوایە
ئەگەر چاک نەڵێ (چاک)ی کەوایە

نـــەدیم نموونـــەی قیلـــەنمایـــە
بـــەد مـــەبـــە، ڕۆژان ڕۆژی لـــە دوایـــە
دڵـــی هیـــوادار خورپـــە خورپیـــە
لـــەگـــەڵ ڕابـــەردا چرپـــە چرپیـــە
ئەوی ڕۆژووی گـرت سـەر فتـرەی نـەدا
ڕۆژووی نابـــەنـــە بـــارەگـــای خـــودا
جـــەژن دانـــرا بـــۆ ڕۆژوەانـــان
ئێـستا بـێ ڕۆژوو ئـەیـەن بـۆ خۆیـان



شـــەوی درێـــژی ئـــەوەڵـــی زســـتان
لـــە گـــەڵ ڕۆژگـــاری ئـــاخری نیـــسان
بـــەراوردی کـــە وەک پـــەنـــدی پـــیران
یـــەعـــنی لـــە بـــاریٚ نامێنـــیٚ دەوران
کـەوابـیٚ نابـیٚ هـیچ کـەس مـەغـرور بـیٚ
بە نەبوون، زەبوون، بە بوون مەسروور بیٚ
ئـــەبـــیٚ دەســـتەڵات بـــە هـــەل بـــزانی
هەڵسووڕیٚ بـۆ خـەڵـک هـەتا ئـەتوانی
کـــە هـــەڵـــبژێررا لـــە قـــەوم خۆیـــشا
فۆڕمـــەی نـــائیبی بـــە بـــەردا کێـــشا
پـەلـە، پـەل پـەل بـیٚ لـە هـەمـوو لایـە
چونکـە ئـەم حالـە حـەللی لـە دوایـە
بـــا وجـــود ئـــەمـــە نابـــیٚ بـــە بـــەڵـــێن
مـــەبعووســـی ئێمـــە نـــەبـــوە هـــیچ بـــڵێن
کـابرای زەکـی! تـۆیش نـەخـەڵـەتـابی
بـــــلێی حیـــــسابی دەورەی نیـــــابی
ئاگـات لـیٚبوو چـەنـد ئـەزیـەتـت کێشا
بۆ تـووتن‌و سـووتن چـەنـد سـەرت ئێشا
کـــەوا کـــەوتوویتـــە نـــاو گـــەڕەکـــەوە
چـــاو بـــەســـتەرەوە بـــە دەســـرۆکەوە
بـــۆ خـــۆت کتـــێبی تـــاریخ بنووســـە
ســـەرپێچـــی مـــەکـــە چـــارەنووســـە
هـــەر چـــەنـــدە نـــەوای ڕاســـت عیراقیـــە
لـــە قوبـــەی، دەهـــرا ســـەدات باقیـــە

مـــەقـــامی منـــیش میلـــی مینایـــە
مینـای دڵ، بـەردی ڕەجمـی زۆر تیایـە

مـن هیـوام بـە کـەس نیـە بـێ بـاکم
بـە تـەعنـەی بـەدکـار ئـەزانم چـاکم

جـارانی پێـشوو کـە مـەتـەڵ بـاو بـوو
هـەر نیـوە شـیعرێ مـەتـەڵـی نـاو بـوو

ئـەم پـەنـدە نـاوی بـە مـەتـەڵ ئـەبـرێ
بەڵام بۆ هـیچ کـەس نـاوی حـەل نـاکرێ



هەورو ڕەشەبا بەفرو هەڵەکۆک
مشک‌و پشیلە لەگەڵ یەک ناکۆک
واشەو چۆلەکە کەرویشک‌و تانجی
پشیلەی مەتبەخ‌و هەمینە باجی
سەگ‌و گورگ‌و مەڕ ئاشچی‌و داری تەڕ
سۆفی‌و سەگی گەڕ چەتەو ئەسپی لەڕ
بە ڕۆژی شەموان جوولەکەو ئاگر
ئاغاو هەرەوەز پۆلیس‌و نازر
ئەمانە هەموو حوکمی سروشتە
تیغی بەدکاری هەر بە بڕشتە
هیچ کەس لە پیاوی هێمن ناترسێ
کە بەد دەرکەوێ خەڵک ئەحەپەسێ
خەڵای کەس نیە فەلەک بەدکارە
هەمیشە لەگەڵ نائەهلا یارە
ئەیەوێ عالەم لە یەکتر بەردا
پاڵ بداتەوەو سەیر کا بە سەردا
ئەو کەسە شێتە کە لە دونیادا
بە هیوای چاکە خۆی بە فەنا دا
نازانێ دنیا لاشەی تۆپیوە
سەگ دەوریان داوە گۆشتیان نەدیوە
یا ئەبێ وەک خەڵک بێیتە شەڕە سەگ
یا ئەبێ هەڵکەی بە نانی کەپەک
هەرچیم دی ئەڵێ ئەی بەختی دوژمن
نایێڵێ دونیا ڕوو بکاتە من

ئەوی هەیشیەتی هەر بە پەرۆشە
سەیری کەن سەیری دونیا چەند خۆشە
هەتا باریان کەی هەر دەڵێن: کەمە
خۆزگە ئەمزانی کەی دەڵێ هەمە
یەک بە یەک هەموو ئەمە ئەزانین
هێشتا ئەسیری جەهل و نادانین
بەلام لە لامان بوو بە ئەفسانە
عەشق و سووتانی شەمع و پەروانە
پەندی پیرانم هێشتا لە بیرە
ڕۆژێ نوسیبووی ئەو پیاوە پیرە
دەوڵەمەند پارەی بە کەس نەداوە
ئەو هەموو خەڵکەی ئەڕوا بە دواوە
هەر ئەو نەریتەو هەر ئەو پیشەیە
ئەم پەندە بۆ من هەر سەئێشەیە



فـەلـەک بـە پیـاوی ترسـنۆک فێـرە
بـە کـەر نـاوێرێ بـە کورتـان شـێرە
ئـەمجـا تـۆ دەبـێ خـۆت نـەترسـێنی
بە هیممەت چەرخی فەلەک بشکێنی
هـەورە تریـشقەت لـە لا، وەک بـا بـێ
بـە بـێ پـەروایـی شـات لا گـەدا بـێ
بەلام بەو شەرتە کردەوەت چاک بێ
دڵـت لـە فیتنـەی جاسـووس بێبـاک بـێ
گـوێژە، مێـزەری بـەفـری لـەسـەر نـا
ناو شـار نـاخۆش بـوو بە زوقـمو سەرما
دارو خـەڵـووزمان فیئـاتی سـەرکـەوت
قـەیـد ناکـا هاکـا پـشکۆمان بـۆ کـەوت
هـەنـدێ بـە زۆیـا گـەرم ئـەبنـەوە
هـەنـدێ بـە سـۆبە گـەرم ئـەبنـەوە
گاڵتەی (حەبەزبووز) دیسان کەوتە سەر
کـەرامـەتی شـێخ چـووە (زەیلـی) کـەر
خواجە نـەسرەدیـن بـۆ هـەر سێ سـوئال
تەنها کـەرەکـەی خـۆی کـرد بـە میسال
کـەری عـوزێریش لـە قورئانایـە
بـەعـسـەتی ئـەویـش زۆر بـە مانایـە
ئـەڵـێن ئـەو کـەرە تـەنهـا زەرپـوە
نێـرەمـووک بـووەو هـیچ نـەپـەڕیـوە
خـۆ، کـەری عیـسایش نـەتـەوەی نییـە
نـازانم ئـەوە حیکمـەتی چییـە؟
ئێـستا، کـەرێکـی دەجاڵـمان مـاوە

هێشتا کورتانی بۆ نەدورواوە

تەرسی کەرەکەی دەجاڵ خورمایە

بۆ ئەو خورمایە خەڵکی لە دوایە

هەندێکمان هەیە کەوا خورمژەن

هەندێکیش کوشتەی خورمای کورد کوژەن

کەڵەرمی کوێستان بە سێ شاییە

ئەم (لەهانە)یە ئا نە باییە

پەندم بە پەند بوو، وەک پەندی پدەر

لەهانە زۆر بێ ئەیخەمە بەر کەر

تەلیسمی جامی چل کلیلەیە

گۆشت بۆ کەرە، کا بۆ پشیلەیە



غـرووری کـەوتـە سـەر ئـەسـفەنـدیار
تـیری ڕۆسـتەمـی زوو بـۆ کـەوتـە کـار
لـــە پێـــشدا زۆری لـــێ پاڕایـــەوە
ئـــاوڕی خێـــری لـــێ نـــەدایـــەوە
ئـەیگـوت مـن لـەشـم لـە تـونج کـراوە
ترسـم لـە گـورزی ڕۆسـتەم نـەمـاوە
تـــیرێ هـــات و دای لـــە ئـــاوی چـــاوی
چـــەماندیـــەوە قـــەدی لاولاوی
ڕۆستەم پێی گوت کوا ڕۆیین تەنیەکەت
ئـاوازەو لافـو گـەزاف ژەنیـەکـەت
کـێ وتی: دەسـتی ڕۆسـتەم ببـەسـتە
چەرخ لە ژێر دەستی ڕۆستەمدا پەستە
ئـەسـفەنـدیاریش هێنـد هاتـە زمـان
چەپ گـەردە چـەرخـی بێوفـای زەمـان
سـەد هـەزارانی وێنـەی مـنی کوشـت
گاهێ پشت بە زین، گاهێ زین بە پشت
مـەگـەر شـانامە بـە کـەیـف بخـوێنن
نابـێ پـەنـدیکی وای لـێ دەربێـنن
ئـەگـەر هـەر پـەندێ پـەندێکمان باتـێ
ئێمـەیـش ئـەچینـە ڕیـزەی ولاتـێ
بـەلام هـەر ئـەزیـن وا هـەڵـدەبـەزیـن
گـورەگورمانـە تـا دێـە بـەر زیـن
بـە حوشـتریان گـوت ملـت درێـژە
وتی: ئـەروانم ڕێ سـەرەو لێـژە

لێرە ئەو کەسەی کاریان پێ سپارد
ملۆزمێکە بۆ هەناسە سارد

هەر خۆی ئاغا بێ و ژنی ئاغاژن
لەگەڵ برایا بیکە بە دوژمن

بە ئاغایەتیش کە هاتوو لێ کەوت
خۆی ئەکوتێتە میحرتابی مزگەوت

بۆ ئەو کەسانە شەرمیش نامێنێ
دوژمنیشی بێ هەر ئەیدوێنێ

لە ناو چاوایە تنۆکی حەیا
کە لەگەڵ تکا، رابورد، واتکا

چوار یاری یەک ڕەنگ لای من یۆڵداشن
ئێوە بۆ خۆتان لە دار داتاشن

چیبکەم یەک رەنگی لە ناوا باوە
ئێستا دوو ڕەنگی لە ناوا باوە

ڕۆژێکمان لێ دێ بگەینە بوار
ناچار دەرکەوێ ڕەنگی ژێر شەڵوار

کەس واتەی چاکە ناگێرێتەوە
غەیبەتیش لای کەس ناشێرێتەوە



شیعرێکی سەیری کوردیم چاو پێ کەوت
لە ماناکەیا مەراقم ڕێ کەوت
مانای شیعرەکەم لێ بوو بە مەتەڵ
ئەمزانی قازان بووە بە مەنجەڵ
(قازان قەتار بەست قولنگان هەوایی)
(حەیفە قیلەکەم شەو بە تەنهایی)
دەفەرموو قازو قولنگو دوڕاج
ئەمانەم بۆ بکە بە مەنجەڵ و پاچ
قازان قولنگان پۆلی باڵداران
پێکەوە ئەژین وەک دەستەی یاران
یەعنی کە ئەوان قەتار ئەبەستن
حەیفە تۆ تەنها بە بێ من نووستن
یا خود کە مەنجەڵ لە ڕیز بە قەتار
ئاو گەرم ئەکەن بۆ مردووی نازدار
وا هات جەمعی قاز کە بوو بە قازان
مەنجەڵی گەورەیش پێی ئەڵێن قازان
ئینجا قولنگان قولنگی باڵدار
ئەکەونە هەوا ئەڕۆن بە قەتار
باچیش قولنگە جەمعی قولنگان
بەرز ئەبنەوە وەحتی پاچ لێ دان
یەعنی پاچ بە دەست قەبرەڵکەنەوە
بوداوەشاندن بەرزیەکەنەوە
بەمە مردنمان ئەخەنەوە بیر
های شیعری مبهم های عقل‌و تدبیر

ئێمـــە مردنمـــان نـــاوە بـــە لاوە
تـــازە عومرمـــان لـــە نـــوێ نووســـراوە

تریاكمـــان پێیـــە لـــە مـــار ناترســـین
لـــە بـــیر خـــستنەوەی مـــردن وەرِســـین

دوای مـــردن پرســـین نییـــە مـــەترســـە
چۆنـــت هاتـــە پـــێش لـــێ دە مـــەپرســـە

ئێمـــە كـــە عـــومر بـــە كـــەم ئـــەژمێـــرین
حەیف نییـە ئـەویش بـە تـرس رابـوێرین

دانـــا بـــە نـــادان بـــادەنـــۆش تـــرە
گـۆم هـەتـا قـووڵ بـێ مـەلـەی خۆشـترە

بـــیر دوارِۆژمـــان بـــوو بـــە ئـــەفـــسانە
نـــان ئـــەو نانـــەیـــە ئـــەمـــرِۆ لـــە خوانـــە

قـــەیـــدی قیامـــەت مـــەخـــەرەوە یـــاد
بـزەن بـەر رەنـدان هـەر چـی بـادا بـاد

دنیـات بـەم رەنگـە بـۆ ئـەچێتـە سـەر
بو دیـن و ویـژدان خـۆت مـەخـە خـەتـەر

چونكـــە ئـــەم دوانـــە ئێـــستا فیراریـــن
كـــەوتوونـــە شـــاخان شـــوێن نادیـــارین



مـن خـۆم زسـتانم بۆیـه خـۆش ئـەوێ
مــارو دووپــشکی تیــا دەرناکــەوێ
عــاقڵ لــه کــاری خــودا تــێ مــاوه
مــارو دووپــشکی بــۆ چــی دانــاوه
ئـەوەی سـەیره مـار دووپـشک ئـەبینـێ
وره بـــــەرئـــــەدا دۆش دادەمێنـــــێ
پێچــی نامێنــێ لێــی درێــژه ئــەبــێ
له ترسی دووپشک حۆل و گێژ ئەبێ
دووپـشکیش ئـەڕوا تـا تـەوقـی سـەری
پێـــوەیدا ئیتـــر ڕۆحـــی دەرپـــەڕی
ئـــەم عـــەداوەتـــەی زینـــدەوەرانـــە
هـەمووی بـه حـوکمی سـڕی یـەزدانـه
سـەگ بـۆ پـشیله، پـشیله بـۆ مـشک
ئـاو بـۆ ئـاگرو ئـاگر پووشـی وشـک
تانجی بۆ کەرویشک، کەرویشک بۆ بیستان
بۆیـه نـاکۆکن لـەگـەڵ یـەک ئینـسان
جووجەڵـەیش لەگەڵ کەچەڵـه ئەبن
بێ مێـرات بـەگژ یـەکدا هـەڵ ئـەچن
ئەم تێک هـەڵچوونەو شـەرو هـەڵدایه
بــۆ بــێ عیلاقــه وەک ســینەمایــه!
چـەنـد خۆشـه هـەروا لـه دوور بـڕوانی
نــەچیتــه ناویــان هــەتــا ئــەتــوانی
پاڵـتۆی قـەناعـەت بکـەی بـه بـەرتـا
لێفـەی تـەمـەڵـی بـدەی بـه سـەرتـا

ئەمما بە شەرتێ خەیاڵ پەروەر بێ
لە ئەوجی خولیا مورغی تیژپەڕ بی
قەسرو قوسورو ئۆتۆمۆبیلت
تەیارە و ئەسپو تەختی سەر فیلت
هەلاو هەلاوی تەلەفۆنت بێ
لە ژنو شەراب تازەو کۆنت بێ
ئومی کولسۆمت بە ڕادیۆ لابێ
هیچ پێویستێکی ترت نەمابێ
بەڵام ئەو خەمەت دائیم لە یاد بێ
ئاخۆ لە پاش خۆت کێ بە جێت شاد بێ
بەم ئاخەوە بی، هەناسەت سوار بێ
ڕۆژی زیندەگیت بە شەوی تار بێ
تا دوکتۆر دێنن ڕۆحت دەرچوو بێ
هەر چی کرابێ فایدەی نەبوو بێ
تابووت بۆت بێ بە ئۆتۆموبیل
کە چوویتە ژێر خاک داماوو زەلیل
لووت لە بەردی ئەلحەد بکەوێ
تێ دەگەی جێگای ئەسلیتە ئەوێ



هێنــدی تــەبیعــەت کــە هــەواییــە
هــەتــا بــێ خێــوی رووی لــە دواییــە
ئــەگــەر تــۆ هــەوای هــەوا نــەشــکێنی
ئــەبــێ هــەر ســاتێ رەنگــی بنــوێنی
با وجود بەرگی رەنگاو رەنگ جوانە
یــەک رەنگــی ناشــێ بــۆ ئــەم زەمانــە
ئــەڵــێن سروشــتمان لــە چــوار گــەوهــەرە
دوانیــان باوکمانــە دوانیــان مــادەرە
بــاو ئــاگر بــەرزن تــەبعیــان بــڵندە
خاک خۆی خاکییەو ئاو پاک‌و مەندە
بــەرزی و مــل شــکان ئــاگرو ســووتان
خــاک فــەرشــی رێیــەو ئاو مایــەی ژیان
کــەواتــە هــەوای بــەرزیــی مــەنوێنــە
ملــی خــوت بــە پــای خــۆت مــەشــکێنە
بـــەلام سروشـــتێ کـــە بـــای درابـــێ
بــە دەســـت خــۆی نیــە ئــارامی نابــێ
بــە خــواهیش نیــە ئــەم چــەندوچوونــە
بـــە لێخـــورینی خـــودای بێچوونـــە
ئــەگینــە کــەســێ کــە وا عــاقڵ بــێ
نابــێ لــە ســزای بــەدی غــافڵ بــێ
ئەو کەسەی دڵی خەڵک ئەرەنجێنێ
بــە تۆڵــەی دوایــی خــۆی دەترســێنێ
چـــونکی دەزانـــێ موتـــڵەقـــا رۆژێ
دڵ ئـــازار دراو هـــەر پێـــی دەرێـــژێ

ئـەو ترسـە ئـەبـێ بـە گرێـی دڵـی
عـەیـشی تـاڵ ئـەبـێ بـە بـێ حاسـڵی
نایـشچینه مزگـەوت ئێـستا وەک جـاران
گـەردن ئـازادی بکـەیـن بـە جـەژنـان
بـەوە لـە گونـاهی یـەکتـر ببـوورین
ناشـکوری نـەبـێ لـە مزگـەوت دووریـن
ئـەڵـێن گوناهـت ببـێ پـڕ ژووری
بە دوو ڕکات نوێژ خوا لێت ئەبووری
بەڵـێ حـەقوڵـلا خـوا خـۆی ئـەیبـەخشێ
بەلام حـەقولونـاس مـووی لـێ نالـەخشێ
هـەمـوو بـە زمـان پـەیـڕەوی چاکـەیـن
کـە چـی بـە کـردە پـف لـە دۆ ناکـەیـن
خـوا جـەهـەنـنـەمـی بۆیـە دانـاوە
زۆرمـان بخاتـە نـاو ئـەو هـالاوە
دیـارە کـە ئـەزەڵ هـەڵـبیژاردین
خـوێـی شـەیتـانی بـە قـین بـۆ ناردین
کـە ئـیرادەی خـواو فـریبی شـەیتـان
یەک کەوێ، چاری چـی ما بـۆ ئینسان



بە سەر نەتاشین نابیە قەلەندەر
بە ئاوێنەیێک نابیە ئەسکەندەر

بە تووڕە بوونو کڵاو خوار دانان
نابیە قوماندان تا نەچیە مەیدان

سوار هەتا نەگلی نابێ بە سوار
برنج نەکوترێ ناچێتە بازاڕ

تا تینی کووره نەبینێ تەواو
لە ناو کەرسواردا بە یەکەم دەرچوو

ئەیگوت یە بادەن ئینە بارانەن
یا، بارەی ڕەزمی شەهریارانەن

تا ڕۆژێ کەوتە ناو تیپی سوار
دەرنەچوو، دواکەوت وەک کەری ژێربار

بانگی کرد یاران (یابوو)م وەستاوە
تمەز هەرەنی یا مادە گاوە

تۆیش کە کەوتیە سەودای خودبینی
خۆت لە ئاوێنەی دێودا ئەبینی

تا گیزەی گوللەت نەبێ بە سەردا
تا، ڕاتنەفڕێن بە دەشتو دەردا

قەدری وێرانەی عجوز نازانی
لە هەموو شوێنێ مەردی مەیدانی

کە بە چڵ و چۆ چوویتە سەر کورسی
ئیتر لە دۆستی کۆنە ناپرسی

ئەوی لە دیزەی خەلکدا ئەسکوتیە
هیچ کەس نازانێ ئەسلی لە کوێیە

هەندێک کە وتیان قسەیان خۆشە
کە ڕازیان دادا دڵیان بە جۆشە

هیچ ئەم لاو ئەولای خۆیان ناڕوانن
سافیلکەن خەڵکی بە دۆست ئەزانن

تا، پیادەی غەیبی لێیان ئەگۆڕێ
بێ ئەجەل لە پڕ ئەکەونە گۆڕێ

گۆڕێ بێ، بۆچی قسەی مووش ئەکا
بۆ پێکەنینی خەڵک، خۆی تووش ئەکا

دەردی جوانیە پێوەندی پێی گوڵ
بەڵای زەمانە قەفەسی بولبول

مەسکەنی مشکان درزی دیوارە
ئەبێ بزانێ مشکیش گوێ دارە

گوڵم دی لە سەر ئاگر ئەکولا
ئەمەم لێ بوبوە گرێ لە دڵا

وتم: چییە ئەم هەڵقرچانەی تۆ
وتی: پێکەنیم بۆیە وام بۆ بۆ



ئـەژدەهـا، کاتـێ هـەتـا هـەڵکێـشان
تـەوقـی ئاڵـتوونی دەکـەن بـە نیـشان
چنـار کـە زل بـوو ئـەوسـا ئـەیبـڕن
هـەودا درێـژ بـێ بـۆ داو ئـەیپچـڕن
ئـەتـەوێ بـەدکـار لـە کـۆڵ بێتـەوە
دوعــای بــۆ بکــە زوور بــەرزبێتــەوە
گونـاە وەک زرێ لــەبــەر ئـەکـرێ
ڕێــی کــاری تـیری دوعـا ئـەبـڕێ
خــوا مــەلائیکــەی شــەڕی دانــاوە
کە چـی لای لـەشـەر بـەدکـار بـەدناوە
عیزرائیـل پیـشەی هـەر گیـان کێـشانە
کـە چـی خـادیمی عـەرشـی ڕەحمانـە
خێرو شەڕ هـەمـوو بـە دەسـت خۆیـەتی
نــەفــام لــە نــاودا چــڵوچۆیەتی
خـۆت هـەڵ مـەکێشە ئەی زەرەر پیشە
بـە ئـازایی تـۆ نیـە ئـەم ئیـشە
تـۆ گلمتکێکـی نـاچیزو بـێ کـەڵـک
دەسـتی قـودرەتـە ئـەتهاوێتـە خـەڵـک
کـە «ئیـزەد» ویـستی لـە کـۆڵ بێتـەوە
لــە میــزی منــداڵ ئــەتوێتــەوە
چراپێکـی نـوور خـوا هـەڵـی گیرسـاند
نەفام فووی لێ کردا ڕیشی خۆێ سووتاند
ئـەتـوانن ماڵـت لـە دەسـت وەرگـرن
نـاتوانن ڕێگــەی لای خــوات ببــڕن

ئـەو دەوڵـەتـەی لێـت نـادرزێ عیلمـە
ئـەوەی لـە شـەڕت لـە ئـەدا حیلمـە

مـەتانـەت وەفـاو عـەزمـی تێدایـە
نـاو تـێ دەپـەڕێو زیـخ لـە جـێدایـە

منداڵ لـە سـەر خـۆ پـێ دەگـرێو دەڕوا
بـەرسـیلە بـە سـەبـر ئـەبی بـە حـەڵـوا

باخی چـوار بـاخی ئـەحمـەد پاشـام دی
ئێـستا خـەوێکـە بـۆم نایێتـەدی

چوار جلد تەئریخی ئەمین زەکـی بـەگ
نـامرێو ناڕووخـێ بـەزۆری فـەلـەک

حـاجی بـەگیش بـوو بـە وەسیلەی خێـر
ئـەو ئـاوە جوانـەی ئـەخۆینـەوە تێـر

ئێتـر بـزانین لـەمـەودوا کـام پیـاو
ئاسـاری خێرمـان بـۆ دێنێتـە نـاو



گـوم بـوو ژیـانو پـەنـدی پێـشینان
هۆمـان کـەوتبـوە چیرۆکـەی ژنـان
ئێستا هـەردووکیان کـەوتنە مـەیدان
سـا، چـی ئـەنوێنـێ ئاوێنـەی دەوران
کـە تـۆ نوشـتیت لـە کـەس نـەهـانی
تـامی لـێ بـوردن ئـەوسـا دەزانی
گـەردشـی جیهـان زۆو زوو ئـەگـۆڕێ
یـەکـێ دێتـەوەو یـەکـێ ئـەتـۆرێ
ئـەگـەر مـەجلیسی میللـی نـەگـۆڕێ
سـەودای مـەبعووسـی ئـەچێتـە گـۆڕێ
بـرا، بـرای خـۆی لا بێگانـەیـە
فـرزەنـد لـە بـاوک بـە بـەهانـەیـە
هـەمـوویش ئـەیـزانین یـەکیتی چاکـە
دوو کەس یەک‌کەوێ سێ کەس غەمناکـە
کـە هـەمـوو ئاشـت بـن بـۆ تـۆ چـاکترە
هـەر ڕۆژە خـوانی لایێـک حـازرە
ئـەوی بـە (فریـو) ئـەگاتـە پایـە
شـەیتـان لـە بـەرگـی فریـشتەدایـە
کاسـبی چونکـە دەعیـەی تیـا نیـە
هـیچ مـەئمـووریکی پـێ ڕەزا نیـە
مـن وا مـەعاشـی تـەقاویتیـەکـەم
ئـەمبـا بـە ڕێـوە بـێ زیـاد و کـەم
هـەوای (بـۆنژۆر)و نـەشـئەی تـەمـەننـا
خـستومیە گێـژی تـەقـەو تـەقـەلـلا

زەیستان لەسەر کاسە سوێند ئەخوا
کەچی چلەی چوو عوزری‌تر ناشوا

ئای بۆ ئەوانەی لە تەماع پاکن
لە ناحساب‌و حساب بێ باکن

ئەگەر سەربانت درزی نەدابێ
دلۆپە ئەبێ لە کوێ پەیدا بێ

حەیفە کای تازە ببرێ بۆ سەربان
هەر پاش ئاخورە ئەبێ بە کای بان



کوشتەی عارەقمان وا لە پێش چاوە
ئێواران هیچمان لە بیر نەماوە
ئینسان لە نسیان دروست کراوە
چاوی لە پەردەی غەفلەت پۆشراوە
تا ساتمە نەکا چاو هەڵنابڕێ
ئەکەوێتە چاڵ پەلوپۆی ئەبڕێ
تا نەمانبەنە گردەکەی سەیوان
چاکەو خراپە نایێتە مەیدان
فۆرمەی وەزیفە کە بوو بە کفن
دەست و پێ لە پیاو ئەبێ بە دوژمن
کە (مەرنەموکە) چاو زەق کاتەوە
ئاغایی لە بیر پیاو ئەباتەوە
کەوا بێ بۆچ هەر باوی (کەوا) بێ
ئەوە (کەوا) بێ کە مەردی تیا بێ
گەردن ئازایی جەژنان ساتێکە
نوێژی ئاشتی هەر، ڕکاتێکە
بەڵام گوریسی شەڕو دەعوامان
هەتا ڕایکێشی ئەو دێ لەدوامان
ئەمانە وزەی بەر گوێی بێعارە
کەس نالێ مردن هەیە لەم شارە
ئەگەر هەر بەندێ پەندێکمان باتێ
ئێمەیش ئەچینە ریزەی ولاتێ
دەستی یەک ئەگرین بە کردو کۆشی
دەولەمەند ئەبین ئەگینە خۆشی

ئـەگینـە ئـەزیــن وا هــەڵــدەبــەزیــن
گــورەگورمانــە تــا دێنــە بــەر زیــن
چلـەمــان کێــشا تــا گــەینــە چلــە
هــەورازمــان بــڕی گــەینــە ســەر ملــە
پێویــــستە ئینجـــا بحـــەســـێنەوە
شــەیتــان لــە خۆمــان دوور بخــەینــەوە
ئەگەر من چاک بم عالەم بۆم چاکە
بــەلام مــرە مــڕ شــەڕی ســەر لاکــە



دنیا گشت ڕۆژێ بەرگێ ئەگۆڕێ
کە شووی تازەی کرد کۆنەی ئەتۆرێ
میردە تازەکەی سەیری کۆن ئەکا
هیچ پەروای نییە ماچ و بۆن ئەکا
نازانێ کە بەم سات و سەودایە
یەکێکی تری لە کەمین دایە
لەم ئاڵو گۆڕەو تەشقەڵەو گەڕە
هەر چی دەبینی هەر نیوەزەڕە
بەم حاڵەیشەوە هێشتا بۆی شەیداین
بێ سودو نابود سەودایی سەوداین
بە دنیا ئەڵێین: چەند بێ وەفایە
هەر چی کە دەستی بەیتێ دنیایە
ئەوی تەشیمان بۆ دەرست دوێنێ
ئەمرۆ ناپرسین کەوتە کام شوێنێ
ئەوی لە شوێنی ئەو دێ تێ دەگا
ئیتر بایەخی چیمان پێ دەگا
ئێمە بە ئەخلاق لە پێشەوە بین
کە لە ناو خەڵکا بە حورمەت بژین
ئەگینە کە هات ماستاو بفرۆشین
کە مانگا نەما چی تر بدۆشین
نەک وەک (کولەژەن) لە هەموو ماڵێ
دەرپێی ئابرومان لە پێ داماڵێ
خۆ دیوەخانی ئیستای ئەم شارە
یا غەیبەتی خەڵک یا خود قومارە

ئەگەر نەیەوێ ساحیب دیوەخان
نایەڵێ زەمی خەڵک بێتە مەیدان
خۆ هەر ئەو ساتەی کە غەیبەت کرا
بۆ خاوەند غەیبەت بە دیاری برا
ئەگەر ئەم حاڵە ئیتر بەس نەبێ
هیچ کەس بە هیوای دوستی کەس نەبێ



ئـەم خـەڵـکە بۆیـە زسـتان دڵنـەرمـە
بـە زسـتان خـاکی سروشـتمان گـەرمـە
خـاک دایکـە بۆیـە بۆمـان دڵسۆزە
ئـاگر باوکـە بۆیـە بـە سـۆزە
چـی بکـەین! باوکمـان جینسی خەشینە
دایـک بـە دەسـتیەوە دایـیم غـەمگینـە
مـەڵـێن کـە ئـادەم حـەوا تـەفـرەی دا
خـۆی وا نـەبوایـە چـی دەکـرد حـەوا
ئـەوی بـە قـسەی ژن تـەفـرە ئـەخـوا
ئـەوە پێـی دەڵـێن: فـەقـیری خـوا
هـەرچـی بـە عـەقلی خـەڵکی‌تر ئـەکا
مـەقـەس بـە زۆری پـەنجـە کـار ئـەکـا
بـەلام شـەیتـانی ئینـسان ئینـسانە
بـە ئاغـام پاشـام تـەفـرە ئاسـانە
خۆزگـە ئـەوانـەی پیـشەیـان وایـە
جـارێکیش جارێـان بـۆ بدرایـە
نوشـست نـاییێنی لـەگـەڵ پیـاو چاکـا
کـە چـی ئـەبـینی کـەس ڕووی تـێ ناکـا
لـە لای هامـڕازی قـسە خۆشـەکـان
غـەیبـەت خۆشـترە لـە دەنگـی قورئـان
مـانگی ڕەشـەمـێ شـوکر بـە سـەر چـوو
مـڕ میـاو مـڕ میـاوی داوودمـان لاچـوو
دەرخۆنـەی سـەری دیـزە لاچـووە
ئـەڵـێن: پـشیلە سـوور کـەتـنی کـردووە

سەگ لە پشیلە بە وەفاترە
کە چی پشیلە یەدری زیاترە
چەند خۆشە لەگەڵ یاری باوەفا
ڕابوێری دائیم بە زەوق و سەفا
گەردی چڵۆچۆت لە دڵ نەنیشێ
با دوژمن باری خەفەت بکێشێ
هەزار بانقەنۆت ئەوە نابینێ
دۆستی دڕکێک لە پێ دەربێنێ



خـوا کـە شـەو دێنـێ ڕۆژ ئـەباتـەوە
پـەردەی تـاریکی دا ئـەداتـەوە
مـەبـەسـتی وایـە کـە بـۆ بـەیـانی
ڕۆژت لـێ بـوەوە قـەدری بـزانی
هـەنـدی بـە تینـێ یـا خـۆ، بـە قینـێ
شـەمـشەمـە کـوێرەن چاویـان نابینـێ
هـەنـدێ وەک چـاوی نـەشۆراو پیـسن
خـەرجـی شـیاکەو کوتـانی لیـسن
هـەر قینـت هـەڵـسێو فنجـان بـشکێنێ
بـۆ پیاڵـەیێکـی چـا دادەمێنـێ
خـۆ دڵ شـکاندن لـەوە خراپتـر
ڕۆژێ ئـەتکـوتن وەک جـاوی گـازر
خۆزگـە پیـاویش وەک شـەراب بوایـە
بـە کـۆنی نـەشـئەی زیـاتر بدایـە
کـە چـی مـن کـۆن بـووم بـە سـەرەوێـر
پـیم ئـەڵـێن: «اخـرج یـا زوج الکـبیر»
ساڵـەو سـاڵ زەوی نـوێ ئـەبێتـەوە
گـژو گیـای لـەگـەڵ ئـەبووژێتـەوە
کـە زسـتان ڕۆیـی ئیتـر نـەورۆزە
بولبـول لـە عـەشـقی گـوڵدا بـە سـۆزە
بـەشـی دو ساڵـمان لـە نـەورۆزدایـە
یاڵـلا کـورو کـاڵ سـا وەرنـە کایـە
موحـەرڕەم شـینەو سـەفـەر داوایـە
هـەر ڕەمـەزانـە جـەژنی لـە دوایـە

خـوا قـەدری (قـەدر)ی خـستە ڕەمـەزان
وەک کوردە نەیکەین بە خواستی ژنان
بـا مانگـێ چاوی شـەیتانمـان کـوێر بـێ
لـە نـاو خۆمـان دا پیـشەمـان خێـر بـێ
ئـــەگینـــە تـــەوری «نـــادر ئاویتـــە»
بـۆ گۆشـت بـە (خـەلـە) حـەقـەوەسێنە



ئـەوی پـەلو پـۆ ئـەکۆتـێ لـە ئـاوا
مـەلـە نـەزانـێ دیـارە خنکـاوە
ناگـەیتـە قۆنـاغ بـە کنگـەخـشکێ
بە لیسی کوێری نیشان چۆن ئەشکێ
گـوریس کێـشەکـێ بـۆ نـاوخۆ نابـێ
تـەجـرەبـەی زۆرت بـۆ خـەڵکی نابـێ
ئـەوانـەی فێـری دەوەن بـە ئاشـن
بـاراشھاغـرِ دەرِواو ئـەوان لـە پاشـن
بـۆ سـەرو پێـی مـاڵ جـۆێ بکـەیتـەوە
لـە سـفرەی مێـردان جێـت نابێتـەوە
بۆ تولەی قەومت کە کەم رەگەز بێ
ئـەبـێ بـە تـورکی (وردم دویمـاز) بـێ
دوکتـۆر لـە بـرین تیریـش دەربێنـێ
ئێـشی برینـت هێـشتا ئـەمێنـێ
کە تۆ بە چەپۆک هیچ کویت نەبێشێ
لاپـورەیـش هـەڵـسێ پیاتـا دەکێـشێ
کـە بـۆ هاوخوێنـت، خوێنت نـەجۆشـێ
پـەچـەی بـەدنـامی رووت دادەپۆشـێ
بـا لـە ناوخۆیـشا ناحـەزیـێ یـەک بـن
لە ڕاستی دوشمن دەست بە کوتەک بن
ناکـەس بـە پیـاوی بـێدەس خـەرۆیـە
ئـەمـرۆ لـە منـەو سـبەی لـە تۆیـە
سەرو دەستو پێ هەمووی یەک لەشە
لـە نـاو عـەشـرەتـا ئـەڵـێن: رەش رەشـە

بــەم زیــق‌و زاقــەو بــەم داو (لمبــازە)
تــەلــە زیتکــەمــان هاکــا تــرازا
کـە لـە چـاڵ و کۆسـپ ورد نـەبینـەوە
ئـەمجـار کـە کـەوتـین هـەڵناسـینەوە
ئـەوانـەی مـەعنـای پـەنـدی پێـشینان
بــە پێچــەوانــە دەخــەنــە مــەیــدان
تـا لـە خۆیـاندا چـشتێ شـک نـەبـەن
دای ناتــەکێــنن وەک گوڵۆلــە بــەن



نـــاوێرین بـــڵێین پـــەنـــدی پێـــشینان
لــە ترســا ئــەڵــێین: چیرۆکــەی ژنــان

خـاتوو زەمهـەریـر شـینی چلـەی کـرد
ئەویش لە پاش ئـەو زوو تـەشریفی بـرد

ئینجـــا کـــەوتینـــە بـــورجی پـــیرەژن
مـەکـری پیرێـژن ڕێـوی کـردە کـون

بـەفـرو هـەڵـەکـۆک بـە بـای نهـێنی
لە لای چەرخـی پیر کـەوتنە خوازبێنی

کــە چـــی بــەفــرەکــە زوو تووایــەوە
شــایی ئـەو جووتـەیـش هـەروا مایـەوە

هـەرچـەنـد لـە تاسـەی دووری تـەورۆزا
بـــە گـــڕی بـــێ گـــڕ دڵ هـــەڵـــپرووزا

بـــەڵام قـــەیـــدناکا خـــۆ هـــەر بارانـــە
نیـــسان ســـەیـــرانی گـــردی یارانـــە

«پواســـان داوریـــل» ئـــەوا هاتـــەوە
خـومی جوولـەکـەیـش شـیواوەتـەوە

هـەردووکیـان ئێـستا بـرەویـان کـەمـە
وەک نـەورۆزێکـە کـەوتبێتـە شـەمـە

پـــێش نیـــسان هێنـــدە درۆ کـــراوە
هـــەمانـــە تـــڕی وای تیـــا نـــەمـــاوە

ســێشـەش دوو لاقـی قورسـی شـکاوە
شـەشـەکـەی تـری بـۆ خۆشـی مـاوە

کنگـری دەشـتو شـاخ پـێ گـەیـوە
دنیـــا بـــۆ ئێمـــە ماســـتی مـــەیـــوە

دۆ هـــات بـــرەوی ماســـتاو نـــەمـــاوە
تـــەشـــی ڕســـتنیش وەک ڕیـــسی خـــاوە
(بسم الله)مـان کـرد بـە دڵـێکی ساف
جنۆکـە هـەمـوو ڕوویـان کـردە قـاف
هێـشتا ئـەمـردووم نـەیـان ناومـە گـۆڕ
پێم ئەڵێن: مـردووی بـەشـی زینـدو خـۆر
تـێ نـەگـەیـشتم بـە کێیـان زانـیم
ڕەنگـە وا بـزانن کـە کوڵـە نـانیم



هەندێ کەس خۆیان کردووە بە ژاپۆن
دەست ئەوەشێنن پێت ئەڵێن پاردۆن[1]

تۆیش کە لەوانە فرسەتت زانی
پیاکێشەو بڵێ منیش نەمزانی

کیسەڵ دووپشکی ئەپەڕاندەوە
چزووی لە پشتی هەڵ چەقاندەوە

پرسی: چی دەکەی؟ هەی بەدکردەوە
وتی: چزووی خۆم تاقی کردەوە

درۆیشی ئەکرد خووی ئەسڵیی وابوو
ئەگینە قینی چی لە دڵا بوو؟

بە دووپشکیان گوت: زستان ناتبینین
وتی: زۆر قەدرم ئەگرن بە هاوین

بۆچی بە دووپشک بڵێین بێ عارە؟
هی وامان هەیە زستانیش دیارە

هەڵەبجە ڕاوی بەرازی باوە
(یەکانە)ی ئەم لا هێشتا هەر ماوە

مشک و بەرازو کوللەمان زۆرە
هێند بێ ئینسافن نایکەن بە نۆرە

زەردەواڵەیێک ئەگەر بکوژی
خورمای شیرینی بەهەشت ئەمژی

زەردەواڵەمان ئاوروژاندبوو
خوا پاراستینی شایان لێ تێک چوو

فیشەکی (هەوا) زوو ئەکوژێتەوە
فیشەکی شێتە لێت نابێتەوە

---

١. پاردۆن: بە مانا ببوورە.

جــاران بۆمبایــان ئــەبــرد بــۆ ماســی
خـوای ماسـی، بۆمبـا کـەوتـە کـەساسـی
قـەشـەو مـالووم‌و گـەچ‌و کـەچ ناسـی
کـەوتوونـە کـوورەی مـەلای هـەیاسـی
زەمـانێکیش بـوو کـە ئـەتگـوت بۆمبـا
بەنـد نـەدەبـووی تـا بـەنـدەرگـەی بـەمبـا[1]
ئێـستا ئـەو هـەوره نـەمـا، هـەسـاوە
لەعنەت لـەو کـەسـەی لـە خـەڵکی داوە



١. بەمبا: مەبەست لە شاری (بۆمبا)یە لە هیندستان.

ئەم فاسڵە کەوا دەڵێن بەهارە
هەورو هەتاوی بێ ئیعتیبارە
خوا ئەم چوار فەسڵەی بۆیە وا دانا
کە ئیعتیباری پێ ناکا دانا
هیچ کەسێ لە سەر حاڵێ نامێنێ
کوائەو مەلیکەی زیندوو بۆ دوێنێ
ئینسان لە نیسیان دروست کراوە
مردووەکەی دوێنێی لە بیر نەماوە
مردووی عارەقیان بردە سەر قەبران
پێکێکێتریام زیاد کرد ئێواران
عارەق خۆر بڵێن وا خۆی پێی دەمرێ
ماڵ وێران کەران چاریان ناکرێ
هێشتا مەرامی خوا حەڵ نەکراوە
ئەم خەڵکەی بۆچ وا لەیەک بەرداوە
ئەگەر مەرامی وا بێ بزانین
کە کەس ناگاتە مەرامو فانین
جا بۆچی ئێمە بەگژ یەکدا چین؟
ئەمەیش ئەزانین شێت گیرتر دەبین
تا فەن بگاتە ئەندازەی تەواو
غازی مخنەق و بۆمبا دێتە ناو
کە وا بێ تامن لە هیچ نازانم
ئەبێ بە مایەی رەحەتی گیانم
ئۆخەی لە قەیدی عەقڵا وا کاسم
شا: بە سەپانی خەڵەم ناناسم!!

زەوقــی بــێ قــەیــدی لــە ســینەمایــە
مــــەنــــزەرەی دنیــــا لام ســــینەمایـــە

بایزیـــد لـــە بـــەر ئێـــشی بزووتـــێ
وتی: تـــەڕو وشـــک تێکـــڕا بـــسووتێ

بـــە دیـــنی ئیـــسلان بـــەد نایـــەتـــە ڕێ
پەندی سەفسەتەی ژین چی لە دەست دێ

بـــەلام هـــەر وا بـــین شـــاری کوێرانـــە
کـــەس، کـــەس نابینـــێ شـــەڕە گۆچانـــە



عەکسی یەکترین (سەفەر) و (نیسان)
لە پاش ٣٦ ساڵ وا بوون بە هاوشان

بەهارو (ربیع) ئەوانیش هەروا
وەک ئێمەو ئەوان پێکەوە دەڕوا

نیسان سەرەتای درۆو ئاخری ڕاست
زۆر چشت یەک ئەخا وەک کنگرو ماست

لە بەحرا دانەی لوئلوئی مەنسور
لە کێوا قەترەی گەوهەری شاپوور

لە شارا کەوتە سەر چەهرەی عەبووس
ئەبێ بە (مەبعوس) بە پێی چارەنووس

زاتەن مەبعووسی بە چارەنووسە
پێی ناوێ بڵێن زمانی لووسە

زمانی لووسی و زەمانی لووسی
گەلێ حەیاتی تەئریخی نووسی

ئێستا زەمانی بێ زمانییە
دوو زمانی ڕووی لە زیانییە

ئەو کەسەی کە بێ هەڵمەتە کاسە
هەلی دایە دەست هەڵمەتە کاسە

ئێستا هەموو کەس مام برینداره
هەر چیەکت ئەوێ لە لای عەتاره

سێزدەی زیادەیان بە پرسەوە نارد
بە تاڵییەوە چوون شیرینیان خوارد

تەلیسمی جامی چل کلیلەیە
زمانی دانا بە کلیلەیە

هەندێ کە بەردیان نایە سەر مەڵۆ
لە بێ باڵەکان ئەبن بە هەڵۆ
هەندێ وەک ڕێوی کونێکی دەست کەوت
لە بێ باڵەکان ئەبن بە هەڵۆ
هەندێ وەک ڕێوی کونێکی دەست کەوت
هەژگ ئەبەستێ ئەیکا بە ئەشکەوت
نانی معاویەو نوێژی پشت عەلی
کە شەڕیش قەوما بچۆڕە سەر کەلی
هەندێ دەعباکەی کەمتیاری پێیە
لە هەموو دیزەی چێشتا ئەسکوێیە



پـەنـدی پێـشینان نالـەی مـەنـسووره
لای هەندێ کەسان کفری مەشهووره
لـە لای ئـەهـلی دڵ دوری مـەنـسووره
ئـەم خهتـا سـووره لـە خۆمـان دووره
ئـەڵـێم: هـەوری سـوور بـارانی دووره
تـەپ لـە تـەنـدووره لـە شـارەزووره
کە چی خەڵک ئەڵێن!! خێر ئەو تەندووره
بـۆ خـەپلـە نییـە ئێمـەی مـەنـزووره
هەندێ شەو ئەگەر بڵێم سەگ لووره
کێ بەو سەگ لووره، لنگ بەرەو ژووره
دیـسان پـێم ئـەڵـێن چـەنـد بـە فتـووره
ناڵـێن سـەد ساڵـە ئـەمـە مـەشـهووره
کابراێـک هـاتووە لـە زەعـیم ئـەدوێ
وتمـان بلـوێره! کـێ ئـەیگرێتـە گـوێ
زەعـیم ئـەوەتـە شێوەی شـەمعـی بـێ
خـۆی بسووتێنێ، نـەفعـی جـەمعـی بـێ
گـەوره ئـەوەتـە خـۆی بـە خـاک بگـرێ
وەک خاک مردووی خۆی لە باوەش بگرێ
گـەوره وا دەبـێ کـە بـە ڕەنجـی شـان
کـۆی بکاتـەوەو بیـدا بـە میـوان
بـا هـیچ میـوانیش مـەمنـوونی نـەبـێ
بیـداو دەربـەسـتی مـەمنـوونی نـەبـێ
زۆرمـان دی ویـستی دۆستی خـۆی بخـا
کاتێکمـان زانیـوەک دیـوار ڕووخـا

هـەنـدێ لـە خـۆیدا دەسـت بـە تێلاتـە
هـــیچ نالـــێ ڕۆژان ڕۆژی لـــە دوایـــە

بـاوە، وا کردمـان بوویـشی بـە ئـەعیـان
بـاش نـەبی خـەڵـکت لـێ دیتـە زمـان

بــەوە چــاک ئــەبی چــاکی بنــوێنی
نـەک بـە خـەمـەوە خـەڵـکی بنـوێنی

خۆزگـە ئـەعیـانی بـێ مـەعـاش ئـەبوو
ئەوسات ئەم خـەڵـکە بـێ تـەلاش ئـەبوو



بــە کــەســێکیان گــوت پیــاوێکی چاکــە
بۆیــە پێــی ئــەڵــێن کــە شــیری پاکــە
ئــەم شــیر پاکیــە بــە دوو مــەعنایــە
هەر چەنـد کـە نوکتـەی وا بێ مـەعنایـە
یــەکێکیــان شــیری بــەر دایکیــەتیــە
ئــەوی تــر شــیری حکومــەتییــە
شیری حکومەت دەست هەر کـەس درا
وەک یــەک دەبــڕێ دوشمــن و بــرا
حــەقــی عمــومی نــادرێ بــە کــەس
ئیش نادرێتە دەست مـەنسووبی ناکـەس
دەستووری ڕێگـەی قـەدبڕ، دوو حـەرفـە
حـوکمێکی وا بـە حیکمـەتی سـەرفـە
ئیش بۆ پیاو نابێ، پیاو بۆ ئیش ئـەبێ
ئەگـەر وا نـەکـەی شـەڕت تووش ئـەبێ
بە هـەڵـم بـەڵـم بـە شـەش پای دووسم
ئینجــا میــزانی کــار ئــەبــێ قــایم
ئــەو تــەرازووەی کــەوا ســەرئــەکــا
کــێ بــە کێــشانەی ئــەو بــاوەڕ ئــەکــا؟
بــەدرێکیــان هێنــا کــە بــەردە پــشکە
دیــوێکی تــەڕە، دیــوێکی وشــکە
مـن وشـکم ویـستو یـەکێکـیتـر تـەڕ
هەڵماندا تەڕ هات ئەو پێی کـەوتـە گـەڕ
بـا وجـود ئێسته کـەم کـەس تـەڕ ئـەبێ
ئەوی تەڕ ئـەبێ گوێچکـەی کـەڕ ئـەبێ

دنیا وەک خەتە میزێنێ وایە
بە شەقی یەکێ دێتەوە کایە

ئاشە تەندووریش بە شەێ ئەدۆڕێ
یەکێ شەق ئەخواو هەموو دەگۆڕێ

ئێستا ئەمانە باویان نەماوە
هومای مەبعووسی وا بە هەواوە

بزانین سێبەر ئەخاتە سەرکێ
شەو دیزی تاڵع بۆ کێ دێنە ڕێ



دوو ڕەشمار هەیە سەری پیاو ئەخوا
یەکێکیان هەوەس یەکێکیان هەوا
کە سەر دەربێنن لە هەردوو لاوە
سەر کوتیان نەکەی کارت تەواوە
دوومارەی زوحاک هەواو هەوەس بوو
درۆیە دەڵێن ڕۆحو نەفس بوو
بە هەوەس دڵی خەڵکی ئەشکێنی
بە هەوا سەودای بەرزی ئەنوێنی
کە دڵت شکاند دڵ شکست ئەبی
کە بەرزیش فڕیت دوایی پەست ئەبی
کەواتە، واتەی هیچیان مەهێڵە
خانووی دوو نهۆم کە دیتە بەرزە
بەلام یەک نهۆم لە زەمین دایە
لەوێ بیش کەوی هیچت لێ نایە
مەوقیعی بەرزیش عەینی ماددەیە
کە کەوتیە خوارێ مەرگ ئامادەیە
ئەوەی کە کاری بە سیاسەتە
دوایی کاری بە سیاسەتە
(ئایە الکرسی) ویردی کورسییە
(قول هو الله) دوعای سکی برسییە
ئایەی مەبعوسیش لە قورئانایە
(یوم عظیم)ی بۆیە لە دوایە
دەردێکی تازە بۆمەئموور داهات
کتوپڕە وەک مەرگی موفاجات

داری ئـــاگری هــــەنجـــیرە بۆقـــۆڕ
قـەبـرڕەڵـکەن ئـاخری دەکـەوێتـە گـۆڕ
لـەگـەڵ ئـەوەیـش‌دا نـەفـس زۆردارە
لـووتی لـە گۆشـەی قـەناعـەت خـوارە
تـەسـکینی نـادا شـەیتـانیی خـەوێ
بـۆ شـەویکـیش بـێ زاوایـی ئـەوێ



ئەوسا کە ڕێو بان ئەبوە تەقو دەو
وردە شاتری ئەکەوتە سەر ڕەو
(خڕائیمچون) بۆ ڕێی سەلەفی دوور بوو
دوو دەست بە تاڵە بۆ شارەزوور بوو
دەستەی مازووری کە ڕەوی ئەکرد
کەم فرستەت لە دووی هەو هەوی ئەکرد
دوایی کە ئەوان ئەگەڕانەوە
لە شوێن حەو حەوکێش ئەگەڕانەوە
بە دیاری دیاردی ئەبوو بە هەرا
کونەمشک ئەبوو بە کۆشکو سەرا
ئێستا ئەم هەموو سەلەفە ئەکرێ
ناوی ئیمچونو قەیار نابرێ
ئۆتۆمۆبێلە!! ولاخ نەماوە
قەیار بۆ پیاوی بێگانە باوە
نالبەندیی کەوتە دەست وەستای گەدا
هەندێ لە نالو لە بزمار ئەدا
ڕۆژێکیش ئەبێ بە کوڵکە بزمار
دەستی کۆڵی سوار بێ کوڵەوار
سەردەمێ کلکیان کرد بە بەهانە
وا ئێستا مۆدەی کلک هەڵکێشانە
مایەو گەرمەی گەزۆ بارینە
لە کێ دەنیشێ مێش ئەم هاوینە
لە سینەمادا (ریو)م دەردی زوو
کە باوی (باوەفیل ئامەدی) بوو

کە ئەتگوت فیلی یەک دەست ئامەدە
بۆ دەست هەڵبڕین یەکسەر ئامادە
لە پاش یەک دەستە یەک دەستو یەک پات
داهاتو کورسی بەختی بێ چەسپا
زۆریان لا خۆشە ئەم جرتو فرتە
بەلام ئاخ هەودای هیوا زۆر کورتە
هەر وەک کورتانی کەری جەجاڵە
بەشەو ئەدروێ بە رۆژ بەتاڵە



دوو جامباز تێکرا چوونە سەر تەناف
لەگەڵ یەکتردا کەوتنە مەساف
بزانین کامیان بەر دەبێتەوە؟
تەنافی بەختی ئەلەرێتەوە
ئەوی کە پیشەی تەناف بازییە
ئەوەڵ هەنگاوی دەولەت خوازییە
خۆ ئەو بابییەی کە بەرز ئەفڕێ
هەر مل شکانی خۆی پێ ئەبڕێ
دنیا هەنگوینەو ئێمە وەک مێشین
لێی نابێتەوە هێندە بە کێشین
ئەبینی یەکێ پێی تێ گیراوە
هێزی تەکانو جوولەی نەماوە
ئێمە خەریکین لەویش تێ پەڕین
خۆمان بە دیاری بۆ مردن بەرین
من خۆم لێم بیستوون ئەهلی مەدینە
(ناموسیە) یان لا پۆپەشمینە
لەوێ مێشوولە ناوی (ناموس)ە
لە زۆر جێش ناموس زمانی لووسە
سا بۆیە! لێرە وەک یەک مەبزولە
سوێندی ناموس و گیزەی مێشوولە
لای جاف ڕەش ڕەشەو ئەمیش لەو هۆزە
قەزای دیزەیە وا کەوت لە گۆزە
(ولا تزروا) حوکمی نەماوە
بە ئاغا، نانی نۆکەر براوە

هەر کەسێ پیاوی خۆی دامەزرێنێ
ئاشە تەندوورە شەق ئەیڕووخێنێ

بە بابی بابی کە کەر سوار ئەبێ
پیاوی بێ ئابڕوو بۆیە هار ئەبێ

من پاڵتۆکەی خۆم هەڵگێرایەوە
ڕێ نەکەوت پێوە بێمە کایەوە

ئەبینم پاڵتۆی خەڵکی ڕەنگ ڕەنگە
وەک کورە کەچەڵ وشکو برنگە



چێشتی کاڵ مەخۆ زگت نەیێشێ
تەماعت کەم بێو مێشکت نەپێشێ
ئەگەر پەڕۆیەک لە خۆت دادڕی
ئەتوانی سەری تەماع ببڕی
کە ئێشی دەرزی خۆت لا ناخۆش بێ
زامی سووژنی خەڵکت لە هۆش بێ
ئەو دڵەی حەسەد هەڵیەقرچێنێ
تامی فەرەحی تێدا نامێنێ
دەست بەسەر پاچی مەرەزە کرا
دوا بە دوا لیستەی فەسڵیش دەرکرا
بژارو قونار کە ساڵەو ساڵە
قونـاری باخی میر بۆ پێنج ساڵە
مێوێ بەر بگرێ توول کێشی دەکەن
ئەوی کە زڕ بێ ڕەگ کێشێ دەکەن
هەندێ باخەوان زەینی بۆ ناچێ
هەر چی هاتە پێش هەر دایدەپاچێ
«پوی کوتاژ» قەومی پی سەربەست ئەبێ
بە (موراتوریوم) دوشمن پەست ئەبێ
بە هەبا، هەبا ئەچووینە کایە
ئێستا کە بەڵم، بەستمی تیایە
گزیەکی تیابوو، بەش بەشی پشکی
ئێستا سەد خۆزگە بە تەڕو وشکی
ئەم گێرەو کێشەی بردنو هێنانە
هەموو سیئەی مەنسووب دانانە

کە چوویتە سە کار دەورەی پیاو ئەگرن
ڕۆژی سەدکەڕەت لەبەرت ئەمرن

کە پیاو بۆ ئیش بێو ئیش بۆ پیاو نەبێ
هیچ کارێ نابێ کە تەواو نەبێ

وەک لە قورئانا فەرموویە خودا
دەستو پێ لێتان شایەتیی ئەدا

دەستو پێوەندی ئێستاکەیش وانە
لێ کەوتی ئەوان کەوتنە بەهانە



پێم گوت: بە گەرما: مەچۆرە بەغدا
وتی: فێمکـــی دڵ بـۆ ئـەوێم ئـەبـا
مـەسینەی مـەسنەت ئاورشـێن ئـەکـا
هـەوای بانقـەنـۆت بـاوەشـێن ئـەکـا
رابتـەی ڕەسمـی نـاو (عملـە)ی دڵـگیر
خێـــری زۆرتـــرە لـــە رابتـــەی پـــیر
ئـەویـان خـەیاڵـەو ئـەمیـان ماددەیـە
پیریـش بـۆ پـارەی مفـت ئامـادەیـە
سـای ئاشـە بـەرزەو ئـاوی چـوون تـەرزە
بنچینـــەی تـــەقـــوای هێنایـــە لـــەرزە
بـەشـوێن تـەقـوادا کـەوتمـە تـەقو دەو
ئـەترسـم دوایـی لـێم بـێ بـە خـەو
زۆر کـەس لـە خـەودا پـارە ئـەبینـێ
ئەی خاتە ئەستیو توند ئەی قووچێنێ
کـە هـەڵسا لـەخـەو دەستی کـردەوە
هیچـی تیـا نـەبـوو، تاسـی بـردەوە
قـــەیـــداناکا ڕۆژی شـــایی شـــاییە
تـــازە پیاکـــەوتـــوو لـــە خـــۆی باییـــە
بـۆ دنیـا خـەفـەت مـەهینـەرە بـەر
هـەر چۆنـێ بیگـری وا دەچێتـە سـەر
ئـــەوانـــەی کـــەوا ڕازیـــن بـــە لاتی
حـــەلاڵ خۆریـــەوە کـــەم دەســـتەلاتی
کـێ خـەلاتی خـۆش ڕەت ئـەکاتـەوە
شـێخیش شـەرابی مفـت ئـەخواتـەوە

دنیا بۆ هەندێ مەسنەت ئەنوێنی
کە دەستی ڕاهێشت جرتێ ئەکەنێ
هیچ کەس شک نایەم کە دنیای تەوێ
لەوە دەترسێ دەستی نەکەوێ
زۆری وا هەیە گێرە شێوێنە
لە ناو نۆ مەنجەڵ شیردا هەوێنە
هەی وایشمان هەنە کە ئەیخافلێنن
پارووی لە دەمدا بێ ئەفڕێنن



بە شیری گامێش گەر جوانوو گۆش کەی
ئەیبی لە ئاوا جێ بۆ خۆت خۆش کەی
ئەو کەسەی بێچووی گورگی بەخێو کرد
بە کردەی ئەو خۆی تووشی جنێو کرد
ئەوەی مۆریانی لەشی نەکوژێ
گۆڕ وایە ئەسپێ خوێنی بمژێ
ئەوەی هەمیشە لە خەڵکی ئەدوێ
ڕۆژێکیش ئەبێ مەکینەی ئەسوێ
مەکینەی سواو خەڵکی کەوتە شوێن
ئەو سایە ناوی (مەنی) لێ ئەنێن
بە مەڕ مەڕۆکێ ئەوی تێ کەوێ
ئەبێ چەپۆکی دۆستی بەرکەوێ
ئەیبەستنەوە بە دەست و پێ‌و چاو
ئەڵێن نایکڕین بە نانە سووتاو
بۆرە پیاو گاڵتەی کرد بە کۆنە بەگ
گورگ پیر بوو ئەبێ بە مەسخەرەی سەگ
هەر چەند بێ ئەمری خودا هیچ نابێ
بەلام کار ئەبێ سەبەبی تیابێ
کە تۆ دانیشیو خوا ئیشت بۆ بکا
ئەتەوێ خوا بکەی بە کوێخای دەرگا
نەوەڵلا تۆ خۆت بکە بە مەنسووب
سەڵکە پەنیرت بخەرە ناو گووپ
قەیدناکا ئەگەر ئەو ئاغا گۆڕا
(فراک)ی تازەی ئەم بکە بە بەرا

زمـانی لـووس‌و ڕیـای بـە ڕێ‌و جـێ
پیـاوی دنیـایش‌و خـوایش دێنێتـە ڕێ

هێـشتا نـەیانـدی کـەس بـە ئیقتیـدار
بـە بـێ واسـیتەی ئـەرخـە بێتـە کـار

ئـەوی بـە عیلـەو نـامووس ئـەنـازێ
هـۆی کـەوتـە نامـەرد بـۆ نـان و پیـازێ

تا دەورێ نـەیێـت کـە پیاو بـۆ ئیش بـێ
ئـەبـێ هـەر بـاوی پیـاوی بـێ ڕیـش بـێ



عــەقــڵ بــە گــەورەو بچــووکی نیــە
کــاری دیــوانیی بــەربــووکی نیــە
لە سەر ماڵی خۆت حەزکەی ئەیەخشی
کە ماڵی دیوان بەخشی، ئەلەخشی
بـە دەسـتی قوچـاو کـارت پێـک نایـە
وەخـتی وا هـەیـە (بزمـا) بـە گایـە
کەروێشک کە ئەنوێ زەق زەق ئەبینێ
کە (دیاردیت) لێ کرد چاو ئەقووچێنێ
لای وایـە کـە خـۆی چـاوی قووچابـێ
ئیتـر ڕاوکـەریـش چـاوی لـەو نابـێ
کاتێ بە (حەل حەل) تانجی کەوتە سەر
کـەروێشکە خـەوی بـۆ ئـەبـێ بـە شـەڕ
ئـای ئـادەمیـزاد بـۆ پـاڕوویی گۆشـت
لـەم گیاندارانـە بـۆچ ئـەکـەنی پۆسـت
ئـەو کـەسـەی چـاوی لـە بـەرتیـل تێـرە
گوێـرەکـەیـەکـە، بـە پـەمـوو فێـرە
لـە مووسـڵ ژنـێ هـەڵلاجـی ئـەکـرد
چینچکـان چـەکـەی بـۆ کـەوان ئـەبـرد
تێ فکـریم هـەڵـلاج هـیچ گـونی نـەبوو
زەربولـمـــەســـەلمـــان بـــە درۆ چـــوو
هـەر لـەو شـارەدا پیـاو تـەشـی دەڕسـت
وەمزانی عەیبە لێوی خـۆم لـێ گـەسـت
کـەچـی تـەشـی ڕێـس لێـرە هێنـد زۆرە
لــە (ڕکــە) کــوژێش ناگاتــە نــۆرە

کەوتووینە دەورێ عەیب نوقتەی هەیە
چاو وردەوەکە بزانە کەیە
(ح)ی تحسمان نوقتەی لە ژێرە
ئەوی پێی فێرە هەمیشە تێرە
ئەمانە عەقلی پێشینیانە
نان ئەو نانەیە ئیمڕۆ لە خوانە
مادام کە پارە ئەڵێن عەیب پۆشە
هەر چی بۆ بکرێ دیارە کە خۆشە



کە لە بەهەشتا ئادەم بۆی دەرچوو
بە سەیران نەبوو، بە دەرکردن بوو
ئەم خاکدانە ناوی مەنفایە
نابێ پێی بڵێن جێگای سەفایە
بۆیە پێغەمبەر شاهی ئەنبیا
فەرموویە ڕاحەت نابێ لە دنیا
ئێمە تێ ناگەین لەم کارو بارە
دەست بەرد ئەهاوێ، بەرد گوناهکارە
هەندێ سروشتی بنچینەی بەدە
پێکۆرەی مشکەو جەوال ئەدڕێ
خوا بۆ زیانی کوللە ئەنێرێ
بە عەینەمەلیش پاسی ئەسپێرێ
هەر زەدو خوردە کاری دنیایی
بۆیە لای عاقڵ خۆشە تەنهایی
زۆر کەس بە قسە، چاکەی لا چاکە
کە چی کە بەدیی پێش هات بێ باکە
ئێستری چەمووش چاکەی پێ ناوێ
لە سەر ئالیکیش جووتە دەهاوێ
بە ئێستریان گوت باوکی تۆ کێیە؟
وتی دایکی کم سەجەرەی پێیە
ئێستا دەبینی هارێک و هاجێ
یەک کەوتوون موویان بە بەینا ناچێ
لە دڵدا خوێنی یەکتر ئەمژن
کە فرسەتیان دی یەکتر ئەکوژن

دوو پیاوچاک چاویان بە یەک ناکەوێ
بە بیستنی دوور یەکیان خۆش ئەوێ
ئەو کەسەی لەگەڵ خەڵک دڵی پاکە
خۆش ڕادەبوێرێ لە ترس بێباکە
کە چی بەدکارێ یا پایەبەرزێ
دڵی وەک گونی هەلاج نەلەرزێ



پیاوێ کە پیاو بێ ئەبێ تێفکرێ
ئەو ڕەخنەیەی خەڵک لەوی دەگرێ
ئەگەر وەک ئەڵێن ئەو عەیبە ڕاستە، بێ
چارەی ئەو عەیبەی لە خوا خواستە، بێ
خۆی هەوڵ بدا بۆ ئەخلاقی خۆی
تا ڕێی توانجی کەس نەمێنێ بۆی
بەوە زوبانی خەڵکی دەبەستێ
نەک بەویش نەڵێن ئەو قینی هەستێ
هەندێکی وا هەن بە کشەمرێ
لە مر، مردنی خۆی، لێ دەگرێ
ئەگەر خۆ بڵێن بە زەردەواڵە
سیرە گۆشتی من بە دەمت تاڵە
ئەڵێن ئەو تاڵە تالیەکی ترە
لەگەڵ ئەمانە وەرە دەربەرە
مە ئەڵێم پەندم سەر دەر هەوایە
هەموو شیعرێکم بە بێ مەعنایە
ئەڵێن: هەر چەندە زۆر بێ مەعنایە
کە چی بۆ ئێمە هەر مەعنای تیایە
هەی هاوار ئەگەر چشتێ شک نەبا
بۆچ (دار هەڵبڕە) بۆ سەر خۆی ئەبا
تۆ پاک دەروون بەو گوێ مەدەرە کەس
گوێ لە واتەی چاک بگرەو ئیتر بەس
ئەڵێن: کە گۆزە هەرچیەکی تیابێ
ئەبێ تەرایی وای لێ پەیدا بێ

لـە لای مـن ڕاسـتە عیلمـی قیافـەت
پیـاوی نەزانو سـاحیب درایـەت

شـافیعی باشـی لێـک کردوونـەوە
چاک تێیان ئەگەین بە ورد بوونەوە

ئەگەر پەیڕەوی ئەو عیلمە بکەین
لە ماهیەتی هەموو کەس ئەگەین

بەلام هی وایان هەیە بە تەفرە
لای گەورە ئەبێ بە پیاوی گەورە

کە چی ئەبینی زۆری پێ ناچێ
سەری لا دەچێ بە نووکە پاچێ

داخم ئەو داخە ئێمە بەم حالە
ئەمانە دەڵێن لای هەندێ تالە



ئەو جلەی دەولەت ئەیکاتە بەر پیاو
داکەنرێ رووتێک ئەکەویتە ناو
خەرقەی زانستی زەحمەت ئەدرێ
سا مەگەر گومرگ هەناسەی ببڕێ
ئەخلاق ئاوێنەی عیلمو سەروەتە
بە بێ ئاوێنە (خۆ دین) زەحمەتە
ئەو ئاوە خۆشەی کانی ئاسکان
زۆرمان دی کە دای لە دەست و کەوان
سا مەگەر کەسێ سیحر حەلال کا
سیحری ئەو ئاوە بە نوێژ بە تال کا
جەندەلی، دانێ لە سەر کارێزێ
بە (قل اوحی) خۆی بپارێزێ
یەخەی جنۆکە بە سوژن بەستێ
ئەوسا چلوچۆ بۆ خۆی ئەوەستێ
با وجود ئەڵێن لە رەمەزاندا
جنۆکە حەپسن لە پشت کێواندا
بەلام هەندێکیان ئەبن بە ئینسان
تیسان بەوانە ئەکەونە نسیان
خۆزگە بە حوکمی ئیمانو قورئان
لە هەر بەرگێکدا ئەبوون ئەناسران
چاکەو خراپە هەمووی بە خوایە
بازاری بەدگۆ زۆر زوو کۆتایە
هەر خولقی چاکە، کە هیوای پێ بێ
پاش مەرگیش ئەڵێن: رەحمەتی لێ بێ

سەرما تەزاندتی، لەشت دەیێشێ
گەرما عارەقی تەزوو دەکێشێ
تا گەرما نەبێ سەهۆڵ بیفەڕە
زستان ئەچنە بەر ئاگر بە دەورە
هەور خرتسومی ئەخاتە دەریا
بە باران زەوی پێ دەکا ئەحیا
زەویش سنگی خۆی ئەکا بە کێڵگە
دەغێت ئەداتێ، تۆ تۆوی تێکە



لـه لای ئـەوانـەی کـه ویـژدان بـاوه
لـــه ڕابـــواردندا ژن نیـــوەی پیـــاوه
کـه ڕەگـی دارت لـه ژێـردا پچڕانـد
گـەلای ڕەونـەقـی دارت هـەڵـوەرانـد
ئەسپێکی ڕەسەن هەر چەند کە لەڕە
گـەلـێ لـه کـەری قـەڵـەو چـاکتره
شەریەت هەر چەند خۆی شیرین دەنوێنێ
هـەر ئـاو تینـوەتی تـەواو دەشـکێنێ
ئەو دەوڵـەمـەندەی لە خوێش نەپرسێ
ئـەبـێ لـه سـەرو ماڵـی بترسـێ
ئـەو قـەڵـەنـدەرەی ویـژدان یاریـەتی
تـەلای ئـەسـتەو شـار خزمـەتکاریـەتی
ئاگری بەد خولق، خەڵق شەیدا ئەکا
خوێنـدن بلێـسەی پـێ پـەیـدا ئـەکـا
لـەم زەمانـەدا کـە کیـزەرییـه
کـچ بـا حـۆریش بـێ دەردی سـەرییـه
بـووی بـه خـەزووری پیـاوی شـەڕانی
ئـەبـێ کچـەکـەت لای خـۆت بـزانی
یـا پیـاو دەکـوژێ یـاخۆ ئـەیکـوژن
کـه وابـێ کچـی تـۆ نابـێ بـه ژن
چیـت لـە دلایـه زمانـت وابـێ
هـەولـی ئـەوەت بـێ واتـەت ڕەوا بـێ
ئـەوی ڕوو گـرژه خـەسـارەمـەنـده
ئـەوەی ڕوو خۆشـه ئـەو دەوڵـەمـەنـده

کە شـەڕانیـت دی پێـی بـڵێ بـەگـەم
ورمزیـــارت دی تــۆ بـــڵێ لـــەکـــم

پـارە وتوویـە سـەخـت و سـەر سـەختم
ئەم دەن بە سەخـی حـەپسی بەد بـەختم

سـەبـری عاشـق‌و پـارەی دەسـت بـڵاو
قـــەراز نـــاگرن بیـــشیان خـــەیتـــە داو



ئـەوی ئـەیـەوێ خـۆی بـەرز بنوێنـێ
ئـەسـپە دارینـە ملـی ئـەشـکێنێ

بـەرزیـی ئـەوەیـە کـە خـوا بتـداتێ
نـەک مـاین چـەقـەڵ بتگێـڕێ سـاتێ

هەندێ بە سیسرک دەنگیان خۆش ئەکەن
لـە جیاتی بـادام چوالـە خـۆش ئـەکـەن

جاران پیاو خراپ سەری شوڕ ئەبوو
ئێستا سـەربـەرزە وەک کـۆتری هـاقوو

من کە ڕوو بەڕوو لەگەڵ کەس نادووم
هەر چی هـەڵـدەسێ دەڵـێ من هـاقووم

کە دار هەنجیرت سووتاند، پیاوی قۆڕ
زکـی دەسـت ئـەکا بە بـاو قـۆڕە قۆڕ

زڵـفدارەکـان کـە بـێ کـڵاون
غـەرێـی لـەواتنـەو عـەتـرو گـوڵاون

ملـی منداڵـی خـەڵـکی دەشـکێنن
مـەدەنیـەتیـان بـەوە دەنـوێنن

جاران ئەیانگوت سەری ڕووت بە چی؟
ئێستا بۆ سەر ڕووت بەرەو پیر دەچی

سـەرم سـوڕماوە لـە کـاری خـوا
خوا، ئەو خوایەیە قەل هەنجیر ئەخوا

ئێستر کـە ئـاخی عـەقیمـی کێـشا
داری بـۆ ئـاگری ئیراهـیم کێـشا

هـەرچـەنـد بارکێـشیی وا کـڵۆلییە
بـەلام بـێ بـەریـی مایـەی زۆڵـییە

ئەوی کە ئەسڵی خۆی لێ گوم بووبێ
خۆو خوا نەناسە ئەبێ بەدخوو بێ
کچ بو جلی بووک بە سات و سەودا
لەگەڵ دەستگیران ئەچێ بۆ بەغدا[1]
ئەڵێن: ئەو کچەی کەوا شوو دەکا
بە ترشی شایی خۆی بێزوو دەکا
کەیفی خۆیانە من شەکرم بۆ دێ
یا ئەوان بچن بۆ شارو بۆ دێ



گــەردوخــولی ئــەم ئاسمانــە شــینە
هــەر چــی لــێ ڕوودا دووری مــەبینــە
چــلکە هــەورێ دێ بــە داوو بــە تــاو
لــە پــاش ســەعاتــێ ئــەیکــا بــە لافــاو
خــانووی هــەزاری پــێ دەڕووخێنــێ
تــۆوی زۆرداریــی پــێ دەڕوێنــێ
گاهــێ دەبــینی گرمــە هــەورو بــا
زراوی پیــاوی ترســنۆک ئــەبــا
کــە چی لــە پــڕێک ئــەیکا بــە هــەساو
ئــارام نــاگری لــە تــینی هــەتــا
خــوا ئــەمانــەمــان وا بــۆ دەنوێنــێ
کــە دەوران لــە ســەر حالــێ نامێنــێ
ئــەم ڕەنگــاو ڕەنگــەیش ئــەبینــێ ئینسان
ئــەڵــێی نــە بایــان دیــوەو نــە بــاران
بــا وجــود ئینــسان کــە لــە نیــسیانە
ئــەبــێ هــیچ خــەمــی نــەبــێ بــە مانــە
ئەگەر کەس نەمرێ بە مەرگو کوشتار
دنیــا پــڕ ئــەبــێ لــە نــەتــەوەی هــار
ئــەبــێ بــازاڕی کــۆن بیڕێتــەوە
تــا دەســتەی تــازە جێــان بێتــەوە
ئێــستا ئــەوانــەی لــە فــەن بــوون پــەیــدا
خــەریکــن کــە قــڕ بخــەنــە دنیــا
هــەر چــی تــەئــسیری کوشــندەتــرە
لــە دەوڵــەتــاندا بڕنــدەتــرە

جاران ئەیانگوت ئەهلی شەرق وەحشین
لە چاو ئەواندا ئێمە بێ بەشین
کەی بە بۆن ئێمە خەلکمان ئەخنکاند
کەی بە تەیارە بۆمبامان وەشاند
لە بەحرو بەرو ژێرزەوی‌و هەوا
جێی سەرخەوێکی ڕەحەتی نەما
تو خوا لێی گەڕێ با ببڕێتەوە
ڕۆژی قیامەت نزیک بێتەوە
قازانجی ئێمەی تیایە ئەو دەورە
ئێمە باوەڕمان بە حەشرو نەشرە



وازمــان لــە پــەنــدی پێــشینان هێنــا
ئیتــر دڵمــەنــدی نــەبــێ لــە بــەینــا
ئێمــە تنقیــدی عــادەتمــان ئــەکــرد
هــەنــدێ گومانیــان بــۆ خۆیــان ئــەبــرد
نــازانن ئـــەمـــە بـــە دڵـــسۆزییە
ئێمــە غــەرەزمــان لــەگــەڵ کــەس نییــە
یــاخوا ئــەگــەر مــن ساحێب غــەرەز بم
خۆشــی ئــەبیــنم تووشــی (مــەرەز) بم
ســەری کــەر بکــرێ بــە ڕەشــی گــاوە
مــن دەربــەســتی نــیم لام لــێ لاداوە
دیــارە کــە خــەڵــکی مــەیلیــان وا دێنــێ
بــۆ دوایــی ڕۆژیــان هیچیــک نــەمێنــێ
بە شــایی و زیافــەت مــەملەکــەت تێرکــەن
بە چاو لێ کەری هەمــوو کــەس فیرکــەن
من خۆم وام ئەوێ دەست بە جانیی مــن
ئیتــر لــەگــەڵ کــەس نــابم بــە دوژمــن
چەند خۆشە جووتێ بەک دڵ و یەک گیان
مــانگی هــەنگوینیــان بچــن بــۆ گــەڕان
بەشەو ڕوو بە ڕووی مانگ لە سیحرا بن
ئاســوودەی غهــم و هــەراو هوریــا بــن
بــە نــەوجــوانیی عــەشــقێ حاسـڵ کــەن
سیحری چلوچۆی خــەســوو بــاتڵ کــەن
خێــرا! نــاوی خــەســوو نابــەم تۆبــە بــێ
نــۆرەی ئــەومانــە لێمــان تــوورە بــێ

یــاخوا هــەمیــشه لــه ســەیرانــا بــن
بــۆ هــەمــوو شــوێنێ لــه گــەڕانــا مــن
بــه ڕیــکو پێکــی و تــاقم و تــەدارەک
بچنــه زیــارەت پــیری موبــارەک
وا پیرالــــکیش ڕیـــــی کرایــــەوە
ســەیــرانی ئــەویــش هاتــه کایــەوە
بـۆچ گــوێ ئــەدەنــه پــەنـدی پێـشینان
بــزەن بــەر ســەفی ڕەنــدانۆ پــیران

خوا ئێمەی ڕەنگ ڕەنگ سروشت پێداوە
ڕەنگی هیچ کەسی بە کەس نەداوە
ئەبینی دوو کەس بە یەک ئەشوبهێن
کە چی بە کردار لە یەکتری جوێن
یەکێ ئارەزووی بە شیرینییە
ئەوی‌تر مەیلی شیرینی نییە
یەکێ وەک بێزووکەر، ترشیی ئەوێ
نەء! ناوی مەبە، ئامان نامەوێ
یەکێ سەودایی شیعری مەوزوونە
یەکێ بە تیری شیعر دڵ خوونە
هەوامان هەیە بە کشە مرە
ئەڵێ: پێت وتووم کشە تۆ بمرە
سا توخوا مرەو بمرە چەند دوورن
هەر چەند کولانەو گۆڕ هەردوو ژوورن
کۆنە پیاوێکمان بە تەقەی قەزوان
نەدینی لەلا ئەما، نە ئێمان
مەلایێکمان بوو، ئەتووت: شپارە
ئەهاتە ویزەت لە نێزەی (یارە)
ڕەحمەت لە سۆفی یارەی زرێ‌پۆش
بۆی ڕام‌ئەکردین ئێستری چەمووش
ئێستا دەستەیە تۆڕی کەم سرەوت
بە قەمچی (یارە)ش نایەنە سەر ڕەوت
یارە مرد لە لای نامەرد نەنێژرا
بۆ گردی یارە چەند شیعر بێژرا

خۆزگە دەمزانی ئەم سرە چییە
ناوی هیچ کەسێ لە ناودا نییە
کە چی تۆ ئەڵێی بامیەکەم ترشە
ئەم خەڵکە هەمووی ڕووی لە تۆ گرژە
دە باوکە ئێرە خۆ (کەرکووک) نییە
(مەلا بامێ) بێ بەو تووڕەییە
یا ئەگەر ترش و ترشی خرابە
ڕووی خۆت ترس مەکە، شیرین بە، چابە
ئەگینە کە تۆ مۆن و ترش ڕووی
دەمی کەس کیسە نییە بیدرووی
هەی وامان هەیە کە لە خوا ئەدوێ
ڕزگاری لە توانج بۆ کێ ئەلوێ
بۆچ پێغەمبەریان لە شار دەرنەکرد
ئیمان ناهێنێ بە کەس، دەستوبرد



گونای من چییە کە بە خواستی خوا
قالۆنچە لە دەست گڵ خەفەت ئەخوا
یافیرنە گولە لە ناوی پاییز
خۆی دەم بەست ئەکا لە بەر دەعیەو فیز
ئەم ئاسمانە کە سواخ نادرێ
پەردەی ڕووناکیی هەتاو نابڕێ
بەڕوو بە ئاگر کە هەڵدەتۆقێ
دەستەی گوێ ئاگر تێکڕا دەتۆقێ
کە ڕانەچڵەکن لە گوێ ئاگردان
بەڕووەکە، دەبێ بە ئاڵتوون بۆتان
بە گاڵتەم نییە هەوامان تیایە
تەقەی ئەو بەڕووەی لە لا بۆمبایە
هەمیسان بۆمبا ناوی کەوتە ناو
کەوتە پەلەپەل پیاوی کەم زراو
هەر چەند کە ئێمە لە پەنای کێواین
وەک کووپەی خومی جوولەکە شێواین
زۆر کەس نازانن پۆلۆنیا کوێیە
کە شەوی لێهات شێتی ڕادیۆیە
ترس و مەراقی ڕادیۆ بەم حاڵە
هەولی بۆ ئەدەین چونکو فیشاڵە
دەروی درۆ هەر نابڕێتەوە
لەگەڵ ناونانا نرا پێتەوە
بە فیشاڵ شەڕە لە گردە گڕوێ
ئەم شارە لەقەی عەلی پێ دەوێ

سـوێند ئـەخـۆم کـە شـەڕ بـاوی نـەمـاوە
ورچـەکـەی مـەنـدۆڵ کلکـی بـڕاوە
ئەی ئەو کەسانەی هەسانی (مەککە)ن
بـە ئـاین و ئـۆیین چـشت گـران مـەکـەن

مـن خـەمـی پاڵتۆی فـەردەم لـێ هـاتووە
سـەرمـا و سـیخواری پـاییز داهـاتووە
ئاخ هەر چەندە پاییز لەش ئەتەزێنێ
هـیچ نـەبێ مـارو دووپشک نامێنێ

هێجگـار مێشوولە لـەگـەڵ گیزەی دێ
لـە تـاو بنـاگوێم سـنگم خیـزەی دێ
لـەگـەڵ ئـەوەیشا نـاوی نامووسە
شـێوەی عنقایـەو خـۆی چاپلووسە



مـژدە بـێ یـاران دوای شـەوی بـەرات
وا مـانگی نـوێژو ڕۆژوومـان بـۆ هـات
ئـەو خـوا پێـداوە کـە موسولـمانە
خۆشـی خۆشـیەتی کـە ڕەمـەزانـە
هەنـدێکیش مێزو کاغـەز ڕێـک ئـەخـەن
زیکـرو تـەراویـح بـە قومـار ئـەکـەن
وا مـن فتـوام دا کـە ڕۆژوو نـەگـرن
بەو شەرتە دەستی بێ دەستان نەبڕن
چونکوو خوا حەقی خـۆی لـێ دەبووڕێ
بـۆ حـەقـی خـەڵکی ئـەیکاتـە ژووڕێ
ئەی ڕۆ، لەو ژوورە کە وەک تەنـدوورە
لنگ بەرەو ژوور کەر لنگ بـەرەو ژوورە
ئـەو لنگـەی جووتـەی پـێ وەشـاندووە
چـەنـد کـەسـی بـێ شـێو پـێ نوانـدووە
لێـی دێتـە زمـان ئـەبـێ بـە جاسـووس
ئەی خانە مەیدان هەروەک ژورناڵ نـووس
ئـەوانـەی لێـرە تـەریـق نابنـەوە
لـەوێ ڕووڕەشـن دەچنـە کونـەوە
چەند خۆشە ئینسان بە ڕوویێکی پاک
دۆستو بێباک بێ بە کـردەوەی چاک
ئەگینە هەر چەنـد سـەرخۆشی مەیە
بە پەروای قینی خەڵک بـێ نەشئەیە
بڕوانـە کـە تـۆ قـەرزت لـە سـەر بـێ
بـەوێدا نـاڕۆی بـا ڕاگـوزەر بـێ

بــــەدیــــیش قــــەرزێکــــە نابژێرڕێتــــەوە
ترســــــی ئینتیقــــــام هــــــەر نابڕێتــــەوە
لــە خــەویــشا بــێ هــەر وەک مۆتــەکــە
دوژمــن لــە دەورت دەســت بــە کوتــەکــە
کــــەوابــــوو بــــۆچی دڵ بــــڕە نجێــــنین
بــۆ نــەوەیــش تــۆوی بــە دی بچێــنین



کــە قــەل قرانــدی بــڵێ: یــا غفــار
بایــەقــوش خوێنــدی بــڵێ: یــا ستار
کە تووشی چاو پیس هاتی زوو بە زوو
دەس بکــە بــە دوعــای (وان یکــاد)و
ئیتــــر مــــەترســــە وا ڕەمــــەزانــــە
پیــــشەی جنۆکــــە لــــە کــــون خزانــــە
بــە موبــارەکیــی ڕەمــەزان ئۆخــەی
جنۆکــە ســووژن درا لــە یــەخــەی
بــەلام کــۆل نــادەم کــۆڵو بــارکێش
ئــەترسـم جــەژنی ســووژن هــەڵکێــشن
لــە دەســت جنۆکــە (بسم الله) ئــەکــەم
کەچی خەڵک لە خۆم تەوەڵلا ئەکەم
لــە (بسم الله)یــشم مــەعنــا دەردێــنن
بــە ئــاگری نــەورۆز زوو ئــەمسووتێنن
هــەنــدێ جــار پــەڵــە، پــەڵــەی برنجــە
زۆر جاریش باران گــەوهــەری گــەنجــە
بــۆ بــاران ئــەچنــە نــوێژەبارانــە
کــە باریش ئــەچنــە پــەنــا گوێسوانە
گــەورە بــە بــاران ئاشــی ئــەگــەڕێ
بــەوشــکیش جوتیــار شــێفی ئــەبــڕێ
کــە چــی ژێــردەستیش ژنی سەد مێردە
کــەسداریش ئــەڵێی ماسی بێ کێردە
خــۆ ئێــستا ماســیش تــەفــرو توونایــە
هەر چی هــەڵدەسێ دەست بە بۆمبایــە

کــەس لــە دنیــادا ئاســـوودە نابـــێ
مەگەر خاوەندی داڵدەو پەنا بێ

ئەڵێن بارەگای خودا بە حەقە
بێکەس لە بەر شەق ئەحواڵی شەقە



نـۆک و ئێـسترو بـەڕوو سـێ زۆڵــن
پەنجەو ناشیێو بار هەر سێكیان كۆڵن
زۆڵـەكـی بـەڕوو هـەرگیـز نـابڕژێ
پریـشكی ئێـستر لـە كـەر ئـەپـرژێ
دووكـەڵ بـە دووكـەڵ وا قانـگ دراون
وەک لنگـە بـەرداش هـەڵـپەسـێراون
بیرازكــەر لــە دەســت بیــزار بێــزارە
بـەرداش لـە خۆیـا هێجگـار بـێعـارە
دوو مـــلۆزمی تیایـــە ئـــەم شـــارە
یـــەكـــێ قومـــاوە، دووەم خـــەمـــارە
قمـــارەكـــەیـــان ســـەری بـــڕاوە
خمـــاریش نوقتـــەی بـــۆ دانـــەنـــراوە
بـــە چاولـــێكـــەری چاومـــان نـــەمـــاوە
مایـــە پووچیمـــان بـــە بـــەر بـــڕاوە
لـە دەزووی گیـپـە لـەرزوتـا ئـەبـڕین
بە ئـاوی دەسـتنوێژ چاوەڕێی گـوڕین
كفتـەی جوولـەكـە بـۆ سـێبـەڕۆ دار
بـۆ خۆشـەویـستی كـوزە كـەمتیـار
بـە شـەو شـەمالـەی كۆلانـان ئـەگـرین
لـە بـەر ئـازایی جـەردەكـان ئـەمـرین
هێـشتا خـەڕەكو گولـە ژەن بـاوە
فابریقـەیێكـی كـەس دانـەنـاوە
بـۆ تـوتنی تـاڵ مایـەی سـەرو مـاڵ
فابریقـەی شـەكـر كـەس نایكـا بـە مـاڵ

فــەرقــی شــیرینی‌و تاڵــیی نــاکرێ
نیــوەی دەرامــەت بــە شــەکــر ئــەدرێ

ئەو پارەی ئـەیدەین بە شـەکری بیلاد
فابریقــەیێکــی پــێ دیتــە بنیــاد

بــە (ســانگەیـدم) مزگــەوتــێ کــرا
ئێمــە بــۆ شــەکــر هێلکمــان بــڕا



دنیـــا دەریایـــە خاشـــاک بـــەســـەرە
ژێرکـــەوتـــەیـــی بـــۆ دوڕۆ گـــەوهـــەرە
شـاخدار بـە شـاخدار خـۆی دایـە قـەڵـەم
تـەرزەی شـوورەیـی کـردی بـە هـەڵـەم
بـێ شـوورەییـەو خـەتـای سـوورەیـە
کـەچـی بـە زوبـان لـە خـۆی دوورەیـە
بـەدگـۆ لـە پیـاوی بـە نـامووس ئـەدوێ
دەستە چەورەکەی لە خەڵک هەڵـەسوێ
خۆیشی وەک کاسەی چەورە بێ باکـە
گـــازری نایـــە مـــەگـــەر بـــە شـــیاکە
یـــاریکم هـــەیـــە زۆر بـــێ بـــەقایـــە
شێوەی ڕەنگ ڕەنگی چوار فەسلی تیایـە
گـــاهێکیش بـــە خـــوو ئـــەو کـــڵاو لارە
نـــیرو مـــێ دەبـــێ وێنـــەی کـــۆلارە
چـــەرخ و فـــەلـــەکـــی جـــەژن دانـــرا
هـــەر کورســـییەکـــی بـــە یـــەکـــێ درا
کەوتە گڕو خول وەک چەرخی دەوران
یـەک لـە زەمـینو یـەک لـە ئاسمـان
کەچی بە سووڕێ لەگەڵ کەوتە گەڕ
سەرووی خستە ژێر، ژێرووی خستە سەر
لـــە کـــاری دنیـــای لادام دەســـتی زۆر
کـەم دەسـتەڵاتی کردمیـە حـەڵاڵ خـۆر
ئـــەگینـــە دنیـــا لـــە دەســـت نـــادرێ
هـــەتـــا جگـــارە تـــەرک نـــاکرێ

پشیلە کە دەمی نەگاتە جگەر
ئەڵێ تاڵ بووە بە دەلوبیبەر

خوا ناسیش چێشتێ زانیی حەرامە
دەمی لێ نادا ئەڵێ: بێ تامە



لــە پاییزانــدا خــەڵــک تــۆو دەچێنــێ
بــــارانی بــــەهار بــــۆی دەڕوێنــــێ
تــۆوی دەغــڵودان هــۆزێ ئــەژێنــێ
تــۆوی خراپــە خێڵێــک ئــەمرێنــێ

کــە تــینی هــەتــاو دایــە ســەر بلــوور
گڕ هەڵدەسێنێ وەک کلپەی تەندوور
ئــاگر ئــەخاتــە ڕەشو زەردو ســوور
ســپی بــێ لــە کــە ناخاتــە فتــوور

ئــەمــە نموونــەی سروشــتی پاکــە
پــاک لــە ئاشــوبی دەوران بــێ باکــە
گوڵــەبــەڕۆژە ڕووی لــە هــەتــاوە
بۆ زۆرکەس سوجدەی کاربەدەست باوە

گــوڵ تــا ئــەکــەوێ ڕوو وەرناگێــڕێ
ئێــرە بــۆ کــەوتــوو جنێــو ئــەنێــرێ
دەســتی لــێکــەوتــەی ناحــەق ئــەگــرێ
ئــەوی کــە خــۆی کــەوت نابــێ بگــرێ

بە سێ مانگ سێ مانگ ساڵێک چوار فەسڵە
بە هەمــوو فــەسڵێ، فــەسڵ هــەر فــەسڵە
بــە ســووژن لێــدان ناگاتــە دوایــی
دەســتی (ویــسکە)یــەو ســووژنی پــۆلایی

مــن دادم لــە دەســت خوێنــدەواری بــوو
وا خوێنــدەواریــش دەردی کــاری بــوو
سەری فەسڵو فەحس هەردووکیان (فێ)یە
دوایــی هــەردووکیــان ئــەبــینی فێیــە

یـاری یـەکمـان هـەیـە قـەڵا قـەڵایـە
گـــەنم گـــردو جـــۆ بـــڵاوی تیایـــە
وا گیپـــەو کـــەشـــکەک ئـــەبـــەشـــنەوە
نـــازانین مـــەجلـــیس کـــەی کۆئـــەبنـــەوە



ئەڵێن بێستوون عەشق لە بنی کەند
فەرهاد شۆرەتی زۆری بازووی سەند
ڕۆستەم کەرێ بوو لە سیستاندا
فیردەوسی ئەوی بە (یەل) نیشاندا
عەنتەری پێیان مێملی خڕنووک
چۆن داستانی کەوتوەتە کەرکووک
فەقێ حەمەدێ بوو لە دارەشمانە
هەر چی هەڵدەسێ ئێستا بابانە
ئەتگوت هەورامان، هەی هەورە ئامان
هەورەتریشقەت وا لە ئاسمان
لە لایان وابوو کە سان بجمێ
بە ڕم حەساری بەغدا ئەڕمێ
ئەڵەمان لە پێش شەڕی گەورەدا
ئەیانگوت لەگەڵ ئاسمان دەور ئەدا
هەر (الامان) بوو لە دەست ئەڵەمان
کەڵەمە کرا وێنەی گای تالان
هەر چەند کە ئەمڕۆ پەتی پچڕاوە
پچڕە پچڕە، لا هەڵپچڕاوە
ئەمساڵ (کریمیس) کەوتە ناو جەژنان
زاتەن دەمێکە میلادە ساڵمان
(پواسون، داوریل) کۆن بوو لێی تێر بووین
کەرنەڤاڵ مابوو، وا ئەویش فێر بووین
دیسان بەمانەیش ناحەسێنەوە
ئەچینە بەغدا هەروا دێینەوە
مەترسن لەشەڕ کە شەر ئاوسە
کەزستان ڕۆیی بای دار ئاوسە



گوریس کێشەکێ بە هیچو پووچی
گوریس ئەپچڕێ تۆ لنگەوقووچی
شیرو خەتمان کرد لەگەڵ جیهانا
من خەتم ئەویست ئەو شیری هێنا
هەر چەند کە ئێستا شێر وەرگەڕاوە
ریش با خوریش بێ باوی نەماوە
فیلی سیاسەت رووپایازییە
رادیۆی ئەورووپا ئێستا نازییە
یاخوا تا سەر بێ ئەم خۆ تێکوتانە
ترسی دزیش بێ، دەست لەملانە
داری کۆن برا، خەڵفی لە جێیە
پەلو پۆی تازە هیوامان پێیە
دەماغم کۆنە کە بێ دەماخە
پیریش بۆ تازە بە ئاخ و داخە
بۆ دڵخۆشی خۆی وتی: ئەو پیرە
هەر چەند پیرە کۆنە بەگیرە
پروپاگاندە کە چاوڕاوە
کەوتە سیاسەت بە بەندو باوە
سەیر سەیری رادیۆی یۆنس بەحرییە
سەراپا درۆی لە ڕاست بەرییە
بە هێزی پارە کە تەکان ئەدا
سەعاتێ چەنەی بێ وچان ئەدا
نازانێ کەوا ڕۆژێکی لێ دێ
جەزای خائینی وەتەنی ڕێ دێ

هەر سەگێ لە دوور بە شوێن خۆێ وەڕی
جێــی ســەگــە نــازەو برســێتیو گــەڕی

ســـەگ وەفـــادارە بـــە خێـــو نـــاوەڕێ
دووپــشکە ســکی دایکــی خــۆی ئــەدڕێ



کــە وتیــان دنیــا کاســتی مــەیــوە
ئــەوسـا بزانــە کــەس تــێ نــەگــەیــوە
شـیرە دەترشـێ و نـاوی ئـەنـێن ماسـت
شیرین ترش ئەبێو چەوت ئەبێ بە ڕاست
بێـزوو ڕیخۆڵـەی ئافـرەت کـرژ ئـەکـا
شـیرینی نـاوێ حـەز لـە تـرش ئـەکـا
جیهان خاتوون چۆن دەست ئەکاتە مل
بـــیر ناچێتـــەوە قابیــــلو هابیــــل
ئــەم ســەرەتایــە لــەوانــەوە هــات
پیــشەی باوکمانــە بــووە بــە مــیرات
هـەتـا دێ ئێمـەیش لێـی زیاد ئـەکـەین
ڕێ بــە نــەریــتی کوشــندە ئــەبــەیــن
فــەن بــۆ فــەنو فــێڵ ئــەبرێتــە کــار
بــۆ چــڵۆچێویش پیــاوی نابــەکــار
پێغـەمبـەر فـەرمـووی کـە ئـەم دنیایـە
کـەس نـەڵـی خۆشـیو سـروەتی تیایـە
کــەس دانانیــشێ بــێ ســات و ســەودا
خوا بۆ سەیری خۆی ئێمەی تێک بەردا
پــەنچکــێ نــانی خــستوەتــە ناومــان
خستیە بـەر چـەپـۆک سـەرو کڵاومـان
ئــەم زەدو خــوردەی شــێرو قــەڵــغانە
هیچــی تــر نییــە هــەمــووی بــۆ نانــە
دەفەرموو کاممان بێ نان هەڵدەکەین
چارەی نەخواردن کەی ڕێی پێ دەبەین

بــەردێکـــی ڕەش وا لــە بـــنی دنیـــا
ئـاوی دەریاکــان ئــەچــێ بــە ســەریــا

هـەڵـیان ئـەلووشـێو هـەروا کـسپەی دێ
تێــر خواردنـــەوەی بـــۆ نایـــەتـــەجـــێ

ئـــەی ئـــەوکـــەســانەی هیواتـــان پێیـــە
ئـــەمـــە هـــەڵـــێنن بـــزانن کێیـــە



پــەروانــەو ماســی بــۆ چــراو بــۆ ئــاو
هـــەر دوو دڵـــدادەن بــە نــاوو بــە داو
هـەردووكیـان ئـەمرن بـە خـوارو ژووی
ئــەم بــە نزیكــیو ئــەویــان بــە دووری
گورگو كەرویشكو شەمشەمە كوێرە
شـەوگـەردن سیانی وایش هـەیـە لێـرە
زەروو خـوێنی پیس لـە لـەش دەردێنـێ
بنیــادەم خـــوێنی پــاك ئـــەڕژێنـــێ
ئــارەێ كــە پیــسە نــەشــە دەنوێنـــێ
مـێش پاكـە كـەچـی دڵ تێكـەڵ دێنـێ
ئـەسـپی زل حـۆرتی مـل شاسـەیـوانی
كـــاتێكزاتی كـــە تێـــی نـــەهـــانی
بــەڵام فــەحلێكــی ڕەســەنی شـیرپاك
سـەری خـۆتی پـێ بـسپێرە بـێ بـاك
بـا گـردێن سـووك بـێ بـان دانامركـێ
پاڵـــەوان ئـــەخـــا كۆڵـــنجو بركـــێ
دڵـــــۆپە دایدا نـــــاوەســـــتێتەوە
هـــەودایـــی گـــایی نابـــەســـتێتەوە
مریشك، هێلكەی كرد گارە گار ئەكا
هـەنـدێ بـێ هێلكـە پیـاو بێـزار ئـەكـا
هــەر چــەنــد مــشەمما هاتۆتــە كایــە
چــەتــر چــاكترە لــەو مــشەممایــە
چــەتــر هــەتــاویش ئــەگێرێتــەوە
ســـووكترەو پـــارەی ئـــەبژێرێتـــەوە

وامـــان ئـــەزانی لافـــاو ئـــەمانبـــا
چلـه بـه سـەرچـوو نـەمـا بـەفـرو بـا

بـــورجی پیرێـــژن بـــۆ جوانـــە ژنـــە
پیریـــش و جـــوانیش دوایـــی مردنـــە



پیرێـژن دیـسان بـورجی خـۆی نوانـد
تـۆوی وەیـشوومەی بـە چیمـەن داچانـد
بــەلام بــا دوو ڕۆژ بــەفــر ببــارێ
پۆیلـەی تـەرزەیـشی بـا بێتـە خـوارێ
دوایـی،دوایـی دێ وێنـەی ئـەڵـەمـان
بەهار دێت لـە نوێ سەوز ئـەبێ جیهان
ئـەڵـێن سرکەی تیـژ شووشـە ئـەشکێنێ
مایــەی خــۆی بــە خــۆی ئـەڕژێنــێ
پیاوی لە سەر خۆ، خۆی خۆی سەر ئەخا
ماینی جـرت و فـرت لـە پڕ بـەر ئـەخا
زۆر کەس فێر بووبوون بە کۆڵـی خلـە
ئـەویـش ئـەپـەڕیـە سـەر پـشتی بلـە
رەحـەیـش لـەدواوە تێیـان هـەڵ ئـەدا
لـەگـەڵ پـێش دەمیا ئـەیکرد بـە هـەڵدا
منـیش ئـەم هـەموو شیعرەی کـە هـەمە
بـە شـیعری دیـوان وەکـەومـە گـەمـە
کـابرا کـە کـەسـی لـێ نـەبـوو دیـار
بـە بـای خـۆی ئـەگـوت بـەهـارە بـەهـار
ئێـستا ئـەو بایـە بـوو بـە سـەرمایـە
بـا بـەهـاریش بـێ ئـەڵـێ: سـەرمایـە
کنگـر پـێ گـەیـی هـەر چـەنـد بـادارە
دوو مانـگ پێخـۆری پیـاوی هـەژارە
کاشـکا دوومـەلان وەک ئـەم بوایـە
خـەرجـی عالـەو هـەرزان بـەهایـە

بــەڵام دومــەڵان کــە ئــەڵــێن زۆڵــە
ڕووی ئـــاوەدانی نییـــەو لـــە چۆڵـــە
دیــسان قــەدری ئــەو زۆر بــە لامــان
زادەی زیــادەیــە پــەســـندەی زەمــان



هۆش و کردەوە وەک گیانو لەشن
بۆ ڕێ گوزاران دوو چرای گەشن

هۆش درەختێکە کردەوە بەریە
لە برانەوە، بەری، بەرییە

ئازاری خەڵکت کە لە دلایە
لە ئاسمانیش بێ پێت لە گلایە

پیاوی بە ئازار وەک دوومەڵ وایە
بایش لە لەش دەرکا ئێشی هەر تیایە

زامی تیغ چارەی دیت بە دەوایێ
برینی زمان سارێشی نایێ

ئەوی هەیەتیو چاوی تێر نابێ
(هل من مزید)، یاخوا هەر وابێ

دەوڵەمەندی ڕژد ڕەنجی بە بادە
نازانێ میرات شەڕی ئەولادە

هەندێ لە چاوکەو چاوگە ئەکۆشن
تینوون لە خەودا ئاو هەڵدەلووشن

ئەو تۆڕەی ڕاوکە ماسیی پێ دەگرێ
کە زۆری پڕ کرد قوڵفی ئەپچڕێ

لەگەڵ دووکەسدا هەڵ ناکا ئینسان
دراوسێی بەدوو ژنی نافەرمان

سێ چشتیش باشە بۆ خۆشی جیهان
بێ کینیو وەفاو سووکی گوزەران

چوار چشتیش باوە وەک درۆی نیسان
دوایی هەر چواریان ئەکەونە مەیدان

زوهدی ڕیاییو خەڵکی تەفرەدان

درۆی نابــەجــاو زۆر خــۆ هــەڵکێــشان

پێنج چشت بێنەجێ ئەگەر بەکەڵکی

دۆست خۆش ویستن و نان‌دان بە خەڵکی

دڵــێکی پـــاک و زمـــانێکی چـــاک

ڕاســت و ڕەوانی پێـی دەژیـت بـێ بـاک

ئــەگینــە هێنــدە هــەوڵ و تــەقــەلــلا

خـــەوو خۆراکـــت ناهێـــڵێ لـــە لا



سەرەتای پاقلە حەرەی سەودایە
بەڵام ڕێواسی مزری لە دوایە

ڕاستە کە پاقلە هۆش ئەشێوێنێ
ڕێواسیش سەودا دادەمرکێنێ

پاقلە ئاوایی خستە میری سوور
مارو موور کەوتە ناو گیای شارەزوور

دنیایە بەهار بولبول دەخوێنێ
قرناویلکەیشی تیا دەقرپێنێ

خوا لە بەهاردا گوڵ دەپشکوێنێ
سەری قاڵۆنچەیش بە گڵ دیشێنێ

های چەرخی کەچ باز های تەبعی ناساز
بەهارە گوێ درێژ کەوتە لەقەو گاز

هەندێ نووکە نووک سەر بە تووکەوە
هەندێکیش دەچن بە پیرو بووکەوە

مەفسول هیوادار کە سەردەکەوێ
مەئموور لە ترسی عەزلی ناسرەوێ

بۆ میوان کورسی سەرا نەماوە
بۆ بێکار زیکری مەولەوی ماوە

ئەوی ئیجارەی قورسی لەسەرە
مژدە بێ کوللە لە سەر سەفەر

ماندوەتی نەبێ چی پێ دەبڕێ
بە ڕاستا ناڕوا، ڕێی چەوت ئەگرێ

هەیە لە برسا هێزی ئەبڕێ
لەگەڵ تێری خوارد سفرە ئەدرێ

دوای ئــەوە کــە هــات برســیی بــوەوە
بێژنگـــێ ئـــەگـــرێ بـــە دەم ڕوەوە

پارووی بێ شەرمی زەحمەت قووت ئەچێ
ئابـڕووی عـەشـرەتێـک بـەوانـە ئەچێ



بێ وره ترسی کە هات بەسەرا
کونە مشکی بۆ ئەبێ بە سەرا
نازپەروەر قۆلی زوو ئەبێ جەمام
سەرما قنگی کەر ئەکا بە حەمام
خۆی شاردبوەوە لە کون و قوژین
کەری خۆی لە لا بوو بە ڕموزن
ئەوەی لە ڕاستی هەزار دڵێرە
بە کەر ناوێرێ بە کورتان شێرە
وتیان تۆ خورمات ئەوێ یا مێوژ
وتی من ناوی خۆم ناوە خورمژ
کە ئاو بلق ئەکاو قوت ئەبێتەوە
زۆری پێ ناچی ئەنیشێتەوە
ئەو بلقە ئەڵێ دەولەمەند وایە
کەللەی بایکی خەڕۆیی تیایە
نازانێ دنیایش وا بێ بایەخە
ئەوی بمێنێ داڵدەو دایەخە
چاکە ڕۆژێ دێ کە دێتەوە ڕێت
بەخشندە نەبێ کێ ئەزانێ کێیت
زمانی چاکیش جێی پارە ئەگرێ
زۆر جار هەژاری پێ دائەمەزرێ
ئای زمانی بەد وای پیاوی بەدکار
زمانت بڕن دەمی گۆڕەوشار
با وجود بەدکار نازانێ ئەمرێ
بە گورزی ئاگر تێی هەڵ ئەدرێ

پیــاو لــە خزمــی پیــاو نوشوســت نابێنــێ
گۆشــت ئــەبــاو ئێــسقان تێــک ناشــکێنێ
خــەڵــک و بێگانــە خــزم ئــەســووتێنێ
کــە چــی ئــاو ئــەڕوا زیــخ هــەر دەمێنــێ
بــــەلام بێگانـــــە ئـــــە گـــــەر دانـــــا بـــێ
خۆشـــە لـــە ڕێــیدا خۆیـــشی دانابـــێ



ئـەو ئـاوە ڕەشـەی ئـەو پێـی بابیـە
زەلـزەلـە، لـە چـاو ئـەودا شـاییە

وەختە لە (وەزو)یش (لاو) سەر دەرێنێ
خوا یار بێ جەرگی شەڕ بسووتێنێ

با وجـوود ئـەگـەر بنوارینـە حـەق
خوا دنیای بنیاد ناو بۆ شەڕە شەق

ئـەگـەر زینـدەوەر نـەتـەکێتـەوە
ئـەوەی کـە دەزێ جێـی نابێتـەوە

کورسی وەزارەت ئەگەر تا سەر بێ
ئەبێ هیوادار ڕێی چی لەبەر بێ

کورسی مەبعووسیی تەلی تێخراوە
لە پێچکەی کورسی وەزیر بەستراوە

فـس فـس پاڵـەوان وەک ڕەئـی منـە
کـە ئـەڵـێ: هونـەر، هونـەری منـە



هەمیشە چشتی باریک ئەپچڕێ
هەودا باریک بێ، دیارە بەر ناگرێ

ئیللا بنیادەم کە بە ئوستووریی
دەپچڕێ یەعنی لەبەر مەغرووریی

ئەوی کە لە خۆی بایی بێ: بایە
هەر گینگڵ ئەخوا ئەوی بای تیایە

ڕۆحیش بایێکە مایەی هەناسە
ئەوی هەناسەی تەنگ بێ کەساسە

خوا ڕۆحی هێندە شیرین کردووە
بە کەساسیش بێ خەڵک بۆی مردووە

هەی وامان دیوە کوێرەو بێ نانە
هێشتا بە هیوای ژینو سەیرانە

خۆ تەماعکاریی وا لە پیاو ئەکا
چاوی تێر نابێ مەگەر لە خاکا

نەوجوان چاکە بۆ شەڕەکوتەک
گورگ پیر بوو، دەبێ بە مەسخەڕەی سەگ

سوو خۆر نابووتی مایەی پێ دەبڕێ
مەنجەڵ کە بزێ، دیارە کە ئەمرێ

حەرام ئاوڕت لێ ئەداتەوە
وەک ڕەگی گولی هەڵئەداتەوە

سەخی لە خوای ویست داوایان لێ کرد
هەر چی بۆی لوا بەخشیی دەست و برد

ڕژد، سواڵکەر ویستی ئەو وتی نیمە
وتی وەرە با سواڵ کەین بە نیمە

بۆ خواپەرستی کە هەوەسناک بێ
لە ناو خەڵکیش‌دا ئەتوانی تاک بێ
ئاگری ستەمگەر زۆر کەم ئەگرێ
ئاه! ڕشتەی ژینی زاڵم ئەبڕێ
ئەگەر دڵ لە ڕاست بێ گوناه پیس کەی
ئەبێ پەیڕەوی نەفرەی ئیبلیس کەی



فەرموودەی خودا گەورەی ئەحکامە
(مـــروا بـــاللغو مـــروا کرامـــا)
ڕزگـاری لـە نـەفـس بـە دڵـی پاکـە
بـەدیـش ببینی هـەر چـاک بـە، چاکـە
بـە زوهـدی جاهیـل ئیعتیـاد مـەکـە
بە غـرووری عیلم خـۆت بەرباد مەکە
ئەگەر لە عەیبی خۆت تێگەیشتی
عەیب لە خەڵک گرتن زوو بەجێی هێشتی
ئەگەر دوژمنی خۆت بە کەم بگری
بـۆ غافـڵیی خـۆت تـا زووە بگـری
کەمی خۆت مەدە بەزۆری خەڵکی
کە چاو لە دەست بی دیارە بێ کەڵکی
ئەوی لە دەست چوو خەمی بۆ مەخۆ
خـۆت بپـارێزە لـە تـەفـرەو درۆ
ئـازار بـە ئـازار دامـەمرکێنـە
بیشرەنجێی دڵـی کـەس مـەرەنجێنـە
ئەگەر تۆ دڵت بێ تەجرەبە بەست
هـەروا بزانـە مـار دەمـاری گـەست
هاوسـێ نـادان بـێ ماڵـت زیندانـە
لـە تـەک ڕەنـدانا زینـدان سـەیرانـە
بـۆ کـەس حیسابی بـەربـووە مـەکـە
پێت بڵێن نەزان خۆت توورە مەکە
لـەگـەڵ نـەناسـا مـەبـە بـە هـاوڕێ
ڕێـی شـەقـام بگـرە تـا ئـەتباتـە ڕێ

بە هونەری خۆت خۆت هەڵ مەکێشە
ڕەزامەندیی خەڵک بۆ تۆ لە پێشە

کە بە پشت کەری دیزا ڕابووریی
ئەبێ لە ژانی لەقەی بیووری



کە تۆ بەخشیت و جنێویان پێدای
ئینجا بزانە کە مەردی خودای
ئەگەر پیاو خراپ هات مەدحی کردی
ئەوسا بزانە کە تۆ نامەردی
کارخانەی بەشەر هەمووی ڕەنگ‌ڕەنگە
بۆیە کوڕ لەگەڵ باوکا بە جەنگە
خوا بیویستایە خۆش خوو خۆش سروشت
یەک قاڵب هەمووی وەک یەک دادەڕشت
ئەگەر خوا ئەوی بەو نەکوشتایە
جێ نەدەما لەم تۆزە دنیایە
بە کەس حەل نەکرا ئەم گفتوگۆیە
هێندە دەزانم بۆ کەیفی خۆیە
هیتلەرێک دێنێ ئەیکا بە «سفاک»
خۆی سەیری ئەکا بێ پەرواو بێ باک
ئەم هەموو خوێنەی پێ ئەڕژێنێ
پاش چی دەماری ئەویش دەردێنێ
دنیای ویران کرد بە لەقەو گازێ
ئەم هەموو نازیەیش هەر بەو دەنازێ
ئەڵێن هار چل شەو ئەژیی، کوا وایە؟
دە، چلەیشی چوو! لە بڕەودایە
بەلام تا یازدەی تەمووز ئەمێنێ
ئەوسا ئیزرائیل گیانی دەردێنێ
بزانین ئەوسا چی‌تر دەقەومێ
وەک خۆی دەمێنێ ئایا هیچ قەومێ

ڕۆژێ بایـەزیـد هـات خـۆی هـەڵکێـشا
خـەرقـە شـڕەکـەی لـە شـەت هـەڵکێـشا

ئـــاگری دۆزەخـــی ئـــەکوژانـــدەوە
خـــەڵـــکی لـــە یـــەکتـــر ئـــەڕەوانـــدەوە

وەلـــەکـــێ قـــامچیی دا لـــە قولـــەپێـــی
جـەرگـی پێـی بێشاو ئازار، گـەییە پێـی

وتی جـــەهـــەنـنــەم بـــا تیــژ بـــێ تـــاوی
تـــەڕو وشـــک تێکـــڕا بکـــەونـــە نـــاوی



پـارەو تـەیـارە هـەردوو وەک یـەک وان
ئاشـکراو پـەنهـان جـەوەنـدەی هـەوان
بـە هـەوای بـەرزی پیـاو ئـەجوولـێنن
ئـەوی سـواریان بـێ ملـی ئـەشـکێنن
جاران گوێ زرنگەی پارەی کە دەبیست
لـە دەنگـی تـەورات خۆشتری ئەویـست
ئێـستا کـە نۆتـەو کـەڵلەی قـەراڵـە
زرنگـەی نـایێو چـاو پێـی خۆشحاڵـە
قـەراڵ هـەر چـەنـدە خـۆی زینـدووترە
شکـڵی نۆتـەکـەی خۆشـەویـستتـرە
سـەد نـەقـشی جـوانی نـەوجـوان و ژن
نابـێ بـە ڕەسمـی نـوتێکی چـڵکن
هـەنـدێ نـۆط جـاران لـە بـرەودا بـوون
دەوڵـەتیـام نـەمـا بـە زیفـۆس دەرچـوون
مـاڵ بـۆ خواردنـە نـەک بـۆ هـەڵگرتن
بـەشـی کـەس نـەدەی ئـەبـن بـە دوژمـن
هەندێک ئەکەونە سەر ڕێی بۆلشەویـک
لـەگـەڵ پـارەدار بـبن بـە شـەریـک
ناڵـێن مـەحـسوولی کـەسـی خۆیـەتی
سـاڵ دوازدەمانگـە هاتووچۆیـەتی
خـوا کـە بنچینـەی دنیـای دانـاوە
بەشی هەر کـەسـی جۆێ بـە جوێ داوە
گـەورەو بچـووکی ئـەگـەر نـەبوایـە
ئـەم کۆمـەڵـیە چـۆن ئـەهاتـە کایـە؟

هەمیشە عەقڵ و عیلم لە پێشە
لە هەموو شارێ نەزان بارکێشە
ئەوەی کە خانووی لە بەرد ئەتاشی
زۆری پێ نەچوو جێ ما لە پاشی
بە قوللەی بەرزی خانوو مەنارە
بەشەر بۆ مردن دائیم ڕێبازە
هەر پیری خانووی دائیم ڕێبازە
خۆشیی تیا نەدی بەداخەوە مرد



دزی ناوماڵــــت چـــاری نـــاکرێ
کلکــی نــەبــڕی دەســتت ئــەبــڕێ
ئــەگــەر پێــت زانی وا دەڵــێم نــەزم
ئـەگـەر نـەتـزانیو گـوردم گـرت دزم
ئـــەو دوژمنانـــەی لـــەڕوودا دۆســـتن
بـۆ هـەل دەگـەڕێـن چاوەڕێـی پۆسـتن
هەر چی بـە مـەردی بکرێ زۆر خۆشـە
لــەگــەڵ دووڕوودا هــەڵــکردن بۆشــە
کـە تۆڵـەی خـەڵـکت بـەسـەرەوە بـێ
ئـــەبـــێ قـــەڵـــغانت بـــەبـــەرەوە بـــێ
جـوو کـە بـازاڕی کـەوتـە کـەساسـی
سـەگ دەخـەسـێنێ بـە دوو عـەباسـی
کـــە دراوی خـــۆی کـــردە هـــەمانـــە
بـە هـەمـوو کـەسـێک ئـەڵـێ: (هامانـە)
هەر چی تێژ ڕۆیـی: زۆر زوو ئـەوەستێ
(کــەڵــەمـە) دەمـی گـایی ئـەبـەسـتێ
دنیـــا کـــە دەورەی تاتـــاری دیـــوە
تارومـــار نابـــێ زۆر هـــاری دیـــوە
ئەوی بـە مـەسنەد خۆی لـێ نـەگۆڕێ
دوژمـــنی هـــەوا ئـــەخاتـــە گـــۆڕێ
ئـەوی بـە حـەقـی خـۆی دەبـێ ڕازی
ناکـــەوێتـــە دەســـت حـــاکم و قـــازی
هـەنـدێک وەک تـەلی تـەنبـوورە وانـە
کـــە دەســـتت پیانـــا بـــۆ تـــۆ زوبانـــە

گـوێرەکـە لـەگـەڵ لـە هـەوسـار بـەربـوو
کاتێــک زانی کــەوتــە نــاو پــەمــوو

کـە گــوێرەکـەیێـک زیانکـاریی کــرد
ئابــڕووی گاگــەلی ئاواییــەکـەی بــرد



ئەگەر بە ڕاستی دۆستی یەک نەبین
هەڵکردمان نابێ پێکەوە بژین
کە تۆ بە دۆستی خۆتم نەزانی
کاتێک زانی کە تێم نەهانی
بیانووی تۆرانتوا لە دلایە
ئەڵێی بانێکەو دوو هەوای تیایە
کە زانیم دەستت کرد بە جرتو فرت
پێم بڵێی سندان ئەڵێم قوزەڵقورت
کە تۆ بە سایەی منەوە (بەگ) بیت
بۆچی وا دەکەی پێت بڵێم تۆ چیت
کە لە داوێنەی دێودا خۆت دی
ڕۆستەمو دێوی سپی دیتە دی
خۆتدا لە قەڵبە بەرگت ئەدڕێ
تونـدی ڕاکێشی هەودا ئەپچڕێ
پیاو لە بەرچاوی ئەسپا وەک دێوە
بۆیە بەو بچووکیە لای ئەسپ خێوە
نە لە بەرێمە نە لە پشتێمە
بۆرەسوارم ڕۆ لە جێی گشتێمە
هەندێکمان بووینە پەپوولەی زێڕین
ئەسووڕێینەوە لە دەورەی پەرژین
ئەنیشینەوەو گورج هەڵدەفڕین
وەک جل بگۆڕین وا دۆست ئەگۆڕین
ئەم ساڵ ئەم شارە بوو بە گولستان
هاتوونە سەیران پۆلی چاومەستان

یـاخوا لـە فینـەی چـاوی بـەد دوور بـین
بـا سالـێ لـە نـاو گـەڵدا ڕووسـوور بـین
خـــوا بیداو قــەدری یــەکتــر بــزانین
دەســتی یــەک بگــرین لــە ئاسمــانین



(بایەقوش) لە هەر شوێنێ بخوێنێ
یا (خێوی) ئەمرێ، یا ئەیڕووخێنێ
ئەم شارە کە وەک بەهەشت ئەنوێنێ
کە ڕەشەبای بوو، خۆشیی نامێنێ
خوا پاراستووینی لە ئاگری (هیتلەر)
یاخوا بە بێ غەم تیا بەرینەسەر
کە لە شەڕ دووریین خودامان یارە
با هەر سەیران بێ لە (گردی یارە)
(جوولەکە) بە قین (هامان) ئەکوژن
ئێستا بۆ خوێنی (هیتلەر) نامژن؟
ئەسلی دوژمنی ئەوان (هیتلەرە)
خوێن ڕێژیی هیتلەر لە حەد بەدەرە
بەلام وا تیری خوای لێ کەوتەکار
هەر وابزانن بۆی کەوتنە هاوار
چ خوابەرداره؟ ئەم ترس و لەرزە
ئەم خوێنە گەشە لە ڕووی ئەم ئەرزە
بە زگێ برسیو بە زگی تێرین
لێمان ناگەڕێن کە خۆش ڕابوێرین
من هەرگیز بۆ خۆم ناپاڕێمەوە
وا من ڕۆییوم ناگەڕێمەوە
بەلام بە هیوام خاکی کوردستان
وەک هەڵدەگرێ بێ بە گوڵستان
دەستە لاوانی خوێندەوارەکان
ئەگەر تێکۆشن بە دڵ و بە گیان

نزیکــە خاکمـــان بـــێ بـــە (ئیکسیر)
هـەمـوو یـەک کـەون بە ڕاوە بـە تـەدبیر

کە دەست لە دەست بێ، قووەت لە خوایە
هـیچ شوبهەت نـەبـێ کـە ئـەمـە وایـە



ئـــەم دارو بـــەردەو ئـــەم شـــاخە بـــەرزە
خـــوا دایــڕەشــتووە، لــەنگــەری ئــەرزە
بۆیــە شـــاخی زۆر لـــەم خاکـــە دایـــە
زەمینـــەکـــەمـــان جنیـــشی تیایـــە
ئــەمــەنــدە ســەختــە نابــێ بــە ڕێگـا
خــوا بۆیــە هێنـدە بـەفـری تـێ ئـەکـا
بەرەودوا ئەمساڵ خەڵک دێن لەو خـوارە
داری بــــەرداره جێــــی ســــایەدارە
ڕۆژێ دارتاشــێک چووبــووە ســەفــەر
گــەیــە کانییــەک سـێبەری لــە ســەر
لێــی حــەسـایەوە، ســەری هــەڵــبڕی
لقـــی داری دی بـــە مـــشار بـــڕیی
دار هاتــــە زوبــــان وتی دنیایــــە
بۆیــە بــەدکـاری وەکــوو تــۆی تیایــە
تــا ئــەو کــەسـانەی کــە دار ئـەنێـژن
قــەدریـان دەرکــەوێ، چاکــەیـان بێـژن
دەشــتی شــۆرەزار هیچــی لــێ نــاڕوێ
لێـرە لـە سـەر بـەرد دارو گیـا ئـەڕوێ
کێــو نموونــەیــە بــۆ حاڵــی بــە شــەر
چـەنـد مانـدوو ئـەبی تـا ئـەگـەیتە سەر
لـەگـەڵ سـەرکـەوتی ئینجـا بـە ناچـار
ملــی ڕێ دەگــری یــەڵــلا سـەرەوخــوار
(اکملــت لکـــم دیـــنکم) کــە هـــات
(یـار)ی غـار گریـا، ئـاو بـە چاویـا هـات

فـەرمـووی پێغـەمبـەر تـەشـریفی ئـەڕوا
عـــادەتـــە کـــەمـــاڵ زەواڵـــی لـــەدوا
زینـدەگـی‌و بـرەو بـۆ کـێ سـەرئـەگـرێ
هەر چی هات ئەڕوا، هەرچی (زا) ئەمرێ



ئـــەگـــەر لـــە نـــوێژدا ڕیـــا بنـــوێنی
خـۆت و خـەڵـک و خـوا ئـەخـەڵـەتـێنی
هەندێ کـە (زیافـەت) بـە سـەلـەم ئـەدەن
چـاوەڕێـی هـەڵـن تۆڵـەیێـک بـدەن
هـەنـدێ کـە میـوان نانیکیـان ئـەخـوا
ئـەبـێ (موسـیهلی) بـۆ بـێ دوابـە دوا
پیـاوێ بـە پیاوێـک ئـەڵـێ بـە تانـە
دوێنـێ خوشـکەکـەت چۆتـە (کارخانـە)
ئەڵـێ چـۆن؟ بـە ڕاسـت ئـەمـە دیتـەدی
ئـەڵـێ ژنـەکـەم بـە چـاوی خـۆی دی
قـەدری مانـگ نیـیـە تـا نـەگاتـە شـەو
گـەرمـا ئـاوی سـارد ئـەخاتـە بـرەو
بـەنیـادەم زادەی (قـەتـرە مـەنی)یـە
کە کەوتـە ڕووی کـار (هەزار مەنی)یـە
بـە بایێـک هـەمـوو عـەیـشی بـەبایـە
کـە کـەوتیـشە ئـاو وا لـە خاکایـە
ئـەوی ئـەزانی بـۆت ناچێتـە خـاک
مێـردی ژن نـەیـا، بیخـۆ بـە بـێ بـاک
کـوڕت جاهیـل بـێ ڕەنجـت بـە بـادە
مـیرات (مـیرۆبی) شـەڕی ئـەولادە
بـە ڕەنجـی شـانی خـۆت بـژی بـەسـتە
پـارەی مـیراتی وەک چـڵکی دەسـتە
قومـار لـە هـەمـوو فیعلـێ بـەدتـرە
(مـەحبوبـە) و (شـەراب) بـەلـەزەتتـرە

کــــە بیبـــەیتـــەوە قـــەدری نـــازانی
لــە گــەڵ دۆڕانــدت دڵ پــڕ لــە ژانی

ئـەم پـەنـدە خـەرجـی پیـاوی فـەقـیرە
دەوڵـەمـەنـد لـە کـوێ ئـەمـەی لـە بـیرە



مریشک ئەچێتە جێیە چینەی بێ
ناچێتە جێیە کەوا چی نەبێ
ماڵ لێی نەبەخشی کەمتر بەرئەگرێ
مێو کە نەیبڕی کەمتر بەر ئەگرێ
ئاو بەری گیرا پەنگ ئەخواتەوە
ڕایی بێ ڕێبوار لێی ئەخواتەوە
ئەوەی بە پارە لە خۆی بایی بێ
بایی‌یە هەر چەند ملیۆن بایی بێ
زوبان چاک زۆر کەم قۆرتی دێتەبەر
زوبانە کە (سەر) ئەخاتە خەتەر
کەڵەشێر تا کوڵ بدا بە گیرە
فێتنە هەوێنی نۆ قازان شیرە
سۆفیی حەرامخۆر وەک کەڵەشێرە
بانگت بۆ ئەداو بە پیسیش فێرە
هێستر کە دایکی لە کەر بەرئەگرێ
ڕنەکی ئەکەی گازت لێ ئەگری
بە هێستریان گوت باوکی تۆ کێیە
وتی ڕەسەنی دایکم پێیە
خۆزگە ئەوکەسەی بە (زۆڵ) دەرئەچوو
ئەویش وەک هێستر بەری نەئەبوو
پیاوی ساف دەروون کە لە (شێرە) ئەچێ
بە گڕێ ئاگر لە پڕ هەڵدەچێ
ئاوی خوڕ هەرچەند کە ئەترسێنێ
هەر ئاوی مەندە پیاو ئەخنکێنێ

ئاوو پیا مەندرو مۆن بێ بترسە
هەی چیت دێ ناوی باوی بپرسە

ئەو ژنەی کە مێرد لای نەنگەویست بوو
شەوێ دزی دی، مێرد خۆشەویست بوو



ئەو کەسەی کە لووت لە دۆست هەڵدەکا
بێگانە چۆنی باوەڕ پێ دەکا
ئەوانەی بەدی ئەهێننەدی
ئایا نە چاکە بەدی چییان دی

کەری دێز مەنێ جۆی بۆ نەپێوی
تۆپیشی ئەوی‌و زیانی خێوی
دەستەیێک سواری گەمیێک بووبوون
بەڕێی دەریادا بۆ (مەککە) دەرچوون

بە ئێکیان شەڕی لە گەڵ (قەپتان) کرد
حستینە سەریان لە زۆرریان دەرکرد
لە ئەهنی (واپور) بووبوو بە دوژمن
ئەی گوت نوقوم بێ (قیریسیا) لە من

(هیتلەر) چووە سەر قەبری (ناپلیۆن)
وتی: ناوداری ئەتریخ چۆنی، چۆن
ناڵەیەک لە خاک هات بە حەزینی
وتی: وا تۆیش دیی بۆ خۆت ئەیبینی

لە دەستی ئینگلیز من هاتمە گۆڕێ
ئیستا چۆن بە تۆ دونیا ئەگۆڕێ



ئەو کەسەی کە سەنگ لە خەڵک ئەگۆڕێ
سینگی نایە گۆڕ، سەنگی ئەگۆڕێ
تەرازووی ئێرەت ئەگەر سەرنەکا
تەرازووی ئەولات سەرت دەرئەکا
نرخمان گرانە و (حوقفەمان) سووکە
ئەپارێینەوە لای (مەرنەمووکە)
مارو دووپشکی دونیا بەزەبرن
بۆ پیاوی زۆردار هاودەمی قەبرن
بەڵام فایدەی چی؟ ئەمانە بۆشە
ئینسان زۆرداره زوڵمی لا خۆشە
ئینسان لە (نیسیان) دروست کراوە
بیری ناو بیری لە بیر نەماوە
ئەگەر وایش نەبێ هەموو بە عیبرەت
تەرکی دونیا کەن بکەونە عوزلەت
هەموو دەبینە فریشتەی تەنیا
هیچ کەس نامێنێ رووبکاتە دونیا
(هیتلەر) بۆ دونیا، دونیای وێران کرد
بە شەڕ ملیۆنێ خەڵکی لە ناوبرد
نایەتە عەقڵی کە ئەویش ئەمرێ
وەک (جەنگیز) ناوی بە خوێنڕێژ ئەبرێ
وا بڵێن (هیتلەر) بۆ خۆی هار بووە
نازانم خەڵکی بۆچی لەدووە؟
بە سەنعەت ئاو و هەوا رام ئەکەن
بە وەحشەت دونیا بێ ئارام ئەکەن

ئـەمـەنـدە بـە جـۆش بـۆ شـایی نـاچن
نـەمامی عـومری خـەڵـک هـەڵـدەپاچن

ئـەوانـەی کـەوا بـۆ شـەڕ دەبـڕین
بـێ گومـان خۆشـیان تیـادا دەکـوژرین

فـەرمـوودەی خوایـەو کـردەوەی یـەزدان
(لـولا دفـع الـه) هاتۆتـە مـەیـدان



ناڵـەی شـەو ناڵـی ناڵـدار ئـەشـکێنێ
زوڵـمی ڕۆژ ماڵـی ماڵـدار ئـەڕمێنـێ
هـەناسـەو زۆردار بـەفـرو هـەتـاوە
بـا وجـوود ئێـستا بـاوەڕ نـەمـاوە
دەسـتای دز بـڕین بـاو بـوو تـا دوێنـێ
ئێـستا دەسـتی دز گـورز ئـەوەشـێنێ
خـۆ بـابی بـابی نـەمـا بـەم شـارە
کـە چـی دەبیـنم کـەر سـواری سـوارە
کـەرەکـەی عـوزێر تـەنهـا دەزەڕێ
کـەڕەشـێخ زۆر جـار لـە ژن دەپـەڕێ
جـاران ڕێـی بـەغـدا ئـەمـەنئە دوور بـوو
مەسەلی چوونی بـەغـدا مـەشـهووره بـوو
ئێـستا کـە (تـەرەن) ڕێـی کرایـەوە
ئـەو مـەسـەلـەیـە وەر گـەڕایـەوە
خورمـای کوردکـوژە نـاوی گـۆڕاوە
بـەو ناوبردنـەیـش بـاوی نـەمـاوە
ئـەوەتی پـردی زنجـیر نـەمـاوە
دیجلـە بـەهـاران شـێتێ تـەواوە
هـەر بـەو شـێتییە کـە کـەف دەچێنـێ
ئـەترسـم ڕوژێ بمانخنکێنـێ
خورمـاو پرتـەقـاڵ لـە بـەغـداوە دێ
لێـرەوە تـرێو هـەرمێـی بـۆ دەچـێ
هـەردوولا بـۆ یـەک دیـاری دەنێـرین
بۆیـە بـە خۆشـی ڕادەبـوێرین

ناچارین هیچمان بێ یەک هەڵناکەین
لەگەڵ یەک پاک بین هەر، ڕوو لە چاکەین

دوو دەست یەک کەون هێزیان پێکبێنن
ڕەگی درەختیش لە بن دەردێنن



زۆردار کــە لێکــەوت بایــەزیدێکــە
بــای ڕێکــەوت بیبــا یــا یــەزیدێکــە
(ان الانــــسان لیطغـــــی) دیــــارە
کـردەوەی خـواری بـەنـدەی بـێ عـارە
(هیتلـەر) بـە غـرور هاتۆتـە مـەیـدان
(انـــا ربکـــم) ئـــەڵـــێ بـــە جیهـــان
بـەڵام ئـەو تـەونـەی گرتوویـەتـە دار
نایتـەنـێ بـۆ کـەس دەسـتی ڕۆژگـار
ئـەوکـەسـەی کـەوا زۆر بـەرز ئـەفـڕی
کـە کـەوتـە خـوارێ هێلکـی ئـەبـڕێ
لـــەوڕۆژەوە خـــوا دونیـــای دانـــاوە
هـەمـووی بـە جـارێ بـە کـەس نـەداوە
ئـــەو دەوڵـــەتانـــەی دڵ برینـــدارن
کـێ دەڵـێ لـەگـەڵ قاتـڵدا یـارن
بـرینی ناحـەق قـەتماغـەیـش بێنـێ
بیرناچێتـــەوە، ئێـــشی دەمێنـــێ
دونیـــا شـــێواوەو پـــشتمان نـــەوییـــە
ســـابزانین خواســـتی خـــودا بـــە چییـــە
دەســـت بـــە کـــلاوی خۆمانـــا بگـــرین
بـــۆ خـــوێن ڕشـــتنی نـــاڕەوا بگـــرین
ئێمـە شـەڕ کـەر نـین هیچمـان لـێ نایـە
بـــە فـــێڵ گـــرانی دێنیتـــە کایـــە
(ڕازیانـــە) لـــە بـــەر دەرگامـــان بـــارە
کـە چـی زگـێشە کـەوتـەئـەم شـارە
کـــاری نـــاڕەوا تـــا ســـەر نامێنـــێ
خـوا حـەقـی (بزنی بێ شاخ) ئـەسێنێ



گلێنـــەی چـــاوت بکـــە بـــە وێنـــە
عالــەم ببینــە، هــیچ خــۆت مــەبینــە
کە بە خودبینی خۆت لـە خۆت گۆڕێ
زوو لە خۆت ئەگەی شایستەی گۆڕی
بـە زەردەخـەنـە کـە کـەوتیـە ڕەخنـە
بـۆ دیـواری قـەدر ئـەبـێ بـە ڕەخنـە
تـازەپیاکـەوتـوو کـە قـەرزت باتـێ
ئـەیداتـەوە ڕووت لـە دوای سـەعاتـێ
بـــەڵام پیـــاوی کـــۆن خزمـــەتـت بکـــا
ئـەیـەوێ نـە خـۆت نـە کـەس تـێ بگـا
لـە پاشملـەی خـەڵـک بـەوڕەنگـە بـدوو
شـەرمـەزار نـەبی کـە کـەوتیتـە ڕوو
کە چاکە ئەکەی مـەیلێ لـە لای کـەس
بۆ زەوقی خۆت بێو خـوا بیزانـێو بـەس
کـــەســـی هیـــوادار نائومێـــد مـــەکـــە
خێرت ئـەنووسـێ بـە قـەد ڕێـی مـەککە
دڵـــی هیـــوادار بـــشکێ (قـــەزایـــە)
نـوێژ (قـەزای) هـەیـە ئـەو بـێ (قـەزایـە)
هـەزار دۆسـت بـێ هێـشتا هـەر کـەمـە
تـەنهـا دوژمنـێ سـەرمایـەی غـەمـە
ئامۆژگاری بێ کەم ماڵ سووک مەگرە
پێغـەمـەر فـەرمـووی فـەقـیری فـەخـرە
گریـان لـە سـەر خـۆ خـەم ئـەڕەوێنـێ
هـەنـدێ پێکـەنـین دڵ تێـک هـەڵـدێنێ

دەوڵەمەند و پیر حرسیان زیاد ئەبێ
حەریسیش دیارە کە ناشاد ئەبێ

(هیتلەر) ناشادە کەوا حەریسە
شەڕە گەڕەکەکەر بەشی هەر لیسە



ڕەنج پەیژەیەکە پیا سەرئەکەوی
کە دەستت بەردا بێ سەر ئەکەوی
بە کردەوکۆشی تێکۆشە وەک شێر
دەستی ماندوو لە سەر سکی تێر
تەمەڵ کە وتی: وا هەمە ئەیخۆم
لە دوایا ئەڵێ ئای چیم کرد بە خۆم!!
کە تۆ بە نانو بەرگی کەس نەبی
ئەچێتە ڕیزی یارانی (نەبی)
دەست پان کەیتەوە لە پێ ئەکەوی
کە لە پێ کەوتی، ئەکەویە نەوی
کەم بخۆی لەشت بێ عیللەت ئەبێ
کەم بڵێ سەرت سەلامەت ئەبێ
چاوت لە نانی دیوانی نەبێ
تێری لێی ناخوا بە ئەرخە نەبێ
کەوتووینە دەورێ دەورەی ڕیاسەت
بە مەهارەتە، نەک بە کیاسەت
خوێندەوار بۆیە ناخەنە قەڵەم
خۆی بە خوێندەوار ئەداتە قەڵەم
نازانێ ئەوی بە عیلم ئەنازێ
هەڵکردیدێتە سەر نان و پیازێ
ڕاستە هەموو چشت بە دەست خودایە
ئەوی (تەشەبوس) نەکا لە دوایە
چونکو خوا نایێ بێ بە کوێخای تۆ
تا خۆت نەیژەنی ماست نابێ بە دۆ
(لیس للنسان الا ما سعی)
لە پێشدا سەعی، لە پاشا دوعا



ئــەزانی بــۆچی ئــەم ڕۆژە جوانــە؟
شــەو ئــاوا دەبــێ؛ لێمــان پــەنهانــە
لــە بــەر ئــەوەیــە قــەدری بــزانین
لێی وەڕست نەبین، سووک تێی نەڕوانین
لــەگــەڵ ئــەوەدا لــەلایــان وایــە
كــە ئــەم دونیایــە بــە ڕۆژ ئاوایــە
كە چی هاوینان خەڵک لێی بێزارە
پیــاوی نازپــەروەڕ لێــی بــەهــاوارە
پەندە بۆ ئەوەی زۆر لە پێش چاوە
ئەگەر ڕۆژیش بێ، خەڵک لێی بێزراوە
عەشقیش كە شێتێ دێنێ بە سەردا
شــووری مانیعــەی وەســڵە لــە بــەردا
كە ئاشقەوماشقە زوو بەیەگ بگەن
زۆری پێ ناچێ پشت لە یەک ئەكەن
ئێـستا وێزێتــە هینــدی تــێ نــاچی
كچ لەگەڵ كوڕە، پرچ هەڵدەپاچی
بۆیە هیچ كوڕێ بۆ كچ شێت نابێ
پێكــەوەن لــە ســەر نــانو كــەبابــێ
جاران كوڕ ئەیگوت: جەرگم كەبابە
ئێــستا خــەنیمــی نــانو كــەبابــە
ئای بۆ دەورەی كۆن، دنیا چەند خۆش بوو
كوڕ بە عەشقی كچ مەست و سەرخۆش بوو
بــە لۆیــە بــەرگو نــانو ئــاوێ
شـا بـوو بـە عـەشـقی سـەربـەدراوێ

ئەگەر تۆ خوای خۆت بناسی بە دڵ
هەموو مەرامت بۆ ئەبێ حاسڵ
خۆشەویستی خوا خەم ئەڕەوێنێ
کە خوات بوو کارت بە کەس نامێنێ



دنیـا کـەوتۆتـە خـەم و دڵـتەنگـی
هاتووە بەیەکدا وەکوو مووی زەنگی
دیـسان مـووی زەنگـی ئاڵـۆزایەوە
(قـەڕاڵـی حـەبـەش) کـەوتـە کایـەوە
دەعـــوای بـــەرانی ڕەش و ســـپیە
بـزانین خواسـتی خـودا بـە چییـە؟
چەنـد خۆشـە ئینسان لـە جێیێکی بـەرز
سـەیری دنیـا کـا بـە بـێ تـرس و لـەرز
(هیتلـەر) یـەکانـەی بـە لـەسـەی شـەڕە
لـەگـەڵ بـەشـەردا بـە داواو گـەڕە
(ماتاکـساس) ئـەمرێ ئـەو هـەر زینـدووە
باوکم بـە خـوا، خـوا ئـەمری کـردووە
مادەی کەرو گای (کفر ئەحمەد) حەقە
وەرە لـە داخـا مـەمـرەو مـەتـەقـە
بـە حیـساب ئـەمرۆ پـشکۆ ئـەکـەوێ
تـۆفی چلوولـەی چلـە ئـەڕوێ
خۆزگە ئەمسالیش لە کەناری (زەڵـم)
لە ناو نێرگسدا ڕائەکشام وەک (بەڵـم)
کـە ناچـەی پـۆڕو هـاژەی بـەفـراوان
دەنگـی ئـەدایـە بـەنـدی دووئـاوان
ساتێ لـە ڕادیـۆی شۆڕش دوور ئـەبووم
ڕادیـۆم لـێ بـووە بـە ئـاوازەی (بـووم)
جـاران (جوولـەکـە) خـومی ئـەشـێوا
بـەدرۆ پیاویـان ئـەکـرد بـە کێـوا

ئێســــتا کارخانــــەی درۆ ڕادیۆیـــــە
هیچ کـەس نازانـێ کـە ڕاسـت لـە کوێیـە
تـەبعـی زەمانـەیـش هـیچ ڕاسـتی نـاوێ
پیـاوی ڕاسـت ئـەخـەن بـە بـەنـدوباوێ



دەڵـەک کـە پێستی کـەوڵـی شـاهانە
نـاوی بـە (تـسن) لـە نـاو ناوانـە
نـادر هـەڵـکەوتـوو، بـە ڕەگـەز نیـە
مریـشکیش ڕەشـەو هێلکـەی سـپیە
(فـزونی لـشکر نیایـد بـە کـار)
چـینو ئیتالیـا کـەوتوونـە هـاوار
ئیتالیـا لنگـی دایـەو تـێشـکا
(غاریبالـدی) بـۆ وا ئابـڕووی تکـا؟
ئـەمـە پاداشـی بـێ وەفاییـە
دۆم بـە سـەروپـێ لـە خـۆ باییـە
ئـەمانـە هـەمـوو بـە خواسـتی خوایـە
کێ ئەیگوت (یۆنان) ژوور (ئیتالیا)یـە؟
هەر چی بەرز فڕی کـە کـەوتە خواری
سـەرو گـوێلاکی ئـەشـکێ بـە جـارێ
لـەشـکری ئینگلیـز گـەیـە (بـەنغـازی)
وەک شـایی کـەران کـەوتـە ڕمبـازی
مـن شـەرم نـاوێ بـا هـەر شـایی بـێ
پـلاو خواردنمـان بـا خـۆڕایی بـێ
سـەلکێ چـەوەنـدەر گـەیـە پێنج ئانـە
هێـشتا پـێم ئـەڵـێن بیکـڕە هـەرزانـە
ئـەوی کـە ئـەیخـوا بـە بـادی هـەوا
بـەنـدو باویـشم ئـەخاتـە دوا
گونـای ئـەو نیـە دنیاکـە وایـە
ڕیـایی ڕوتبـەو خـاوەن کـەوایـە

هەر چی دەبینی کوشتەی کورسییە
ئەوی خەڕۆیە بە خۆی برسییە
(گا) لە سەر پشتی (ماسی) وەستاوە
بە کوردی ترەکەلەکی ناوە



کـار کـە بـە زانـست بـۆت نـەچێتەسـەر
بــە هــەرە مــەڕۆ، ڕاســت بیــدەرەبــەر
بــەردێ کــە نــەزان بیخاتــە نــاو ئــاو
دەرنـــایێ بـــە ســـەد عاقـــڵی بـــە نـــاو
شووشـە کـە لـە بـەرد دروسـت ئـەکرێ
خـۆی گـۆڕی بـەرگـەی بـەردێ نـاگرێ
چێــشتی (ئــەنگینــاز) لــە شــاران بــاوە
لێـرە کـەس نـایخوا (کـەرتـەشـی) نـاوە
خــوا کــار بــە عــاقڵ بۆیــە ناسـپێرێ
ئــیش بــە هونــەری خــۆی ئــەژمێـرێ
یــەکــێ خـــەریکــی (ســـکە) لێدانـــە
کیمیاگـــــەرەو موحتـــــاجی نانـــــە
یـەکـێ خزمێکـی لـە دووری ئـەمـرێ
لـە پڕ دەوڵـەتو خـەزنـەی پـێ ئـەبـڕێ
یــەکــێ (تــەحــسیلی عــای) ئــەبینــێ
بـــۆ مـــدیرییێک دۆش دائـــەمێنـــێ
کــە چــی لــەولاوە نــەخوێنــدەوارێ
بــوو بــە قایمقــام چوونــە لای جــارێ
وتیـان: چیـت زیـادە لـە پـوورە ئایـشێ
وتی: حـەوا! خـۆ ئـەو قـەنـدە ناکێـشێ!!
خـــوا شـــیرینیوای بـــە پـــارە داوە
پـــارەدار خـــەڵـــکی ئـــەڕوا بـــەدواوە
ئاڵـــتوون کـــە نـــاوی بـــە زەڕ ئـــەبـــرێ
نـاوی (زەڕ) دێـنی، کـەر بـۆت ئـەزەڕێ
ئـــەمانـــە هـــەمـــوو فلـــسێ نابێنـــێ
پـــارەی پـــارەدار چـــەنـــە ئێـــشێنێ



پیاوی پیر تا بێت گوڕی کەم ئەبێ
داری وشک گڕی وەکوو شەم ئەبێ

ئاوو پیاو مەند مۆن بن، بترسە
سەگی نەهێنگر، ڕامەگرە خرسە

هەندێ ڕووبەڕوو زوبانیان چەورە
کەوتە پاشملە دەم دەمە تەورە

پیاوی دەمهەراش کە لە بەرەوەن
شێری ماڵەوە، ڕێوی دەرەوەن

هەندێ بە هیوان کە هونەر باو بێ
بڵێ کێ دیویە؟ زستان هەتاو بێ

زەمانی مەدی خەیاڵی خاوە
دنیا بە کلکی (گا) ڕاوەستاوە

زەمانی مەهدی خەیاڵی خاوە
تا دەست بە کلکی (گا) ڕاوەستاوە

تا دەست بە کلکی ئەو (گایە) نەگری
ئەگەر شێریش بی لە برسا ئەمری

مانگا بە دزی (کەڵ یەگرت) جاران
ئێستا (کەڵەگا) ئێنن لە شاران

بە (تلی لی‌لی) مانگای بۆ دەبەن
ئەم بێشەرمییە تازە کەوتە بەین

خۆ ئەشیزانین کە نایبەینە گۆڕ
نایخۆین بۆ ئەوە کە زۆرتر بێ زۆر

ئەم پەندە کە لە پێش چاوە
لە ڕاستی هەندێ وەک بەندوباوە

(سەعدی) وتوویە کە بە خوا بەندی
دەروێشی خۆشە، نەک دەوڵەمەندی
لەگەڵ ئەوەیشدا دەوڵەت شیرینە
ئێمە وەک (مێش)و دنیا (هەنگوینە)



پیاو تێر بێو چاو تێر مەندەو بێوەیە
برسێتی ڕەگی هاری پێوەیە

چۆن یەکێ بخواو یەکێ بڕوانێ
برسی یەخەی تێر ئەگرێ بۆ نانی

پیاوی تێر ئاگای لە برسی نییە
بە ماڵ ئەخورێ هیچ ترسی نییە

ناوی خۆی نابوو خادیمی ولات
کە هات بیتەبەر بۆ خۆی تێ ڕۆهات

درۆ، شیعرێکی پیاوی گۆبەندە
تا موبالەغەی تیا بێ پەسەندە

لەبەر ئەوەیە هەموو شاعیرین
کە لە درۆدا هێندە ماهیرین

ئەم (ڕاست و چەپەی) کە ئێستا باوە
خۆزگە ئەمزانی کێ ناوی ناوە؟

دەستی ڕاست بەشی چێشت پێ خواردنە!
دەستی چەپ پیشەی تارات گرتنە!!

ئێستا (چەپ) (ڕاستی) خستۆتە گۆڕێ
ئەشێ وەزیفەی دەستیش بگۆڕێ

ڕەحمەت لە گۆڕی (پیرەوەیسی خلک)
ئەڵێ: (مێ) (نێرە)و نێر مێنگەی شلک

ئەگەر ژێر کەوتەو، ئەگەر هارییە
ئەم کارەساتە لە بێکارییە

پیاو بێ (سەرمایە)، کوشتەی سەرمایە
(با) لەو کونەوە تا بێ سەرمایە



له شەڕی بەدکار پشت بە خوا بەستە
ئەوە مەبەستە، مەترسە، بەستە

هەر چەند گفتوگۆت بێ سەروپا بێ
کەس لێت ناگرێ کە دڵت پا بێ

دڵ پیس بە ئامشۆ (کە دەر) ئەبەستێ
هیچ دەربەست نیە کە دەر ئەبەستێ

بە ئیملای کۆنە (سڕ) و (سەڕ) بران
(سڕ) و (سەر) هەردوو پێکەوە بران

دەستت ببەستێ، دەستت ئەبەستی
بڵندی نەکەی ئەکەویە پەستی

لە ئێران جاران نەمام نەمام بوو
ئێستا سەربەرزیی نەمام تەمام بوو

لە داوی خوداو دەوڵەمەند گەڕێ
وشکو تەڕ جووتو ئاشی ئەگەڕێ

هەور گرماندی ترسنۆک تۆقی
وتم ئۆخەی وا قارچک هەڵتۆقی

بە توانج ئەڵێن دوومەلان زۆڵە
خۆ ئەوی (زۆڵە) خەلات لە کۆڵە

زستان سەرمای خۆی وەرگەڕایەوە
ڕێوییش پێستی خۆی وەرگێڕایەوە

چەشنە(ڕێوییێک) هاتۆتە کایە
ڕێوی (قەمچووغە) پێستی پڕ (کایە)

توولەماریوا ڕووی کردە (کابە
ماری شێخ هومەر، سەگی ئەسحابە



بـــا، مــێخ ســندانی فــڕێدایــە دەر
پــێچو کلوویـــان ئــەهاویـــشتە بــەر
قەساب خۆی دەرکرد بە جوابێکی سارد
کە چی مووی ڕیشی بە ناونیشان نارد
تفی لە ڕووی کرد، پێی‌وت (کەرەتە)
وتی: قــەیناکــا، بــاران ڕەحمــەتــە
کاسە کە چەور بوو ئاو ناگرێتە خۆی
گاجووت تێ ناگاب بلوێژ لێدەی بۆی
دار بــە پــوازی خــۆی ئــەقــەڵێشێ
گوڵی دۆست زیاتر لە بەرد ئەیێشێ
ئــەگــەر ئــەتــەوێ ئــازادەســەر بی
ئەبێ (بەشەددە) و (بێ شەددە) کەڕ بێ
(پواســـون داویـــل) پیـــشەی شـــاعیرە
کــە چـــی زۆر جاهیـــل تیایـــا مـــاهیرە
ئێمــە بــە (مــازوان تێکــشان) پــەستین
بە هیوای ئەوەین (بەسیچکان) هەستین
(شکر) و (شرک) هەردوو لە قاڵبێکن
کە چی بە مەعنا چەند دوور لە یەکن
شیعرو شەرع‌و عەرش کەرەستەیەکە
شیر لەم دووانە هەڵبەستەیەکە
هــەر چیــت ئــەدەنــێ نــاوی کــەرەمــە
تـــەنهـــا جنێـــوە منـــەتی کـــەمـــە
کــە مردیــت هیچــت لــەگــەڵا نایــە
گوتــاە هـــاودەمتـــە، ئــەو بــەوەفایــە



هونەر ئەوەتە شەخست خۆش بوێ
بو نانە (دونان) ڕەدوو ئەکەوێ
خۆهەڵکێشانە بە کردەوەی حیز
چاولێکەریە پێی دەڵێن خەرمیز
ئەمرۆ پێت دەڵێن لە دەورت گەڕێم
پێت هەڵخلیسکا ئەڵێن لادە لێم
من پیاوی وەهام دیوەو بیستووە
لە تەنگانەدا دۆستی ویستووە
جاران ئەیانگوت کە نەخوێندەوار
لێک ناداتەوە ئازایەو بەکار
ئێستا خوێندەوار ئازاو جەسوورە
بە هۆی ئەوەو میللەت ڕووسوورە
لە قوبەی بەرزی سەر ولاتەوە
کردەی مەردیە دەنگ دەداتەوە
ئەو کەسەی کەسەو بەفریا ڕەسە
کەسیش نەزانێ زەوقێکە بەسە
بەدخوویش خەیاڵی داوەتە زیان
ئەڵێ (غرقش کن ما هم در میان)
دەستی بۆ کەڵکی خەڵک درێژ نەبێ
یاخوا برینی قەت ساڕێژ نەبێ
ئەگەر پێش ئەوەی کە دەچێتە خاک
خاک بێ ئەبێتە مەردێکی بێ باک



ئەو بێ دەستندەی کە ماڵ نەبەخشێ
کەماڵی کەمە، زوو پێی ئەلەخشێ
بە ماڵ دڵ خۆش کە لە ڕێی خودادا
(مێو) تا نەیبڕی بەری زۆر نادا
بە ماڵدڵ خۆش کە، نەک بە ماڵ دڵخۆش
مەچۆرە (کەعبە)، بچۆ سەر نەخۆش
دانا وتوویە: ماڵ چڵکی دەستە
بە ناوی چاکیت پشت بەستە، بەستە
ئەو کەسەی بەسەر نەفسیا زاڵە
بۆ دێوی نەفسی ڕۆستەمی زاڵە
دەولەت بە دڵی خۆشەوە خۆشە
ئەگینە بارت قورس ئەکا بۆشە
حوشتر لە ڕەنجا بۆیە ناسرەوێ
بەو زل خۆرتییە دوای (کەڕ) ئەکەوێ
دەلاڵ سەندووقی ئەفرۆشت لە بازاڕ
بە هەراج هەرا بۆی کەوتبوە جاڕ
ئەیگوت: ناوی ئەم سەندووقە جوانە
بیکڕی ونەیکڕی هەر پەشیمانە
ئەوە مەرامی ژنو منداڵە
بوونو نەبوونی عەیشی پێ تاڵە
بێ ژنو ماڵیو دوژمنی شەیتان
حەزرەتی عیسای بردە ئاسمان



کار تا نەشێوێ ناگاتە سامان
(کەوا) نەیکێشی ناگاتە دامان
نەجوولێیتەوە خوێن نایەتە لەش
تەقەڵلا نەدەی نادرێتێ بەش
(ضرب‌المثل)ە بە زوبانی ئێران
مەپرسە و لێدە لە تیپی ڕەندان
(غەواس) کە ترسی مەرگی بێتە بەر
ناچێتە دەریاو ناگاتە گەوهەر
هەر چی دێتە پێش حوکمی قەدەرە
لە ڕاستی قەدەرخەڵک بێ (بەسەرە)
مەنیشە بە هۆی چۆن و چەندەوە
باز لە لوارا دێتە بەندەوە
جاران بۆ مەسنەد بازیان هەڵئەدا
زۆر جار ئەکەوتە سەر پیاوی گەدا
ئێستا ئەو کەسەی قودرەت ئەنوێنێ
بە هەڵمەت بەختی دوژمن ئەنوێنێ
هەندێ لە نادر بۆی هەڵدەکەوێ
بە پاش قول دێوی زوو بۆ دەکەوێ
خوا فەرمووی هەندێ چشت ئەکەرهێنی
دوایێدەبینی کە خێر دەبینی



هونەر ئەوەیە بەدت خۆش بوێ
خۆشەویستی چاک بەر تۆ ناکەوێ
خوا چاوی بەدبین کوێرکا بە تەواو
هونەری کەسی نایەتە بەرچاو
تا لە دنیادای موحتاجی ماڵی
بێ ماڵ لای عەوام، وەک بێ کەماڵی
بیشزانی پاش خۆت دوژمنت ئەیبا
تۆ کۆی کەرەوە ماڵ مەدە بە با
بەلام ستەمە ماڵ لەگەڵ کەماڵ
تۆ مەکەوەرە دووی ئەمری مەحاڵ
ئەگەر ئەتەوێ کە دەوڵەمەند بی
ئەبێ بە کردە عەوام پەسەند بی
خوا نەوعێ دەوڵەت ئەدا بە نادان
سەد پیاوی نادان تیا دەبێ حەیران
بۆ هەندێ کەرەم ئەبێ بە دۆستی
هەندێ بە پاروو دەمی ئەبەستی
ئەگەر بە کەرەم دڵیش ڕانەگری
وامەکە خەڵکی لە قسەت بگری
خەڵکی لە قسەی ڕەقت سەخڵەتە
گەر زوبان بێڵێ سەرتا ڕەحەتە
هەموو کەسێ خۆی بە پیاو ئەزانێ
خەڵکی مەشکێنە بۆ پارووە نانێ



(گولـەبـەڕۆژە) مـەجـزووبی عـەشـقە
ڕووی هـەر لـە ڕۆژە، ئـەمـە سـەرمـەشـقە
نـەک (فرفرۆکـە) بـە هـەمـوو بایـە
ئـەسـووڕێتەوە ڕەنجـی بـە بایـە
(مەقەست) هـەرکەسێ ئەموستی پیاکا
دەم دەکاتـەوە، فـەرقـی کـەس ناکـا
پێم گـوت: چـی هـەیـە؟ بیـڵێ بیـزانم
وتی: نـازانم ڕەحـەتی گیـانم
کـە تـۆ نـەتـوێرا دەم بکـەیـەوە
مـەچۆرە جـەنگـی (جـەم)و (کـەی)یـەوە
تۆ لە چاو خەڵکا وەک نێرکی کاردووی
ئـەم دونیایـەیـان پـێ نـەسـپاردووی
ئـەگـەر ئـەتـەوێ دایم لـە پـێش بی
ئـەبێ بـە چـەپڵە (هـەلهـەلـە) کـێش بی
بـەم شـارە ئـەڵـێن شـاری (ڕەشـەبـا)
ئاگـات لـێ نـەبـێ کـڵاوت ئـەبـا
بـا وجـود ئێـستا کـڵاو نـەمـاوە
لای (ئـەڵـمودەکـان) سـەرڕووتی بـاوە
جاران سەری ڕووت ئەخرایە زێی کـەر
ئێـستا سـەری ڕووت بـووە بـە هونـەر
خـوا عاقیبـەتمـان بـە خێـر بگێـڕێ
وابـێ پیـاو خـراپ بـە کـەس نـەوێـرێ



هەندێ ئیش هەیە ناکرێ سەر بەخۆ
لێکــیبــدەوە ئینجــا تــێهــەڵــچۆ
خۆت حەوا مەدە لە سەر هەیوانێ
شوێن پێ نەزانێ، کوێر، پێ دانانێ
کە زانی پیاو شانس یاریدەی ئەدا
وا چاکە فرسەت لە دەست بەرنەدا
بەلام نەک هەروا بە هەڕۆمەڕۆ
بە تەفرەی خەڵکی زوو ببی خەڕۆ
هەر چی بۆ بەرزیی وەتەن تێکۆشێ
لیباسی فەخری تەئریخ ئەپۆشێ
ماڵو سەروەتو شاهی فانییە
هەر ناوی چاکە، جاویدانییە
هەنگ کە شیرینی پێ دروست ئەکرێ
هاتە پێوەدان ئەو بۆ خۆی دەمرێ
بەوە مەنازە کەوتیە سەرەوە
وێرانەی وەتەن ئاوا کەرەوە
کە خەڵکی زانی بۆ ئەو هەوڵ ئەدەی
ئەڵێ سەروماڵ بۆ تۆ، فەرموو، دەی
بەلام کە زانی تۆ بۆ خۆت دەوێ
ئەڵێ با بڕوا بەلای لێ کەوێ
زۆر خۆشە کەسێک کە پێشەوا بێ
بۆ قەومەکەی خۆی وەک چاوک وابێ



هــەوای دانــەیــە مــورغ ئــەخاتــە داو
ســەودای نــاوو داو پیــاو ئــەخاتــە نــاو
ئــەگینــە کــەســێ کــە خــوا بیــداتێ
خــۆی گرتــە کــەنــار پــەلــی ناگاتــێ
جاران بۆ ماسی زۆر قتگ تەڕ ئەبوو
چەند تۆڕ ئەپچڕا، چەند داو بەر ئەبوو
ئێستا سەد ماسی ئەگرن تەڕ نابن
بۆ ڕەسمی ماسیش تووشی گەڕ نابن
هــەمــووی بــە هاتە گــەردشــی دونیــا
نــەک بــە زانــستو بــە ڕەنجــی تــەنیــا
هــەیــە لــە پــڕێ ئــەبــێ بــە کــوڕێ
هــەیــە هــەوڵ ئــەدا و پــەلی ئــەپچــڕێ
(حەمە ساڵح ئاغای قزڵجە)یشمان مرد
هــەر ئــەو بــوو لــەگــەڵ دنیــا دەریــەبــرد
ئــەگــەر بمایــە بــۆ ئــەم زەمانــە
ئــەســا ئــەتــزانی ســاحیب عینوانــە
کاتــێ بــارانی نیــسان ئــەبــارێ
شــەلاقــەی لــەگــەڵ ئــەڕژێتــە خــوارێ
گــەزۆو شــەلاقــە بــۆ جــۆ ئــەبــاری
ئێــستا دەم تاڵــن بــە دەردی کــاری
ئەمساڵ (هیتلەر)و (هامان)یان ئەکوشت
بۆیــە وا بــەردیــان لــێ گرتوونــە مــشت
بــەلام بــەکێــشن جــە فایــان لــێ دێ
ئــەڵێن ئــەلــبەتــە ڕۆژێ ئێمــەیــش دێ



تـا هـەتـاو نـەبـێ، سـێبەر نـابینی
تـا بـاران نـەبـێ، دەغـڵ ناچێنـێ
کـرم کـەڕەگـی درەخـتی خـواردی
پیـشەت ئـەبێتـە هـەناسـەسـاردی
ڕۆژ کچەو مانگیش بە کوڕ ناوئەبرێ
کە چی کوڕ لە کچ ڕووناکی دەگرێ
زلی بـێخونـەر کـار ناباتـە سـەر
ئـاگر بە فیتنەی (کورتێک) بێتە گەڕ
گـورگ دوعـا ئەکـا یـا ڕەبی تـەم بێ
تەم و دۆمان بی، ڕان لە گوێ چەم بێ
مـن چـی دەڵـێمو تـەنبـوورەکـەم چـی
ئاهـەنگـی دنیـا کـەوتۆتـە کـەچـی
عـادەتـە وشـکو تـەڕ تێکـەڵ کـردن
گۆڕانێیکـە بـە کۆمـەڵ مـردن
سەد زینـهار دۆستی بێ بایەخ مەگرە
تـورکو دۆسـتی ئـاوو ئـاگرە
(بـسمارک) وتوویـە (حـەق هـی غالـبە)
لـە سیاسـەتـدا ئـەمـە قالـبە
بـا وجـود ئـەمـە پیـشەی دنیایـە
دیـارە لای خـودا کـە حـەق بالایـە
پیـاو ئـاخریین بـێو لـە هۆشـا وریـا
بە گۆشەی تەنیا، نەک کوشتەی دنیا
وەتـەن پـەروەرم بـە خـودای بێ بـاک
کوێرە چیت ئەوێ؟ چاوێکی ڕووناک



هـاوین هاتـەوە بـۆ مـار و دووپـشک
(شارەزوور) بووەوە بە پووشێکی وشـک
های لەو گولانەی لە گۆی (زەلم) ئەمدی
ئەویش خەوێ بوو، دیم وەیا نەمدی
هاوینـەو کـەچـی چـەرخ وا دەسـووڕێ
وەک ئـاوو ڕەنگـی بـەهـار ئـەگـۆڕێ
ڕەشـەبـای ئـەمـساڵ لێـرە دوودەنگـە
هێشتا نـەمـدیوە مـن بـای بـەم ڕەنگـە
بە ئاگری شـەڕی (ڕووس) و (ئـەڵـەمان)
تـــاوی ســـە«دووە زەوی‌و ئاسمـــان
منداڵ بووم لەگەڵ دووکەس شەڕیەکرد
(دگلدانـە) مـان ئـەخوێنـد دەست و بـرد
نینۆکمان لەیەک ئەسوو، تێک هەڵچن
بـەڵـکوو لـە یـەکتـر بـبن بـە دوژمـن
ئێـستایش هـەر دەڵـێم وا (دگلدانـە)
ئینـشاڵلا نـەگبـەت بـۆ (ئـەڵـەمانـە)
هـەر چـی ئـەوەنـدە بـە خـۆی بخـوڕێ
هـەر بـە هێـزی خـۆی پـەتی ئـەپچـڕێ
هـەمـوو قوماشـێ بـە تـەنکـی ئـەدڕێ
تـەنهـا ئینـسانی ئـەستوور ئـەپچـڕێ
ئێـستا ئـەسـبابی شـەڕی تـەواوە
دەمێکە (ڕووس) خـۆی لـێ مـەڵاس داوە



هەر چەند کە ڕادیۆ دەنگ ئەداتەوە
گوێ ئەگرم بۆ ڕاست بە ئاواتەوە
یارەبی ماڵی درۆیان شێوێ
درۆی‌وا دەکەن ئەوەندە کێوێ
بۆیە لە درۆ ناپەرموونەوە
چونکو ڕووبەڕووی یەک نابنەوە
لەمەیشا پەنجەی جوولەکەی تیایە
خومی شێواوە، کەوتۆنە کایە
هەرچەند قەلەکەی (پەروین) ئەقرێنێ
لە ڕادیۆ ڕاستتر قسەی بۆ دێنێ
پشیلەکەی بەرەو قیبلە چاو بشوا
میوانێکی دێ کەروبار لەدوا
لە تێبینیندا وەک (ئینگلیز)وایە
دوو جار نەپژمێ ناچێتە کایە
بەڵام کابراکەی دۆستی (ئەڵەمان)
بێ سەبرو بێ جەخت ئەچێتە مەیدان
سەگی هار چلەی تەواو بوو ئەمرێ
هەرچی تووشی هات بۆیە ئەیگرێ
هەزارو نۆسەد چلی تەواو کرد
لە چلو یەکدا هاکا (هیتلەر) مرد
بەخوا تاقەتی بەشەر نەماوە
دنیای گوڵ‌گوڵی کرد ئەم خوێناوە



کــەوش دڕا جــاریٚ پینــە ئــەکــریٚ
زۆر پینــە کــرا پێــی پیــاو ئــەگــری
پــێلاو قــەبــری تــەنــگ بــە ئــازارن
دەست تەنگ‌و ڕووگرژ هەردوو بیٚ کارن
ســەد بــزن ســواری گــامێش ئــەکــریٚ
ئینجـــا پـــێلاوی پێمـــان ئـــەدرویٚ
ئای پیٚ خاوسی چەنـد باش بـوو جـاران
نە (کەرەتە) بوو، نـە کـەوش هـەلکێشان
ئیـستا موحتـاجی (کـەرەتـە)یـن هـەمـوو
بــەلــکو پێلاومــان بــۆ هــەلکێــشیٚ زوو
پیـاوی بــە تــەمکــین ڕەنجـی بـە بـادە
لــە اوغــەی میــسر (جــەواد) (گــەواد)ە
لـە حیجـاز نـاوی نـامووس (پـەشـە)یـە
خــاتوو ئایــشێش لای ئێمــە (وەشــە)یــە
پــاروو گیرایــە قــورگ چــاری ئــاوە
ئــاو لـــە بـــین گـــیرا کفـــنی جـــاوە
هـیچ کـەس لـە پـڕیٚ نـەبـوە بـە کـوڕیٚ
تـا دەبــیٚ بــە پیـاو سـەد کفـن ئـەدڕیٚ
ئــەوەی لــە ســەر کــار پیــاوی دانابــیٚ
ئــەبــیٚ ســەرکــاری پیــاوی دانــا بــیٚ
ئـەگـەر بپرسـی دوژمـن لالّ ئـەکـەی
ئـەگـەر بترسـی (عـەدو) زالّ ئـەکـەی
لێـــدە لـــە ســـەفی ڕەنـــدان تێـــەڕە
چـارەی پێشکەوتـن تـەشـقەلـە و گـەڕە



سۆفی ئەڵێ جێم لە عەرش و قورشە
هیچ کەس بە دۆی خۆی نایەژێ ترشە

ڕۆژێ سوفییەو ڕۆژێ دەرویشە
ئاخوڕی نییە، وەک سنگ هەڵکێشە

خۆی پێوا وتی: باڵا شەش گەزم
سەیرم کەن ئەزم وا هەڵئەبەزم

کە هاژەی تەرزەی لە پڕ هاتە گوێ
بۆ کون ئەگەڕا کە خۆی تێ کوتێ

پیاو ئەو پیاوەیە خۆی لێ نەگۆڕێ
مریشک کە تەڕا، هێلکەی ئەدۆڕێ

ئەو پارانەیان‌دا بە تەلغزاف
ئابڕووی خۆیان برد بە لاف و گەزاف

ڕۆژێ خەڵک ئەکەن بە (ئینوزیاد)
هەزار سوێند ئەخۆن ئەچن بۆ جیهاد

ئەگەر کەفارەت لە سوێند بدرێ
گەنمێکی زۆر بە فەقیر ئەبرێ

سبەینێ کە دەور گۆڕا هەر ئەوان
بە (ماسکەوە) ئەکەونە مەیدان

هەر چی هەڵدەسێ ناوی ڕەئیسە
نازانن ئەوە پشتێن گوریسە

خۆزگە ئەوکەسەی کە نەناسراوە
دەخڵی نەئەبوو بەسەر سەراوە



ئەڵێن تا سەر بێ، ڕزقی لە دوایە
ئەمە قەولێکە باوەڕ بە خوایە
بەڵام ئاشکرا بە چاو ئەبینرێ
لە گرانیدا زۆر کەس ئەمرێ
ڕزق لە ئاسمان نایەتە زەوی
شەرتی ئەمەیە تۆ شوێنی کەوی
بەڵام نە وەک سواڵ لەم ماڵو لەو ماڵ
بە ڕەنجی شانو کەسپێکی حەلاڵ
با وجود کاری خوا کەس نایزانێ
مەرد ئەخاتە لای نامەرد بۆ نانێ
نەمدی پیاوێکی پیاو دەولەمەند بێ
پێی پیاو هەمیشە ئەبێ لە بەند بێ
ئەوەی کە نایخوا دەولەتی زۆرە
(ماڵی خۆ نەخۆر بۆ چەکمەبۆرە)
بە خوا ئەمانە داخی دڵمانە
(نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە)
ڕەشەبا کەیفی شەوی لێ تێکدام
ناچار وەک قازی کوێر شەو بە تەنیام
داخەکەم شووتیو کاڵەکم تەپی
ترۆزی کۆن بوو، سیس بووە ڕەپی
لە سەر هیچ حاڵی دنیا نامێنێ
گاهێ بولبول، گاه بایەقوش ئەخوێنێ



لــە (بــاحوورا)دا زۆر کــەسمــان پێــشا
(گــەلاوێــژ) زوو کــە، وەرە لــە پێشا
خـاوەن (گـەلاوێژ) کـەوتۆتـە نـاو تـەم
وا چاکــە ڕۆژێ بێیــەینــە ســەر چــەم
هیچ کەس نایەوێ کـەس لێی زیـاتر بـێ
هـەر بـاوک ئـەڵـێ کـوڕم چـاکتر بـێ
خورمـا گـەنانـە و گـەرمـەی گـەرمایـە
بــاقڵ گـــرانییش مــەرگــی لــە دوایــە
گرانیــی ئێمــە هــەو بــەهــەوەســە
گــەس نییــە بــڵێ: ئیحتیکــار بــەســە
ئـەڵـێن نـان و ماسـت ئـەدەن بـە پـیران
دوای ئـــەوە ئایـــان ئـــەهێـــڵنە بـــیران
هــی وامــان هـەیـە بـەو نـانو ماسـتە
ڕازییـــە بـــەڵام نایـــدەنـــێ ڕاســـتە
قــەدری عافییــەت کاتــێ ئــەزانــین
منــداڵ هاوارکــا: برســین بــێ نــانین
هێنـد بـە نـاز نـاوی (نـازی)مـان ئـەبـرد
بـە سـوێندی درۆ جیهادمـان ئـەکـرد
بــە بــەدنمــەکــی کــەوتینــە ڕۆژێ
پــەشیمانمان پــەنجـەی ئـەگـرۆژێ
خـوا بکـا بـەمـەنـدە لـە سـەرمـان لاچـێ
نەک (تـەورداسـی) شـەڕ هـەڵمان پاچـێ



کاتێ شیرازەی کتێبێ شێوا
هەر پەڕەیێکی بۆ شوێنێ ئەڕوا
چەند جۆگە ئاوێ یەکتر بگرێ
(سەددی چین)یش بێ، بەری ناگرێ
کە لغاوت دا بە دەم ئەسپەوە
سەردەنێ بە ڕێی چاڵ و کۆسپەوە
تۆ ڕێ لە بەدکار ببەستە، بەستە
ئەڵێن خەر بەستە، خاوەندی ڕەستە
بۆ ڕێی پیاوەتی بەخشین مەبەستە
بەڵێ دەمی سەگ لە لوقمە بەستە
تۆ ئەخۆی برسی چاوی تێوەیە
برسێتی ڕەگی هاریی پێوەیە
کە دوو کەڵەشێر هاتنە شەڕ کردن
بۆ منداڵێکیش ئاسانە گرتن
بەردی سەرشکێن کە لە یەک بدرێن
بەرگەی یەک ناگرن، زوو هەڵئەوەرێن
ئەمانە پەندی قەومی خۆش بەختە
نەگبەت ڕووی کردە قەومێک سەر سەختە
کە خوا بیەوێ نەخۆشێ بمرێ
(ئەفلاتوون) بێنە چاری پێ ناکرێ
کە بەختت نەبێ ئەبێ قوڕ پێوی
هەر بڵێ ڕەحمەت لەوەی کە ڕویی



ترشیت خوارد، دانت ئاڵ ئەبێتەوە
کە گریای چاوت کاڵ ئەبێتەوە

ریس چەوتی بادەن ئەبێ بە خوری
قنگت تەڕ نەبی ماسی ناگری

ناشی تەشویی خۆی دەمەسوو دەکا
ریاکار مەدحی رووبەڕوو دەکا

دۆستت بەڕەوڕوو قسەی ڕەق ئەکا
پاش ملە پیاوت لە سەر شەق ئەکا

ئەوکەسەی لە سەر سفرە دۆستتە
پاش ملە چاوی وا لە پۆستتە

ئەوانەی فێری درۆو غەیبەتن
روویان مەدەرێ شوومو نەگبەتی

پیاوی‌وام دیوە بۆ نانو کەباب
کەوتۆتە زەمی مامو خاڵو باب

ئەمە شوورەیی و حەیا بردنە
چاری ئەمانە هەر دەرکردنە

پشیلەی بێ‌عار بەشی فسەیە
کوتەکیش خەرجی هەندێ قسەیە

سەد شوکور ئێستا (پۆکەر) لە ناوە
ماوەی غەیبەتی مەجلیس نەماوە



نرخی شت سەرکەوت زۆر گرانییە
هەر ڕۆحە بۆ شەڕ، کە بەهای نییە
کوشتاری بەشەر لە وزە دەرچوو
(سەپان) درویتەی وا بۆ ناکرێ زوو
(مانیاتریمە)یە (هیتلەر) ئەیکا
ئەم هەموو خەڵکە خۆی بە کوشت ئەدا
ئەگینە مردن هێندە سووک نییە
شەڕ تەقەی شایی سەر ڕێی بووک نییە
ئێستا بە ملیۆن کوشتار ئەژمێرن
وا دەردەکەوێ لە ژیان تێرن
لە لایێکەوە فەننی ئەڵەمان
بووە بە سەرمایەی حیرەتی جیهان
کە چی هەر وەک کەڕ لێیان ئەخورێ
بە بۆمبای دوژمن جەرگیان ئەبڕێ
هەر دینی ئیسلام ڕێی سەلامەتیە
بۆ هەموو بەشەر جێی هیدایەتە
خوا فەرموویەتی بە جینسی بەشەر
(خۆتان مەخەنە ناو تەهلوکەی شەڕ)
ئاینی (نازی)و مەسلەکی (هیتلەر)
ئەمەیە، کە چی خۆ دەکەن بە کەر
لەم دووریشەوە ڕۆح بەپەروازن
بە دەستە چیلکەی ناوی ئەنازن



هـەر خزمـە، کـە تـۆ ئـەخوێنێتـەوە
ئـاو ئـەڕوا، زیخـە ئـەمێنێتـەوە

پیـاوت نـارد بـۆ ئیش قـووەتی بـەرێ
سـەعـات قورمیشی نـەکـەی ناگـەڕێ

بۆیـە ئـەم قـەومـە ئیشی لـە پاشـە
بـۆ هـەمـوو کـارێ (دەوەن بـە ئاشـە)

ئـەگـەر پـایزان تـۆ (سـەد) ببەسـتی
لـە بـەهارانـدا لـە لافـاو ڕەسـتی

خۆ ئەگەر بڵێی: دووگی خۆم خۆش بێ
ڕۆژێکت لێ دێ کە گورگت تووش بێ

هـەنـدێ بـۆ (نـازی) کـەوتوونـە داوا
(سـەی کونـەماسـیو پاسـی جرتـاوا)

لە جێیێک بنوو ئاو هات تەڕ نەبی
سـەودایـی بکـە، تووشـی شـەڕ نـەبی

حەرام خـۆریش بیو بە بەشێکی کەم
شـلەبخـۆریو بچیـە جـەهـەنـەم!!

ئـەگـەر ئـەکوژرییـت بـۆ نیگـارێ بـێ
ئـەگـەر ئـەگیرییـت بـا بـۆ شـارێ بـێ

ئـەگـەر قازانجت هـەر بـۆ خـۆت بـوێ
ناشـارییتەوە خـەڵـکت لـێ ئـەزێ

تـەلـەسمـی جـامی چـڵکلیلـەیـە
هـەر چـی چـەوت نـەبـێ دیـارە خلـەیـە!



سەیر کەن یاران! خوا هەر ئەو خوایە
کە ئێستا بزن وا سواری گایە
یاخوا قەت (گەدا) موعتەبەر نەبێ
فەقیرو هەژار تووشی شەڕ نەبێ
بە خۆوە نەدیو بوو بە زەعیم
ئەکوژێو ئەبڕێ بە بێ ترس‌و بیم
دوێ شەو لە خەوما پادشایە بووم
کاتێکم زانی وەک گەدایە بووم
شەهەنشا یەعنی پادشای شاهان
سیفەتی خوایە نابێ بە عینوان
ئەم ناوە تا سەر بۆ کەس نامێنێ
ئاوێنەی دەوران عەکسی ئەنوێنێ
کە لە جێگەی بەرز بکەویە خوارێ
تەوژمی بەرزی تێکت ئەهارێ
بەلام لە نزمی ئازارت نابێ
پیاو بەرز نافڕێ هۆشی لە لا بێ
(سەددی ئەسکەندەر) ئەلێن ڕووخاوە
(یاجووج‌و ماجووج) بۆیە هەستاوە
جەجالیش سواری کەری خۆی بووە
بۆ خورما هێندە خەلکی لە دووە
سا خوایە (عیسای) بۆ بنێرە خوارێ
بەلکو ئەم شەڕە هەلسێ بە جارێ



خۆزگە ئەمزانی ئەم ڕەشەبایە
کە بە هاوین دێت بۆچ وا گەرمایە
کە چی زستانان کە ڕەشەبا هات
سەرماو بەستەڵەک ئەخاتە ولات
های شیمال خۆت و شەماڵت بژین
فێنکی دڵە، شنەت بە هاوین
شەماڵ خەرمانی پێ شەن ئەکرێ
ڕەشەبا کەڵکی هیچمان ناگرێ
تۆزی ڕەشەبا چاوی کوێر کردووین
شەو لە سەربانان پێخەفی بردووین
ئەم ڕەشەبایە لە گەردشایە
نازانین چیتر دێنێتە کایە؟
بە هەموو بایێک ئەلەرینەوە
بە هەر فیکەیێک ئەگەڕینەوە
ئەم حاڵە هەموو لە ناچارییە
ماڵەوماڵ گەڕان لە بێکارییە
ئەوی ئیشێکی بۆ خۆی پێکهانی
ناپەرژێتە سەر واتەی دیوانی
ئەگەر کاسبی بکەوێتە ناو
ئەوسایە میی ئەگەڕێ بۆ پیاو
ئێستا دووکاندار فرۆختی نییە
لە دووی چاوەشیی ئیشغال شەقییە
سا با ئیدارەی ماڵی دەست کەوێ
بزانە توخنی سزا ئەکەوێ
خۆزگە دەستوورێک ئەخرایە ناو
پیاو بۆ ئیش ئەبوو نەوەک ئیش بو پیاو



چەرخ هەر ئەو چەرخە، کە چەرخی سووڕاند
دەنگی شەیپووری ڕەزاشای خەفاند
ئێستا شەیپووری شاپوور ئەخوڕێ
بە بانووی میسری چرای ئەگرێ
ئەگەر هات ئەویش بڵێ شەهەنشام
لێی قەبووڵ ناکا قەمارەی عەوام
دیکتاتۆری ڕووی لە نەهاتییە
ئێستا دەور دەوریدیموقراتییە
دنیاکەن فانی کاروانسەرای ڕەنگ
نیوەی دڵشادەو ئەو نیوەی دڵتەنگ
گاهێ پشت بە زین، گاهێ زین بە پشت
کاتێ لنگەوقووچ، گا لە سەر تەنیشت
گا ئەچیتە بەست ڕێگەی پلیکان
گایی ڕادارە، ڕێگای مەریوان
ئاهێکە ڕشتەی ستەمکار ئەبڕێ
هەودا کە توندت کێشا ئەپچڕێ
ئەڵێن هار ئەمرێ بە خۆڵی مردوو
بەسەر (هیتلەرا) بیبێژنەوە زوو
بەڵکوو خوا بیکا ئەوی پێ بمرێ
ئەمەندە لاقی بەندەی خوا نەگرێ
بە هۆی ئەوەوە هێندە کوژراوە
قەبرستان جێگای مردووی نەماوە



وردە مەئمووران بۆ زەممی مەعاش
بە هۆی هیواوە کەوتوونە تەلاش
تا تریاک دینن بۆ ماران گەستوو
بەدەم ئێشەوە ئەوان ئەڵێن دوو
نە تەرەسازەو نە تەرەماشە
شەرەگەرەکەو دەوەن بەئاشە
تا ڕەوگ و ڕانمان دوای نەبڕایەوە
ڕێگای کوێستانمان بۆ نەکرایەوە
خالانەکەیە (مەمرە تا بەهار
کورتانی تازەت بۆ دینم لە شار)
ئەگەر خوا ئەکا (هیتلەر) نامێنێ
پایزیش نەشئەی بەهار ئەنوێنێ
(ئیتالیا) کە وەک فس‌فس پاڵەوان
خۆی هەڵکردبوو، هاتبووە مەیدان
ڕۆژێکی لێ دێ بڵێن یۆنان هات
بە گور گەڵۆقە دەرچێ لە وڵات
ئەوسا بە گورجی ڕایان ئەفرێنن
کەرسمەی (مۆسۆلینی) دەردینن
ئەگەر (هیتلەر)یش وەک ئەوی لێ بێ
(یوم الموعود)یش بۆ جوولەکە بێ
زوڵم و زۆرداری تا سەر نامێنێ
خوا تۆڵەی بزنی بێ‌شاخ ئەسێنێ
خۆزگە بە شەکری هەرزان، ڕەمەزان
تێر مردەبامان ئەخوارد، وەک جاران



پێـی نـاوێ پـایز ڕەنگـی خـەزان کـا
لـە نـەونـەمامـان گـەڵاڕێـزان کـا
فـەرتـەنـەی (هیتلـەر) کـارێکیوای کـرد
وەک گـەڵای داران لاوی لـەنـاو بـرد
جـەهـەنمێکـە (هیتلـەر)ی بـەلیـد
بانگـە بانگیـە بـە (هـل مـن مزیـد)؟
لـەوسـاوە دنیـا کـە دانـراوە
هێـشتا ئـەمـەنـدەی تیـا نـەکـوژراوە
(ز)ی نـازی نوقتـەی لـە سـەر لاچـووە
بۆیـە ڕووی جیهـان ئـاگری گرتـووە
ڕۆژێکیـان لـێ دێ قـەومـی ئـەڵـەمـان
بـێنـاز بکـەونـە نـووزەی (الامـان)
بـەلام بـێعـارن، وەک جـاری پێـشوو
تێهـەڵـدەچنـەوە دیـسان زوو بـە زوو
ئەگەر کەلبەی گورگ نەشکێنی بە دار
دەسـت هـەڵـناگرێ لـە مـەڕی هـەژار
هـەنـدێ لـە لاوە بـە نـووزەی (نـازی)
خۆیـان ئـەخـەنـە بـەر لیـسی قـازی
ئـەوەی کـە بـۆ پـاس چـووە (جـرتاوە)
لـە (کونـەماسـی) چـی تـێگیراوە
گاهـێ (تـورکیزم) گاهـێ (هیتلـەر)ی
(ئـاتوب ئیتملـی، بویلـە ئیتلـەری)



خوا، هەندێ کەسی بۆ شەڕ داناوە
(زرێ)ی گوتاهی لە بەر کراوە
لە ئاه و ناڵەی هەزار ناترسێ
لە پرسیاری مەحشەر ناپرسێ
خراپە ئەکا لەگەڵ پیاوچاکا
لای‌وای دوعا کاری لێ ناکا
کە چی لەپڕێ، ئاهێ ئەگرێ
زریێ ئەدڕی و ئاهی ئەبڕێ
ئەتلێتەوە، وەک ماری بە گێنگڵ
بە سەد قێزوبێزئەیخەنە ژێر گڵ
مەڕنەمووکەکان بە گورزی گران
بەردەینە وێزەی ئەیخەنە ئامان
هاکا (هیتلەر)یش وەک (ئەسفەندیار)
تیری ڕۆستەمی لێ کەوتە ڕووی کار
چاوی غروری کوێر بوو بە پەیکان
بە کوێری گەڕا یاوەری شەیتان
ئێستا نازانێ خوین ڕێژی چییە؟
چونگو خۆی ژنو منداڵی نییە
ئەگەر کەسێکی خۆی بکوژرایە
نەدەبوە باعیس بۆ ئەم هەرایە
وابە نای ناحەق جیهانی شێواند
هیچیشی بۆ خۆی لێ هەڵنەکڕاند
هێندە سەری خۆی لێ دا بە بەردا
کاتێکت زانی دەستی لێ بەردا
چرایە لە لای خواوە ئەسووتێ
کە فووی لێ کرا، کەپوو[1] ئەسووتێ

---

١. کەپوو: لووت.

هـــەوای زســـتانە، (خومـــان) بـــەتاڵـــە
هـــەمـــوو کـــەماڵـــێ دوایـــی زەواڵـــە
خـــوا بیـــداو وێنـــەی ئـــەســـتێرە هـــەڵات
بەدکار بە هەڵات، ڕووزەرد بـوو هـەڵات
لـــەم قوبـــەیـــەدا ئـــەوی بمێنـــێ
دەنگێکـــی خۆشـــە، گـــوێ ئـــەزرنگێنـــێ
کاتـێ ئـەتبـەنـە (گـردەکـەی سـەیـوان)
ئەتخەنە ژێـر خـاک بـە دەنگـی قورئـان
شـــەرت وایـــە بـــە دڵ ڕەحمـــەت بنێـــرن
نـە وەک بـە جنێـو هـەڵـتپـەسێرن
پیـــاوی بـــەدزویـــان، زوبانیـــان بـــڕی
بـە پـەڕەی قورئـان خوێنـەکـەی سـڕی
تفیـــان ئـــەکـــردە ســـیمای بـــێعـــارێ
ئـەیگـوت: ڕەحمـەتـە، بـاران ئـەبـارێ
ئـەڵـێن ئـەژدەهـا هـەڵـی ئـەکێشن
ئەم خەڵکەیش لە دەست (هیتلەر) بە ئێشن
خۆزگـە ئـەویـشیان وا هـەڵـدەکێـشا
بـــەڵام لـــە پێـــشدا، دانیـــان ئـــەکێـــشا
کاروانی حوشتر ئەکشان بە بێدەنگ
کـەرێکـی دیتریـان بووبـوو بـە پێشەنـگ
وتم: (هیتلـەر)ە کـەوتـە پـێش ئـەڵـمان
کـەرەکـە تونـد بـوو لـێم هاتـە زوبـان
وتی: خـــوا نـــەکـــا بـــبم بـــە (هیتلـــەر)
وەک ئـەو خـوا بمکـا بـە ئاڵـەتی شـەڕ



ڕێــوی پێــستی خـــۆی وەرگێڕێتــەوە
کــەوڵــێکە ســـەرمــا ئــەگێڕێتـ ـەوە
کـا، هێنـد گـران بـوو ئـەچمـە ئاسمـان
کاکێشی ئـەکـەم لـە ڕێـی کاکـەشـان
بۆ پارەی (کـابین) چاوەڕێی (کـا) بین
دیـارە کـە نابـێ خـۆبین بـە خـوابین
عـامیلی بـێ‌عـیلم، دیـدەی بـێ‌نـوورە
عیلمـی بـێ‌عـەمـەل، زینـدەبـە گـۆڕە
بـا وجـوود عیلمـی ئێـستا چـەنـەیـە
بــرەو بــرەوی خـــۆش داکــەنــەیــە!!
نـەک ئێـستا، دەورووی ئـادەمـیش وا بـوو
بــۆ زۆرەملــێ بــاغ بــەرەڵـــلا بـــوو
هـەروا هـاتووە و بـەو ڕەنگـەیـش ئـەڕوا
بـــێ‌دەســـتەڵات بی ئــەکـــەوێتـە دوا
هــەرلایێــک ئــەچــی هــەر زۆرداریــە
چـــارەی ناچـــاری دەرکـــەناریـــە
بـەلام چــی دەکـەی لـەگـەڵ عائیلـە
کــە بــە نوقتــەیێــک بــوو بــە غائیلـە
هیجگــار منداڵــێک کــەوا ئــەخوێنــێ
خـــوێنی توانـــایی بـــاوک دەردێنـــێ
کــەسـیش نازانــێ بــۆچی دەخوێنــێ
لـــەم خوێندنـــەدا چـــی تیـــا ئــەبینــێ
گوایـە هـەموویـان ئـەبـن بـە مـەئمـوور
باوکـە جـێ نـەمـا، پـڕ بـوو دەرو ژوور



منداڵ لە زکی دایکیا خوێن ئەخوا
کە هاتە دنیا ئاوڵە دەرئەدا
ئای ئەوەی خوێتی خەڵکی ئەمژێ
نازانم ئاوڵە بۆچی نایکوژێ
تەماع سوێراوەو، وەک ئاو دەنوێنێ
تا بیخۆیتەوە تینوێتی دێنێ
بۆ هەندێ سوێراو ئەبێ بە هەنگوین
تەماعکارەکان وا زۆرتر ئەژین
سەری کەر کرا بە ڕەشی گاوە
لەم دنیایەدا پرسین نەماوە
ئەگینە سەلکێ شێلمو چەوەنەر
گەیە ڕادەیێک لەوزە بەدەر
لە (قەلاچوالان) زەمانی پێشوو
بۆ عیبرەت کێلی قەبریان نووسیبوو
مەنێکی گەنم بە دوو جلق ئەدرێ
وای لەوەی ماڵی پێ بە خێو ئەکرێ
بەفری ئاسمان، بۆمبای سەرزەمین
(خامیش) گرانە، بێ کفن ئەمرین
هەزار ئەناڵی بە گیانەلاوە
خوایە هیوامان هەر لای تۆ ماوە
بە دارگرانی دارمان بۆ کرا
پەژارەی (هیتلەر) لە ناو دەربڕا



ئـازا لـە بـەنـدو زنجـیر ناپرسـێ
ترسـنۆک لـە بـای زگـی ئـەترسـێ

قسەی بێ فێڵو ڕاسـت وا لای شـێتان
درۆو دەلەسـەیش لای پیـاوی شـەیتان

خەڵـک بە نوقلانە چیـان گـوت وایـە
زوبـانی مـەخلـووق قـەڵـەمـی خوایـە

بـە (وگـاع، وگـاع) وەلـەکـی بـەغـدا
لـەقلـەقیـان خـستە ناوشـەت بـە هـەڵـدا

گاڵەو ناڵەی خەڵک (هیتلەر)ی شـکاند
خـوا عـەدالـەتی بـە عـالم نوانـد

هاکـا بیـستمان وەک کونـدەبـەبـوو
چاوی (هیتلەر)یان کوێر کرد بە قووقـوو

بـەڵام چ فایـدە ئـەو دنیـای سـووتاند
بیشکوژرێ خۆ ئەو بەدیی خۆی نوانـد

پێشرەوی شەڕ بوو، بۆ قـەومی ئـەڵمان
بـاری نـەگبـەتی خـستنە سـەر شـان

تـۆ بـە خـواردوو بـوون کـە جارێکی‌تـر
بـۆ دیکتـاتۆری نـەبـن بـە لـەشـکر

ورچ بـە زاتی شـێر ئـازایی نوانـد
چنگـی پـڵنگی بـە هـەڵـمەت شـکاند



لە بەفر ساردتر هەناسەی سارده
تەقاویست ئەڵێ مەلا، یە، ئارده

ئەڵێن بانێکەو دوو هەوا، وایە
نازانێ خۆیشی ئەمەی لە دوایە

جاران (ژاپۆن)بوو یاجووجو ماجووج
ئێستا (نەرنایش) کردوونی بە عووج

بەلام کە ناوی (بسم‌الله)ت هانی
خۆی رانا گرێ غوولی یابانی

یاریی ئەم شەرە بووە بە (واغێن)
کە (کایە) کوێر بوو ئەبێ بە تێچێن

هەر نێوە ئەدەن هەتاکوو هەڵدێ
ئینجا ئەستێرەی عەدالەت هەڵدێ

پیرێژنی چەرخ (عاشووورای) لێنا
لە هەموو قەومێ گۆشتی بۆ هێنا

خەڵک برایەوە، شەر نابرێتەوە
ئاگری (هیتلەر) ناکوژێتەوە

لە جەژنا دوژمن ئاشت ئەبێتەوە
دوو جەژن یەک کەوت، شەڕ نابڕێتەوە

ئەیانگوت (جەجال) وەک بەندوباوە
من باوەڕم کرد (جەجال) هەڵساوە

مەگەر بە (مەهدی) چاک بێ ئەم حالە
زالم خۆت بگرە وادەی زەوالە



دەوڵەمەندی (ڕژد) خاوەن ماڵ نییە
بە چی ئەزانێ ئەو حەماڵ نییە
سیلاحی دەستی ئەبنای زەمانە
درۆو، بێشەرتیو، خیانەت سیانە
درۆیێکی وا کە بیسەلمێنی
شەرتێک کە سوێندی ناموس بەڵێنی
بە سەرزاری دۆست، کە چی بە دزی
کاتێک زانی هەر وەک مار گەزی
لەگەڵ ئەو حاڵە ئەوان لە کاران
ئەڵێی نە بایان دیوە، نە باران
هەموو تازەیێک زەوقێکی تیایە
مردنی تازەی برسی بەلایە
ئەڵێن تەنگانە شیددەت بسێنێ
گوریسی هێزی خۆی ئەپچڕێنێ
وا ئێمە پچڕان، گوێش ناپچڕێ
دوای ئێمە خۆشی بە کێ ئەبڕێ
(هیتلەر) لە (ئیتلەر) جمعە بە جەرگە
بە هیچ ناپچڕێ هێندە سەگمەرگە
ئەیانگوت سەگەل ڕاوەورچ ئەکەن
ورچ سەگی خەساند، گونیان چرچ ئەکەن



تیغی جەوهەردار هەرچەندە جوانە
جەوهەر ناڕێژێ پێوە چەسپانە
بەلام جەوهەری ئینسان ئەپرژێ
بە هۆی ئەوەوە زۆر خام ئەبرژێ
تیغی جەوهەردار بریندار ئەکا
پیاوی بە جەوهەر زام تیمار ئەکا
پیاوچاک پەلوپۆی ئەکا بە سێبەر
لەو سێبەرەدا کار ئەچێتە سەر
سێبەری داری گوێزی کوێر قورسە
لە ژێر داری (بی) بنوو مەترسە
دارگوێز بە حەو ساڵ ئینجا بەرئەگرێ
مێو بە سێ ساڵە لێی ئەخورێ ترێ
کە تۆ ئومێدی نان لە خەلک ئەکەی
دیارە خزمەتی داری پەلک ئەکەی
ڕەنج بدەی لەگەڵ پیاوی ناپیاوا
ڕەنجی شانی خۆت ئەدەی با ئاوا
پێشینان ئەڵێن لە داخو دەردا
هاتیتە ئەمەی خۆڵ بکەی بەسەردا
خۆڵی بەر قاپیی دەولەمەندە پێوە
پارە ڕژاوە ئاڵتوونە پێوە
من ئەڵێم نابێ ئەم ئیشە وابێ
چونکو دولەمەند پارەی گوم نابێ



لەسەر هیچ بارێ ناوەستێ ئینسان
سروشت دراوە ئینسان لە نیسیان
گیا لە سەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە
ئینسان کە چێنرا سەوز نابێتەوە
ئەڵێن ڕۆحی ئەم لەبەر ئەوایە
کەوابێ ڕۆحیش چەشنی کەوایە
ئەوەی کە ئەڵێن ڕۆحی خەبیسە
ڕۆحی پیاو نییە، ڕۆحی ئیبلیسە
هیوایشمان هەیە ڕۆحی ئیبلیسە
(شیاطین الانس) نەسسی قورئانە
با وجود کە خوا ڕێم لێ تێک نەدا
چیم دەست ئەکەوێ لە دۆستی بەدا
لەگەڵ بەدگۆدا ئازای دەربەرە
بە موحاوەرەو بە موجاوەرە
پیاو بێ جێ توند بێ، قاچی شەق ئەبا
(سرکە) کە توند بێ، (قاپی) شەق ئەبا
غەیبەتی حەمام دەنگ ئەداتەوە
چیتی (بەقەمیش) ڕەنگ ئەداتەوە
ئەو حەلوا خۆشەی پاشملە ئەیخۆی
خوا فەرموویەتی گۆشتی برای خۆی
زستانان خۆشە کۆمەڵی شەوێ
بەڵام (ماڵوێر)، غەیبەتی ئەوی



ئـەو چـوار عونـسورەی سروشـتی مـنن
هـەر چواریـان لـەگـەڵ یـەکـدا دوژمـنن
ئـاوو، ئـاگرو، بـا، لـەگـەڵ خاکـا
ئـەویـان لـەگـەڵ ئـەو کاتـێ هـەڵ ناکـا
کـە مـن لـەمانـە دروسـت کـرابم
چـۆن لـەگـەڵ بـرای خۆمـا بـرا بم؟
سەیر ئەو سەیرەیە ئەوانەی چاک بوون
نـەتـەوەکـانی ئـەوان ناپـاک بـوون
جـارێ کـوڕانی ئـەوەڵ پێغـەمبـەر
ئـەوان یـەکتریـان دایـە بـەر خـەنجـەر
دووەم یۆسـفی شـیرین خـەت و خـاڵ
براکـانی خـۆی هاویـشتیانە چـاڵ
ئیـستایش دەبیـنین کـوڕە وەلیـەکـان
دەسـت ئـەوەشـێنن بـە تـیرو پـەیکـان
وەڵـلا وەبـیللا کـاری ئـەڵـلایە
ئـەم بگـرەو بـەردە و شـەڕو هـەڵـلایە
ئـەگینـە خـوا خـۆی بـە ئێمـەی فـەرمـوو
بمانویـستایە ئومـمـەت یـەک دەبـوو
ئەگەر دونیامـان وەک بـەهـەشـت ئەبـوو
هیچکـەسـێ بـەلای خـوادا نـەدەچـوو



عەشق ئەو عەشقەیە وەک دوگمەو قەیتان
لە یەکتر ئاڵێن بە دەست لەملان
بە جووت بگەوزێن لەسینەی سافا
دەم لە ناو دەمداو مل لە تەنافا
ئەوەیان خۆشە کە بێ‌منداڵن
جەرگیان ناسووتێ کە بوی بناڵن
موعجیزەی گەورەی (عیسا) ئەمەیە
منداڵی نییە بێ قرەو وەیە
ئەم مانگەیش هێشتا شینی (حوسەین)بوو
واوەیلای (زەهرا) و ناڵەی کەونەین بوو
هی ئەوتۆ هەیە بۆ نانی منداڵ
بە بادە غەمی خۆی بە با ئەدا
هی وایشمان هەیە تریاک ئەکێشێ
ماریش پێوەی‌دا، هیچ کوێی نایێشێ
منیش بە بەنگی موحیبەتی خوا
نەمار، نە دووپشک، گۆشتی من ناخوا
چەند خۆشە ئینسان لە خۆیا پاک بێ
لە بەندوباوی دونیا بێ باک بێ
سەرگوزەشتەکەی دووپشک‌و کیسەڵ
لەم زەمانەدا بووە بە مەتەڵ



هـەنـدێ تـەبیعـەت وەک دووکـەڵ وایـە
بـە گـەردو خولـەو سـەر لـە هـەوایـە
هەندێ سەرگەردان وەک ئاو شەیدایە
بـەردەڵ بـەردییـە، روو لـە بـەغدایـە
دەسـتەیێکـی تـر بـەتـەپـو گـڕە
پیـاو دەسـووتێنێ، زادەی ئـاگرە
هـەنـدێ وەک دایـک دڵسۆزەو چاکـە
ئـەتگرێتـە خـۆی، وەک خـاکی پاکـە
بـەلام کـە خـاک بێ لـە ڕێـی ئینسانا
عـادەتـە هـەر چـی هـەڵـسا پێـی پیانـا
پێـسی زینـدوانی بـەسـرا ئـەکـرێ
کـە مردیـشی ئـەو لـەباوەشت ئـەگرێ
ئێستا ئـەمـەوێ تێگـەم ئـەم چـوارە
بـۆ ڕۆژی ئـەمـڕۆ، کامیـان بـەدکـارە؟
بـا وجـوود هـەر چـی مـن بـڵێم بۆشـە
هـەرکـەس ئـەتـواری خـۆی لـەلا خۆشـە
هەمووی لـە قاڵبی وەستایێک دەرچوو
(وخلقنـاکم اطـوارا)ی فـەرمـوو
سروشـتی (هیتلـەر) ئـاگری قـودرەتـە
شـەیتانـەو لای خـەڵـک وا بـە حورمـەتـە



زســتانان دووپــشک ئــەچنــە کونــەوە
مــن خزاومــە کــون، ئــەمدۆزنــەوە
وەمـزانی سـەرمـا دووپـشک سـڕئەکـا
کـە چـی سـەرمـا ئـەو گـەرمتـر ئـەکـا
هـەر هـەنـگ نامووسی خـۆی ڕادەگـرێ
بــە پیاویــەوە دا، لــەداخــا ئــەمــرێ
بــەرخو کــار دەنگــی بلوێریـان ئـەوێ
سـەد بلـوێر لێـدەی، گـا بـۆی نانـەوێ
جــاران موختــاران گزیریــان هــەبــوو
بــە گزیــر نــاوی چاکــان دەردەچــوو
یــاخوا گزیرمــان خــوا لــێ نــەســتێنێ
ئـەگـەر ئـەو نـەبـێ پیاوچـاک نانوێنـێ
چەند خـۆش بـوو جاران بە میرو گزیـر
کـە ئـەمووسـتیلە ئـەیکـردی بـە مـیر
یـاخۆ بـاز ئـەنیشت بـە سـەر سـەرتـەوە
ئـەکـەوتیـە شــاهی بــە یــاوەرتــەوە
ئێــستا نــاوێری لــە کــون دەرکــەوێ
(بـە بـابی، بـابی) مـەگـەر سـەرکـەوی
بــابی بابیــــشمان لــــە بــــەهارایــــە
بــەهــاریش هێــشتا شــەڕ لــە کارایــە
هانــام بــە تۆیــە خــودای کردگــار
لێمــان نــەشــێوێ ســەیـرانی بــەهــار



کــە بــە منداڵـــی (قبوولـــی)نــەخــۆی
گەیشتیە پلاو ئەڵێی: خەڵکی کوێی؟
یــاخوا قــەت گــەدا نــەگاتــە مــەسـنەد
هــەمــوو کاربــەدەسـت ئــەبنــە پیــای بــەد
جاران (بسم‌الله) ئەکرا لە سەر نان
ئەبوە تێرەخۆر، قاپێک بۆ هەموان
ئیــستا (بــسم الله) کــەوتۆتــە غابــات
پیــتو بــەرەکــەت بۆیــە دوایــی هــات
پیر ریشی نەبێ گووچنەی دووخە
سەیدی بەدخوو (ئایەی مەنسووخە)
بێدەنگی دەم راست بە هیچ ناژمێرن
(فیکــە) بــە بــرای (بــێ لێــو)ئــەسپێرن
لــە (هــەورامانــا) رمبــازی نــەبــوو
کە چی (هەورامی) یەکەسوار دەرچوو
ســواری گلابــوو لــە دەوری (هــاوار)
ئەیگوت: سوارنەگلێ، چۆن ئەبێ بە سوار
خێر بە دەستی خۆت نەبەشێتەوە
خێــری ئــەو خێــرە ئــەبــەشــێتەوە
سوار گلاو دیسان رێی سەختی پێوا
بــۆ ئــەوە دەشــێ بیکــەی بــە کێــوا



چرووک لە دونیا خۆی قەمتەر ئەکا
لەولایش حیسابی دەوڵەمەند ئەدا
ڕاستی، باریکە هەناسە ئەبڕێ
هەرچی هەڵیگرت شەڕی پێ ئەبڕێ
گۆچان کە قەفی چەماوەتەوە
سەرچەوتەو، سەرچەوت ڕاست ئەکاتەوە
نیکاح بەردیکە سەر (مەلۆی) ئەنێن
(حاجی یاتمەز)یش بە تەلاق ئەڵێن
جاران ئەیانگوت عەیبو شوورەیی
ئێستا ئەبێ دووی شوورەیی کەوی
(ڕۆستەم) بۆ ئەمەی تیغی کول نەکا
دوو کەسی ئەگرت ئەیدا بەیەکا
ئەوەی بە پارەو بە دەستەلاتە
شەڕیشی وەک ڕێی بە قۆنتەراتە
جاران ئیتالیا شەڕەگای ئەکرد
ئێستا گاجووتی (بنیتۆ)ی بار کرد
هەندێ بەلفکەی زیر دەشۆرێن
هەندێ بە نەرمی لەبار دەگۆڕێن
شەرت ئەوەتە تۆ میزاج بناسی
(تەنتریۆت) نەدەی لە جێی ڕۆن ماسی



چەند خۆشە کچی جوان خوێندەوار بێ
شێوەی هامسەری تێدا دیارە بێ
ئەوسا ئەتوانێ کە قەدری مێردی
ڕاگرێو پشتی نەدا لە عەردی
کوڕ و کچ ئەگەر جوانی یەکیانخا
کە لە یەک تێر بوون، دیواریان ڕووخا
چلێس زەحمەتە بە ژنێ هەڵکا
جارجار سەردەکا بە(دیزەی) خەڵکا
(ئێسری بالانی) زۆڵە و چەمووشە
کە گوێی مەلاس کرد، ئەزانی تووشە
بەلام هەندێ کەس گوێی نابەنە چەرم
(جووتە) لێ ئەدەن، بە تێکەڵی گەرم
ئەگەر (گوێرەوسار) نەبێ بۆ گوێلک
ئێستانمان ئەبێ بە دەشتی کوڵک
پیری زاتێکی خستە مەینەتی
هاواری کێری (شەرح موغنی)یەتی
کورد لە بەر کێری خوای بیرچووەوە
(لیلەالقدر)ی پیا خرج بووەوە
جاران جاربەجار ئەکەوتە سەما
بە شەری (هیتلەر) نەشئەی تیا نەما
یاخوا (هیتلەر)یش وەک ماری تۆپیو
هێزی نەمێنێ بۆ ئەمدیو ئەودیو



هەر وەکوو (نەفیی نەفی) ئیسپاتە
زولم لە زالم، وەک حەسەناتە
ئەڵماس بە بەردی بێ قیمەت ئەشکێ
کە شکا ئیتر پێکا ناڵکێ
بەلام (ڕووسووری) چاری کراوە
باوکی ماقوول بێ، بۆی داپۆشراوە
پیاوێ کە دەستی لە دەست هەڵبڕا
زۆری پێ نەچوو پێی هەلاواسرا
شەرتە ئەو دەستەی کە هەڵدەبڕێ
ئەبێ دەستێ بێ بۆ دزی نەبڕێ
هەندێ موسیبەت کە خوا ئەینێرێ
بە سەدای کردەی بەدمان ئەژمێرێ
کە دەستت بە سەر پشیلەدا هێنا
ڕەگی کۆترو کەوی دەرهێنا
عەرش کە بە ناڵەی هەتیو ئەلەرزێ
بۆچ بەو لەرزەیە (هیتلەر) ناتەزێ
تا ڕووی سەرزەمین بە خوێن سوور ئەبێ
گێپەڕەی ملی ئەو ئەستوور ئەبێ
بەهار بۆ جوان خۆشە بگەڕێ
داری پیر بە بای بەهار ناڵەرێ
پیری‌و جوانی تێکرا زەحمەتە
یادی جوانی بۆ پیر حەسرەتە
پیر تەقاویت بوو، ناکەوێتە یاد
ئیتر دای‌ئەنێن بە نەفسی زیاد
نازانن خۆیشیان وایان بەسەر دێ
گۆڕ وایە بەدکار دەری کەن لە دێ



کـە لـە ڕوونـاکی کـەوتیـە تـاریکی
چـاوت نابینـێ پێـوە خـەریکـی
ئـەبـێ ڕاوەسـتی تـا چـاوت ڕادێ
تـا چـاوت ڕادێ کوێرایـیـت دادێ
لـە تاریکیـشدا شـەم شـەمـەکـوێرە
کـەوتـە ڕوونـاکی، نابینـێ کـوێرە
ئـەمانـە دەردی کوتووپڕیـیـە
قـۆرتی نـەگبـەتی کاسـەپڕیـیـە
هەر چی لە پڕێ کە بوو بە کوڕێ
خۆی لێ ئەگۆڕێ، زۆر بەرز ئەفڕێ
دیارە ئەوکەسەی کە بەرز ئەفڕێ
ئەستۆشکانی گەوجیی پێ ئەبڕێ
ئـاخ ئـادەمیـزاد لـە خـۆی بایـە
بـۆ دوو ڕۆژیـش بـێ شـاهی شـاییە
ئـەم بـەرزە فڕینـەو ئـەم مـلشـکانە
لـە ئـادەمـەوە ئیرسـی باوکمانـە
دنیـا هـەزاران (فیرعـەوت)ی دیـوە
کەللەی (کەی) لە ژێر خاکا ڕزیوە
دوای ئەوەیش ئەوەی دوو ڕۆژی بەرکەوت
نەسرەوت تا هەوای سەر کەوت سەرکەوت
دنیـا شـێواوە بـە کـەس چـا نابـێ
سا مەگەر دەوری (مەهدی) پەیا بێ



بـــارانی نیـــسان دوڕو گـــەوهـــەرە
لـــە ڕاســـتی ئێمـــە ژاڵـــەی بـــێبـــەرە
فریـشتەی ڕەحمـەت لـە تـەقـەی بۆمبـا
هـەڵـفڕییەوە، ڕەنجمـان چـوو بـە بـا
خـوا فــەرمــووی: دنیــا! بچــۆرە بنــە
ڕووبکـەرە ئـەوەی، کـە ڕووی لـە منـە
کە چـی دنیـای کـەچ پێچـەوانـەی کـرد
هەر چی خوای نەویست، خۆی بۆ ئەوە برد
ئێستایش ئـەوانـەی کـە خـوێن ئـەڕێـژن
هـەنـدێ بـەدنمـەک چاکیـان ئـەبێـژن
بـە نـانی (عـیراق) پـەروەردە ئـەبـن
کـە چـی بـە نـەزمـی (نـازی) ئـەنـووزن
ڕەحمەت لەوکەسەی (ئەسپێ) ئەکوژێ
لـــە باخـــەڵـــیایە و خـــوێنی ئـــەمـــژێ
نیسکی (مۆریاس)و هەرزنی (ڕە نگاڵ)
بـێ بـەروپـشتن، بـۆ کـەس نابنـە مـاڵ
لـــەم سیاســەتـــەی ئینگلیـــزە ناگـــەم
پیـاوی بـەدنمـەک ئـەخاتـە پـێش دەم
پـیرەمێـرد ئـەڵـێ: پیـاوێ سـەرکـەوێ
ئەبێ دوورنـاس بـێ، کـووژەکـەی نـەوێ
دەربـــارەی ناکـــەس پیـــاوەتی مـــەکـــە
بە کۆڵ بیبـەیتە (کـەعبـە) لەک لەکە



بووکەبارانە ئاوی پیادەکەن
ئینجا بۆ باران ڕوو لە خوا دەکەن
خوا هەموو ساڵێ بۆ (کەپرەشینە)
باران ئەنێرێ ئەڵێن: ئایینە
بۆ ئاین نییە ئەو تۆزە ئاوە
بۆرجی ئاسمان هەروا سووڕاوە
ئەگینە ئەگەر بە دوعای (جوو) بێ
ئەبێ بۆ (هیتلەر) مەرگێکی زوو بێ
لاموایە (هیتلەر) نەسلی شەیتانە
بۆ شەڕ خولقاوە، عەدووی ئینسانە
لە سەرزەمینو دەریاو هەوادا
بە شەڕ بۆ بەشەر بۆمبای هەوا دا
چەند پیرو جوانو منداڵی هەژار
لە گیان کێشاندا لێی کەوتنە هاوار
کەچی ناڵەیان تەئسیر نانوێنێ
کوا دادی مەزلووم عەرش ئەلەرزێنێ
ئەوی بە گوناە ڕەش ئەبێتەوە
(تیر) ڕێ لە لەشیا نادۆزێتەوە
وا چاکە ئینسان هێند گوناهکار بێ
کە (تیر) نەیبڕێ، لە مەرگ ڕزگار بێ



سروشــتمان چونکــو گــەنمــی تیایــە
هــەویــر بــۆ هــەمــوو زامــان دەوایــە
ئـەگـەر ئاوبـەنـدیش زۆرمـان پـێ بێنـێ
نیــوە نمــەکــێ ژانی ئــەشــکێنێ
لــە بــەر ئــەوەیــە ئــەگــەر ئــەبــرژین
فش هەڵدین بـە بـای غـروور ئەترشێین
لـە فـەسـیلەدا تـیرەتـیرەیـن، جـوێین
گــاڵو زوراتو دانــەوێــڵەو جــۆین
هــارپونی ئاشــی چــەرخ بــەقینــەوە
ئــاردی نــاو درکــین، یــەک ناگرینـەوە
چاومــان ژوور ســەری خۆمــان ناینێــ
عالـەم سـەرکهـوتو (کـورد) وا دەمێنێ
دووکــەڵ لــە نزمــی بــەرز ئــەبێتــەوە
دیــزە لــە بــەرزی تــل ئــەبێتــەوە
ئـەورووپـا ئـۆردووی کـۆلارەی هـەیـە!
کـوردیش کـەلارەی تـەپاڵـەی هـەیـە!
(تــەکــەنمــەد)ی ئێمــە (بــەرگــن)ە
فانیلــەی ئــەوان (ڕۆنــگ)ە بــەرگنــە
ئـەو گیایـەی ئێمـە ئـەیخـەینـە بـەر کـەر
ئــەوان (ئاوریــشمی) لــێ دێننــەبــەر
ئـەوەی لـەم خاکـە خـۆی پـەیـدا ئـەبێ
دەس خێــوی کــەوێ کیمیــایی ئــەبــێ



چنـار کـە بـڕاو جـوێ بـووەوە لـە بـن
ئـەیکـەن بە پـەیـژە، پیـا سـەرئـەکـەون
(ڕەسـەن) بـۆ ناسـوار، ئـاوزەنگـی نـادا
(کەر) هەر چی هەستاسواری بوو پیا دا
(مازوو) چونکوو خۆی بێ ئەرک بەبەرە
بـێمنـەت فـەیـزی (مـەنـنی) لـە سـەرە
داری (سەرو) چونکوو بە بالا ئەخۆڕێ
قـووچبـووەتـەوەو بـەریـش نـاگرێ
ئــەوی بــە دەعیــە بــەرزئــەبێتــەوە
وەک (شــۆڕەبی)یــە، ئــەنــەوێتــەوە
پیـاو خـراپ هێنـدە کـەوتۆتـە کایـە
چـاک دەڵـێ: کاشکێ خـراپ بوومایـە!
وا چــاوم لێیــە پیــاوی بــە نــامووس
خوا خستوویەتە ژێر ئەمری (جاسـووس)
خـوا بۆیـە کـاری ئـەوتـۆ ئـەسـازێ
هـیچ کـەس بـە عـیلمو فـەزڵـی نـەنازێ
جاران لووس لاو بوو، ئێستە زمانی لووس
بـازاڕی گـەرمـە ئێـستا (قـزە رووس)
مـن فـەخـر ئـەکـەم ئێـستا بـەم ئیـشە
کـە بـاوی دەسـتەی ئاغـای بـێ ریـشە
یـاخوا هـەر ئـەوان بکـەونـە ڕاسـی کـار
تـاکوو دەرکـەوێ بـە کـارو بـێ کـار



ئـەم شـارە تـەسـلیم چـشتێ کـراوە
بە مـەتـەڵ شـەش پـای دوو سمـی نـاوە
کلکـــی لـــە بـــانی پـــشتی ڕوواوە
کـە کلکـی بگـری ڕوو لـە سـلاوە
بـە هـەر باریکـا پـەنجـەت خـستە ژێـر
ئـەبـێ بـە ئاڵـەت بـۆ شـەڕو بـۆ خێـر
خـوا فـەرموویـەتی ڕاسـتی هـەڵکێـشن
کە چی بە(کەچی) خەڵک لێی بەئێشن
چونکـــە میـــزانی عالـــەم شـــێواوە
ئـەویـش بـە جـارێ پـەتی پچـڕاوە
بـەدکـار بـەزرێـی گونـاە ئـەخـوڕێ
بۆیـــە کـــە تـــیری دوعـــا نایبـــڕێ
هـیچ کـەس لـە کـاری خـودایی ناگـا
خۆی خوایە و خوایی ئەداتە دەست گـا
بـــەفـــر ملیۆنـــێ ڕەق ئـــەکاتـــەوە
بـاران بـۆ خـەزنـەی خـۆی ئـەباتـەوە
لـــە بـــاتی بـــاران بۆمبـــا ئـــەبـــارێ
(سـون)یـش بـەریۆتـە دەغـڵ بـە جـارێ
بـە جـاری دنیـا بـوو بـە مـووی زەنگـی
تۆفـانی بـەلا گـەیـە ئـاوزەنگـی
بـاوک ئـەولادی نـاوەتـە ژێـر پـێ
ئـاخو بـەزەیـی خـودا بـۆ کـەی بـێ



گەرما ڕتووبەت لە لەش دەردێنێ
سەرما دەستوپێی پیاو ئەتەزێنێ
هاوینان دنیا پڕ لە میوەیە
زستانان بەفر بەکڕیوەیە
ئەوەی سروشتی سارد وەک زستان
تەزوو ئەخاتە ناو جەرگی ئینسان
ئەوەی کە دلی گەرمەو بە ڕەحمە
لە ناو پیاوانا زینەتی بەزمە
پیاو هەیە هێندە ساردو بێ باکە
ئاگری جەهەنەم تینی تێ ناکا
ئەڵێن (سەمەندەر) لە ئاگرایە
نەمدەگوت ڕاستە، ئەوم نەدیایە
(بایەقوش)م دی، خوێندی لەسەر ماڵ
ئاگری تێبەربوو، دایە کۆی زوخاڵ
هێندێکیش چاوی پیسیان کار ئەکا
چاوی پیس کاری ژاری مار ئەکا
چی دەبێ ئەگەر چاوپیسێ جارێ
(یەح) لە (هیتلەر) کاو بیخاتە خوارێ
دوعاو نزای خەڵک تەئسیر نانوێنێ
مەگەر بۆمبای چاو هەڵی تەکێنێ
وا عالەمێ مرد (هیتلەر) هەر ماوە
ناوی بە بەلایخودا نووسراوە



دنیـا دوو ڕێیـە بـۆ ئـەهـلی بـڕوا
ڕێیـەکیـان دیـتو ڕێیـەکیـان ئـەڕوا
عـاقڵ چـۆن ئـەنـوێ لـەو دووڕیانـە؟
مـەگـەر ئـەو کـەسـەی خـەوی گرانـە
دنیـا خـەویکـە بـۆت نایـەتـە دی
هێشتا کـەس بـەری ئـەو خـەوەی نـەدی
یـەکێـک ئـەبینی شـیرین خـەتو خـاڵ
لـە پێش چاو لاچوو ئـەبێ بـە خـەیاڵ
دووکـەس ئـەگـەڕێـن بـە ڕۆژو بـە شـەو
لـەگـەڵ لێـک بـڕان ئـەگـەڕێ بـە خـەو
سەد خـواردەمەنی خۆشـت بۆ ئەکرێ
ئەیخۆی کەچی زک تویشوو هەڵئەگرێ
هـەر شـۆخ و شـەنگـێ کـە دڵ ئارامـە
دوای وەسـڵ ئـەبـینی کـە (ئیحتیلامـە)
یـادی خـوا نـەبـێ تێـری پـێ نـاخۆی
هـەتـا زۆرتـر بـێ، شـیت گیرتـری بـۆی
ئـەگـەر بیتـو خـوا ئـەوەی پـی‌بـەخـشیت
مـەترسـە ئیتـر بـە هـیچ نالـەخـشیت
خوای کرد دەروونت ڕاهات بەو نـووره
خـەم خـەفـەتی دنیـات لـێ دووره



هەوری بەهاری بە هەرەگوڕە
بە تاوو تەرزە توندەو بە گوڕە
کە خۆت لێگرتە پەناو پاسارێ
زوو بەسەر ئەچێ ئیتر نابارێ
ئەگەر ڕووبەڕووی ڕۆیست بێ پەروا
بەتەوژمەوە بەسەرتا ئەڕوا
هەر چی تەنک بێ دیارهزوو ئەدڕێ
ئینسان ئەستوور بێ ئەوسا ئەپچڕێ
(هیتلەر) لە دوولا کەوتە پەلامار
ئەکوژێ و ئەکوژێ بێ پەروا وەک هار
دیارە کە دوایی (سەمەندۆک) ئەکرێ
ئینسانی خوێنڕێژ مەرگی پێ ئەبرێ
دنیا بە جارێ بووە بە گۆمی خوێن
ئەولادمان ئەڕوا بێسەرو بێشوێن
بەمڕەنگە ژیان تامی نەماوە
ماسی ژێر دەریایش هێلکی براوە
گرمەی بۆمباو تۆپ گەیە ئاسمان
لەرزەی خستە ناو بارەگای یەزدان
کاتێک زانی کە قینی قەهار
بۆ تۆڵەی خوێنی ناحەق کەوتە کار
ڕەگی زاڵمی لە بن دەرهێنا
ئەم شەڕو شۆڕە نەما لە بەینا



ئەڵێن: جەهەنەم لە ژێر زەمینە
بە ئاگری ئەوە ئەم گەرماوتینە
ئەی خۆ ڕەشەبا کە لە بەرزییە
گوایە بوارەی کونی دەرزییە
هێجگار ئەو عەیشی ئێمە تاڵ ئەکا
بە تۆزو غوبار چاو بەدحاڵ ئەکا
ئەم شارەی ئێمەی کردووە بە (مەکۆ)
هەر چی دێت بڕوا، بانگ‌ئەکا مەڕۆ
فێری فیشاڵی وەهامان ئەکا
فەلەک لە دەستمان بەرد بە با ئەکا
ئەم بایە ڕەنجمان ئەدا بە بادا
با، با نەکەینە، سەر لە هەوادا
تاو تاو کە هەتاو لێمان دێتە ناو
هەناومان ئەکا بە شێلمی پیشاو
کە چی بە سەرمایش (کەسیرە) ئەبین
بایێکی لێدراین لە (برە) ئەچین
نازانین بەرگەی هیچیان ناگرین
گا کلکی لێدراین، ئەکەوین، ئەمرین
هێندەیش بە نەفسی خەڕۆمان بایین
هەر لە پەیجۆری خەیاڵی شایین
هێندە بەرز ئەفرین باڵمان شل ئەبێ
دوایی شکانی سەرو مل ئەبێ



کــە دەزوو بکـــەی بـــە دەرزیـــەوە
ئــەگـــەرێــی کـــونی بدۆزیـــەوە
بـەڵام کـە ویـستت هـەودای وەرگـەڕێ
پـەنجـەت گـەیـشتێ خـۆی دیتـەدەرێ
چاکـــە وەک دەزوو پێـــرەکردنـــە
خراپـــە هــــەودا لــــێ لابردنــــە
هـەنـدێ بـە هـەوەس خراپـە دەکـەن
لـە لای کاربـە دەسـت بـەوە دەردەبـەن
فــەسـڵێ بــەدکاریــان هێنایــە کایــە
فــەسـڵێ دەور گۆڕائــەو لــە کارایــە
(خــوادەفــەرمــوێ: مــن بمویــستایە
چاکــەم دەخــستە نــاو ئــەم دنیایــە)
دیــارە ئــەمانــەی کــەوا بــەدکــارن
حــوکمی ئــارەزووی پــەروەردگــارن
کـە وایـە بـۆچیو گلـەیـی لـە کـێ
دیارە کـە خـوا خـۆی گـەردشی ئەوێ
ئـەگینـە (هیتلـەر) یـەک گیـانی هـەیـە
چـۆن ڕێـی پـشێویی جیهـانی هـەیـە؟
خـوێنڕێـژ (مـەنفـووری) هـەمـوو دنیایـە
ئـــەو (پـــەرســـتیدەی) ئـــەڵـــمانیایە
ئـەم ئـەگبـەتیـە کـە شـانی گرتـوون
کاتێــک زانی هـــەمویـــان مـــردوون



کە چاوت بڕیە عەیبی هاوماڵت
لەو خراپتری هاوار بە ماڵت

لە قیسمی ئافرەت، ئەوی بێعارە
لە پێکەنیندا بە دانیا دیارە

پیاوخراپ توند بێو بێ شەڕ بگێڕێ
سپێنەی چاوی لێ وەردەگێڕێ

ئەوکەسەی لە ناو عەواما دوورە
بێقڕەو بێوە ی، ڕەنگی هەر سوورە

مەلا پڕدەمیان کرد لە ترخینە
حوکمیان لێ ئەکرد، وەعز بخوێنە

شێرە بەفرینە لە درۆ بکرێ
بەرگەی هەتاوی ڕاستی ناگرێ

ئەگەر بزانی تێنەگەیشتووی
کاتێک نەزانی کە پێگەیشتووی

پیاوچاک مەدحت کرد ئەو شەرم ئەیگرێ
کە غەیبەتت کرد، گوێی لێ ناگرێ

خۆت مەناڵێنە خۆشەویستییەوە
ئەوە بزانە دوور ئەکەوییەوە

دەعیە ڕەنگێکە ئەدروشێتەوە
بەلام (زەرکەفتە) زوو ئەچێتەوە

خەوو مەرگ هەردوو برای یەکترین
لە مەرگ بێزارین، بۆ خەو ئەگەڕێین



هەندێ (کەللە)هەن کە مێشکیان تیایە
هەر چی کە ئەیلێن لای (نادان) بایە
هەندێ وەک (تەپل) کە پڕە لە (با)
با، دەنگی ئەوان بۆ ڕێی دوور ئەبا
مەلایێکی باش، مەلای دێیە بوو
جاش مەلایەک هات بە گژییا چوو
وتیێک خەڵکینە ئیمتیحانمان کەن
خۆ شوکور ئێوە زۆر چاک تێ ئەگەن
وتی: سا مەلا! گایەک بنووسە
تۆنەتخوێندووە، زوبانت لووسە
مەلا (گای)ی نووسی بە دوو حەرفی ورد
هێندە ورد بوو کە چاو کاری لێ نەکرد
ئەویتر ڕەسمی گایێکی کێشا
هێندە زەلام بوو باری ئەکێشا
خەڵکەکە وتیان: ئەمە گامێشە
ئەویتر لە (گل) ناکا، (گوومێشە)
جا ئێستایش فیکری (عەوام)هەر وایە
زۆر کەسمان تێکەڵ بە کەرو گایە
ئەگینە دانا چۆن باوەڕ ئەکا؟
لەم شەڕە (هیتلەر) سەری خۆی دەرکا
نەخوازەلا خوای عادلو عالم
چۆن مەخلووقی خۆی ئەدا بە زالم



ئەگەر ئەتەوێ دڵت تەنگ نەبێ
لە دڵتا مەیلی داواو جەنگ نەبێ
بە حەق یا ناحەق کە قینت هەستێ
ئەو قینە ڕێگای نەشئەت ئەبەستێ
کە بە گژتا بێن، خۆڕایی نییە
خۆیشت ئەیزانی گوناهت چییە
ئەڵبەت تۆ ئەڵێی من خوێندەوارم
بۆ ئیش و کاری میری بەکارم
بەوە ئەتەوێ بەرزی بنوێنی
باقی خەڵکیتر خوار خۆت ببینی
نازانی مەسنەد بە خوێندن نابێ
ئەوە بەکارە کە خولفی چابێ
زۆر (تەحسیلدیدە) ئەسووڕێتەوە
هەیشیانە بێشێو، سەر ئەنێتەوە
لەولاوە یەکێ دیت بە چاووڕاو
خۆی ئەچەسپێنێ ئەکەوێتە ناو
ئەبێ ڕاوەستی فەویەی دەرکەوێ
ئەوەیش خۆ (سەبری ئەییووبی) ئەوێ
ئەویش نەماوە بواربەرکەوێ
تا ڕەش و سپیی تێدادەرکەوێ
لەوساوە دنیا بوو بە (پارتیزان)
دەستە لە پێشە زانست، یا نەزان



ئـــازایی بـــاوان بــــە وارس نابـــڕێ
زۆر وەجـــاخزادە لـــە برســـا ئـــەمـــرێ
ترسـنۆک سـەری لـە ئـیش ئـەردەچـێ
بـەلام نـاوێرێ لـەگـژ ئـیش هـەلـچێ
تا بەخت و قیسمەت بۆت نەبن بە یار
هـۆش و هونـەرت بـۆ ناکـەونـە کـار
خـۆ لـە تـەهلوکـە، پاراسـتن فـەرزە
هەنـدێ جار سکووت شیعرێکی بەرزە
تـێ هـەلـمەقوتـە، بـلێی ئـەزانم
ئـەلـێن (نـازانم ڕەحـەتی گیـانم)
لـە درێـژەدا ئـەدەب و کـەمـال
گەلێ چاکترین لە حوسن و جەمال
ئـەگـەر تێکۆشـی و بـۆش دانـەنیشی
ناکـەویتـەدوا، دایم لـە پێـشی
هـەر خوایـە تـەغـیر ئـەدا بـە تـەدبیر
واچاکـە بـاوەڕ بکـەیـن بـە تـەقـدیر
زۆر جـار نـەدیـدە قیـسمەت ئـەبـارێ
پاروویش لـە دەمـت کـەوتۆتـە خـوارێ
ئەگەر ئـەکـەویـە جوستوجۆی ئـەحوال
قـسە یـا لـە شـێت بییـە، یـا منـدال
بەلام وا چاکـە لـە هـیچ گـوێ نـەگـرێ
ئـەوسا بـێ واتـەو بـێ ئـەزیـەت ئـەمری



لــــە بـــارەگـــادا تـــا بـــارەکایـــە
بــە دیــاری نــەبــەی، ناچیتــە کایــە
لە بارەگای خوایش عادەت هەر وایە
بــەلام بۆئــەوێ، دیــاری تــەقوایــە
هیچ کەس هیچ کەسێ ناباتە بەهەشت
(دە)م بۆ نەژمێری نالێم بگرە (هەشت)
ئــەمــەنــدەی هــەیــە پیــاوی وەفــادار
ئەگەر دەست کەوێ، ئەو بکە بە یار
دۆستی سەرسفرە، لای چەپا سفرە
لــە تــەنگانــەدا بــە دۆســتی مــەگــرە
هەر چی لە لای تۆ ئەخوا کە ڕۆیی
ئــەڵــێ: لێمــاندا، بــە کــەری خێــوی
نازانــێ ئــەوەی نــان بــە خــەڵــک ئــەدا
بــە هیــوای پــاداش، ڕەنــج بــە بــا نــادا
ئــەمــە زەوقێکــە خــۆی لــە لای خۆشــە
ئــەگینــە هیــوای غــەیــری خــوا بۆشــە
هـــەزار جـــار تـــاقی کـــراوەتـــەوە
کـــەرەم پاداشـــی نـــەدراوەتـــەوە
هــەیــە بــە دەرســی عــیلم و بــە پــارە
عــومری خــۆی دانــا کــەم کــەســی یــارە



یەکێک ئەناسم کە لە (هەولێرە)
خوویئەو (لەقەیە) خۆت لادە لەو تۆ
سەگی نهێن گر، لە کەس ناوەڕێ
بەلایا مەڕۆ! لە پڕ ئەتگرێ
با وجوود ئێستا کە سەگ نەماوە
(هەڵەوەڕ) لە جێی ئەو دانراوە
پشیلە دیارە نەبێ، شایی مشکانە
هەرا هاتوە ئەم، دەورو دووکانە
دەوڵەمەند لە دەست سواڵکەر بێزارە
حەقیانە، هەندێ سواڵکەر بێعارە
ئاردو ڕون نییەو بە ناعیلاجی
لە هیچ کوێ نایە بۆنی ناوساجی
خوا (ئەسپێ)ی خستە فەردە ئاردەوە
بۆیە تەماعکار وا نەیشاردەوە
لە پێشدا بووە بە بگیر، بگیر
کە ئەسپێی تێدا کەوتە دەست فەقیر
ئەم موڵکو ماڵەی دڵمان پێخۆشە
لە سەرەمەرگا حەسرەتە، بۆشە
درۆزن زانی درۆی سەرئەگرێ
پێی ڕادێ ئیتر شەرم نایگرێ
ئەو شیرینییەیلە درۆدایە
لە ڕاستی تاڵدا هیچ کەس بۆی نایە



ئـــەوی بــــە هیـــوای ڕۆژی دواییــــە
غـــەمـــی جیهـــانی لـــە لا شـــاییە
مـادام لـەو دنیـا خـودای بـۆ ئـەبـێ
بـا ئـەم دوو ڕۆژە کوێخـایی نـەبـێ
پیـاوێ لـە دووری ئـاگری ئـەدی
هێـزی دەروونی بـۆ دەهاتـەدی
هیـوا چـاکترە لـە نائومێـدی
تـا مـەئیـووس نـەبی، ناکـەویـە بـەدی
هـەرکـەسێ پـارەی زۆری هاتـە دەسـت
ڕاحـەتی دڵـی دەردەچـێ لـە دەسـت
قـەناعـەتـت بـێ، بـێ ئیحتیـاجی
جامـێ دۆشـاوو دوو نـانی سـاجی
پـاقلاوای زیافـەت، بـاری منـەتـە
لـە ژێـر ئـەو بـارە، دەرچـوون زەحمـەتـە
منـەتو هیـوای نـەفـست دوو بـارن
وەک (زوحاک) لە سەر شانت دوو مارن
ئینـسان لـە خـەودا پـارە دەبینـێ
کـە هـەسـتا دەسـتی تونـد ئـەقووچێنـێ
دەسـت ئـەکاتـەوە، هیچـی تیـا نییـە
دەوڵـەت خـەویکـە ئـەویـش فانییـە
کـەچـی چاکـەیێـک ئـەکـەی ئـەبـینی
لـە هـەردوو دنیـا پـاداش ئـەبـینی



گوناهیش ئەکەی با پەنهانی بێ
با نەزانیی تۆ، کەس نەزانی بێ
کە جارێ ناوی خراپیت زڕا
هیوای باوەڕی خەڵکت لێ بڕا
کابرایە جارێ درۆی کردبوو
درۆزنێ بوو، ئاگر لە ماڵ چوو
عیززەتی نەفسی خۆیشت مەشکێنە
واز لە تەمەنناى ئاوێنە بێنە
ژووری زستانە پڕفەرش ئەکرێ
میوان قۆندەرەی قوڕی پێ ئەسڕێ
برسێتی ڕەگی هاریی پێوەیە
کە چی ڕەمەزان هەر لە جێوەیە
برسیی‌وا هەیە کە لە داخی خوا
ئەگەر ڕەمەزان بێتە لای ئەیخوا
هیوایشمان هەیە هەشت نۆ نەوع تەعام
لە بەردەمیایە و پێی دەڵێ بێتام
لەزەتی خواردن هەر لە دەمدایە
لە (دیزەڕەشدا) هەر یەک هەوایە
ئاخ ئەرکی دیزەی ڕەشمان نەبوایە
کێ بە کێی ئەگوت ئەمە پاشایە؟
خۆزگە حەکیمێ بە دڵسوزییەوە
چارەی برسێتیی ئەدۆزییەوە
ئەوسا نە (هیتلەر) ئەم شەڕەی ئەکرد
نە بۆ نان کەسێ لە برسا ئەمرد



دنیـا بــە جـارێ وەک ئـاگری ســووره
شــوکور ئــەم ئــاگره لــە ئێمــە دووره
بـــەڵام لـــەمـــلاوه پـــەتی ئیحتیکـــار
لـە ملمـان تونـد بـوو، خـستینه هـاوار
برنجمـان ئـەبـەن، بـە ڕەنـج ئـەمێـنین
دڵـمان وا خۆشـە کـە نـەوت ئـەستێنین
هـەرچیمـان هـەیـە بـە (نـۆت) ئـەبـرێ
کە خواردن نەما، (نۆت) خەمشەی بڕێ
بـزن بـە مـەڕی گـوت وا زسـتان دێ
بـا خانۆچکـەیێـک بکـەیـن نزیـک دێ
مـەڕ وتی زسـتان بـا هـەر بـە جـۆش بـێ
خانووم بۆچییە، دووگی خۆم خـۆش بـێ
کـە زسـتان هـات مـەڕ چـووه لای بـزن
وتی: بـزن گیـان! ڕەفیقـت بـووم مـن
وتوومـە بـزن لـە جێـی گـشت کـەسمـە
تـەنهـا جێـی سـەرم بـدەری بـەسمـە
بە زۆر سەری خۆی لە کولانە چەسپاند
گورگ هات لەدواوه دووگی لـێ فڕانـد
مـەڵـێن: پـیرەمێـرد واتـەی بـۆش ئـەکـا
بزن بۆ شەوێ جێـی خـۆی خـۆش ئـەکـا
ئێمـە کـا (مـازوو) لـە دەسـت دەربێنـێین
دیـاره بــە (ســیچکان) تۆڵــە ناســێنین
مــن لێبوومــەوه لــەم پــەنــدو بــەیتــە
مــن وا بــۆ تۆمــە، ئــەی تــۆ بــۆ کێتــە؟



خۆزگە هەر کەسێ کە حەفتەی ڕابورد
چاکەو خراپەی بەراورد ئەکرد
تێبگەیایە لە کردەوەی خۆی
بیزانیایە کامیان چاکە بۆی؟
ئەوسا ئەخلاقی بەشەر چاک ئەبوو
لە ڕاستی یەکتر دڵیان پاک ئەبوو
ئەمڕۆ بە بێباک واین لە جێگادا
سبەی بێ تۆیشوو، واین لە ڕێگادا
دوێنێ هەتاو بوو، ئەمڕو سێبەرە
پێنجو دوو ڕۆژێ، پێچی مێزەرە
لە پێش چاومانە زرتو زیندووە
کە بەلاداهات ڕوانیت مردووە
بەڵام بنیادەم هێندە بێعارە
سەردهنێو ئەڕوا، بە بێهەوسارە
خوا ئەمانەی دا لە کێوو گرد
هیچیان نەیانویست ئیبایان لێ کرد
کە چی بنیادەم گرتیە ئەستۆی خۆی
وایزانی سووکێ ئەبێ بە ماڵ بۆی
ئێستا کە داوای لێ ئەکەنەوە
ملپێچی ئەکا بە شێوەنەوە
ناڵێ ئەم عومرە لام ئەمانەتە
دەست پیا گرتنی بۆم خیانەتە



ئـاو مـردوو و زینـدوو پـاک ئـەکاتـەوە
گــڵ گڵاویمـــان لـــێ ئـــەشـــواتەوە
وادیـــارە ئێمـــە لـــە ئـــاوو گـــڵین
لـــە سروشـــتمانا پـــاک و یـــەکدڵـــین
کـە چـی بـە جـۆیی هـەوا ئـەستێنین
ئـەبین بـە ئـاگر خـەڵک ئـەسووتێنین
ئـــاگری جـــەهـــەنـــەم ناهێنێتـــە بـــیر
بـــە پاڵـــی شـــەیتـــان ئـەکـەوینـە (بـــیر)
چونکـوو ئـاگرەکـە لـە پـێش چـاو نییـە
هەندێ ئـەڵـێن (حـەوا! جـەهـەنـەم چییـە)
کـــەوتینـــە دەورێ، تێکـــەولێکـــەیـــە
هـــەژار هـــاواری پـــاروو و تیکـــەیـــە
خـــەیاڵـــی ئـــاش‌و ئاشـــەوان جویـــە
هیچیـــان نـــازانن دانیـــان لـــە کوییـــە
کاتێ باراش هات هەردووکیان ئەیخۆن
ئاوی ئاش ببڕێ، بەرداش لە سەر خۆن
ڕۆن‌و بـرنج کـڕ (نـۆت)یـان زۆر پێیـە
چۆلـەکـەی دەشـتی‌و بـەردی دەشـتییە
ئـــەم (تـــەق، هاویتـــە) بـــۆ تـــەقاویتـــە
مـــەعاشـــیان کـــەمـــەو نانیـــان بـــێ پێتـــە
ئـــەوی هـــەتیـــوو لێکـــەوتـــەی نـــاوێ
خـوا لـە دەفتـەری خـۆی دەریـان هـاوێ



ئەگەر خۆت لە لای کەم دەست کەم بگری
ڕێی خۆشەویستی لای خوا ئەگری
لە خۆ بایی بوون ماڵ ئەڕووخێنێ
وەک سرکە هەنگوین چۆن ئەترشێنێ
زۆر هەرزەچەنە تووشی شەڕ ئەبن
زۆر قین لەسکیش بە قین گەڕ ئەبن
قینو حەسوودی لە دڵتا بێڵی
دوو هێڵ لە زەویی خۆشی ناکێڵی
ئەگەر زوبانت فێرکەی بە چاکە
دۆستو دوژمنت پێت ئەڵێن چاکە
سەبر کلیلی دەرگای خۆشییە
قەناعەت کەولی شایی پۆشییە
هەرچی خوا کردیو بە چاکت زانێ
ئەکەویتە ڕێی خۆشگوزەرانی
ئەگەر تووڕە بی بە نافەرمانی
خۆشی نابینی لە زیندەگانی
خۆ ئەگەر بڕوات بێ خوا هەیە
لە خوا بڕانت دەردێکی کەیە
کەوابێ بۆچی بە قینەبەری
خۆت لە لوتفی خوا ئەکەی بێ بەری
ئیمان دوو بەشە، بەشێکیامن سەبرە
ئەو بەشەکەی‌تر شوکرانەی قەدرە



ڕەجمـی شـەیتـانی حـەجـی موسولـمان
قـەومـی یـەهـوودو كوشـتنی هامـان
حـەدیـسە ئـەڵـێن: دوو ئـەبـێ بـە سـێ
(هیتلـەر) سـێیـەمە، چۆن ئەخـەڵـەسـێ
(هیتلـەر) نـەك تـەنها یـەهوود بـەتـەنـێ
دەست هەرچی كـەوێ پێستی ئـەكـەنـێ
خۆزگـە شـەیتـانو هامـانو هیتلـەر
چاومـان لـێ ئـەبـوو كـە ئـەكـەونە شـەڕ
بانگمـان كردایـە بـە هـەلـەل هـەلـەل
قورەقوڕاگەی یەك هەڵـێنن سـەگـگـەل
شـەیتـان زۆر كـەسـی لـە ڕێ وەرگێـڕا
هیچیـان وەك هیتلـەر شـەڕی نـەگێـڕا
یـەكـێ لـەوپـەڕی دنیـا بـەدكـارە
لـەم پـەڕی دنیـا بـە جنێـو لێـی بـارە
هـەنـدێ گونـاهی ئـەبـێ بـە زرێ
پـەیكـانی تـیری دوعـا نابـڕێ
عـاقڵ لـە كـاری خـوادا نـەزانـە
(لا یـسال عمـا یفعـل) قورئانـە
بـە مێشوولەیێـك نـەمـروود ئـەكـوژێ
خـوێنی دنیایێـك بـە هیتلـەر ئـەڕژێ
هـەنـدێكیش بۆیـە بـەرز ئـەبنـەوە
كـە كـەوتنـە خـوارێ دەم ئـەكـەنـەوە
نـانی دەلیلـی حـەجـاج ئـەبـڕێ
پێشڕەوی حوشـتر بـە كـەر ئـەبـڕێ



پـایز هـات گـەڵای داری هـەڵـوەرانـد
(وەیـشوومە) پـشتی بـێپـشتی شـکاند
دار ڕووت بـوو گـەڵای کـەوتـە بنـەوە
پیرو جـوان تێکـڕا لێک ڕاسـت بوونـەوە
ئــەو درەختانــەی کــەوا بــێ بــەرن
ئــەشــێ هــەر وەکــوو (کــەوا) بیبــڕن
پیاویش کـە وا خۆی لـە خۆی بگـۆڕێ
بــێ بــەرە، بیبــڕە، بیخــەرە گــۆڕێ
(کفــی بالــشیب واعظــا) هــەیــە
نایــەتــە بیرمــان کــە پـیری کـەیــە
(حـــسبنا الله و نعـــم الوکیـــل)
بـۆ هـەمـوو کارێـک ئـەبێ بـە دەلیـل
(اطــع ربــک تــسمی عاقــب)
(ولا تعـــــصه تـــسمی جاهـــل)
فـەقـیر لای خواغـوە کـە ڕزقـی بـۆ بـێ
لــەولاوە زۆردار دێــتو تێــی ڕۆێــی
ئەڵێن ئەوەی چشت لە خەڵـک ئەفـڕێنێ
پــەردەی ناموســی خــۆی ئــەدڕێنــێ
واتــەی کـەم دەسـتە ئـەم بـەنـدوباوە
ئێــستا هــەڵــمەتو فڕانــدن بــاوە
خـوا زۆر بـەحیلمـەو ئێمـە بـەپـەرۆش
دەریـای غـەزەبی درەنـگ دێتـە جۆش



مردن بە عیززەت تەنها جارێکە
ژیان بە زیان گران بارێکە

نابێ دوژمنی خۆت بە کەم بگری
دەرزی خوێنی ڕەگ بەردا پێی ئەمری

تا ترسی مردن نەهاتۆتە پێش
قوربان قوربانە لە ئاقاری پێش

لە سەرەمەرگا دیتە تەنگانە
گیانی فرزەندیش لە لات قەڵغانە

زۆر برا هەیە، کە ماڵی برا
لەگەڵ برایشا برایی بڕا

تا باوک ماوە برا برایە
میرات کەوتە ناو هەراو هوریایە

هەندێ تەماعیان هێندە مەحکەمە
سوێندی درۆیان خوارد لە مەحکەمە

حوججەتی جەجە مایەی درۆیان
(حجرالاسود) ڕۆی کردە ڕوویان

گوناه لە پارە بەوەفاترە
تەنها گوناهە هاودەمی قەبرە

حاجیەتی بۆ من زۆر کەڵک ئەگرێ
باوەڕ بە سوێندی درۆم ئەکرێ

نازانم دنیا داری بێ بەرە
دەورەی ژیانم پێچی مێزەرە



خـوا زینـدەوەری جـوێ جـوێی دانـاوە
هیچکـەس لـە وێنـەی یـەک نەخولـقاوە
سروشـتی ئـادەم لـە چـوار عونـسورە
زدی یـەک: بـاو خـاک، ئـاوو ئـاگرە
ئەمانە لەگـەڵ یـەک چۆن هـەڵدەکـەن؟
تـا دەسـتیان بـڕوا یـەک لـە نـاو ئـەبـەن
بۆیـە گـەورەیـان لـە سـەر دادەنـێن
کـە هـەڵـکردێکیان بکـەوێتـە بـەیـن
بـۆ ئـەوکـەسـانەی کـەوا بـەدخـووە
لـە لـە بـەهـشتەوە کوتـەک هـاتووە
ئـەگـەر تـەوژمـی بـاگردین نـەبـێ
دڵـۆپەیـش ئـەبێ‌و خانوویش ئـەتـەپـێ
گـا بـێ نـەقیـزە هۆناکاتـەوە
فیـل بـە بـێ چـەکـوش مـل ناداتـەوە
ئـەسپی بـێلغـاو سـوار هـەڵدەگـرێ
سـەگ نـەبیـەساتیەوە میوانـت ئـەگـرێ
هـەنـدێکی وایـش هـەن بـە دڵـنەوایـی
خزمـەتـت ئـەکـەن زۆر بـە ئـازایی
بـەلام ئـەوانـە بـەدکـار نایـەوێ
تـوخن بـە گـەورەی دیـوانی کـەوێ
خـوا فـەرموویـەتی: شـەیتـانی ئینـسان
هـەر لـە ئینـسانە بـۆ درۆی نیـسان



هـەنـدێ چـشت هـەیـە قـەدری نـازانی
کـە ڕۆیـی لـە دوای ئـەو پـەشـیمانی
بـە پـیری خۆشـی جوانیـت دیتـە بـیر
جـوانیش کـە ڕۆیـی نایـەتـەوە گـیر
کە نـەخۆش کـەوتی ئـەڵێی ئاخ و داخ
هـیچ خۆشـتر نیـە لـە بـەدەنی سـاخ
پـارەیـش لـە سـەرفی خـۆت ئـەتـۆرێنی
نـایخۆی خـەمیـەخـۆی کـە ئـەیـدۆڕێنی
کە بە جلی جوان پیاو پەسـەنـد ئـەکـەی
لە لای هونەرمەند خۆت بە پەند ئـەکـەی
فریــشتە هونــەر نیــە کــە چاکــە
لــە شــوێنێکدایە لــە بــەد بێباکــە
ئــەگــەر ئازایــە بــا بێتــە ناومــان
ئەویش وەک (هاروت) ئەخەینە زینـدان
بیــدە بــە دوژمنبــە ســەرفــرازی
بـەلام لـە دۆسـتت چـشتێ نـەخـوازی
هەر چەند شاردنەوەی سڕ سەر سڕ ئەکا
سڕ نـەشاردنەوەیـش سـەر لـەبـەر ئـەکا
بـە جـەزای گونـاە بـا توونـاوتوون بی
نەک شەرمـەزاری عـەفووی دوژمـن بی
وەک (دێــوژن) بــە، ســێبەرت نــەوێ
لــە کووپــەی خۆتـا، ڕاکــشێ شــەوێ



مـار تـا زینـدووە بـە پـێچ ئـەکـشێ
سـەری پـان بـۆوە، ڕاسـت ڕائـەکـشێ

هـەیـە لـە بـەدی زۆر قـۆرت ئـەبینـێ
کـە دەرفـەتـێ دێ هـەر تیـێ ئـەچێنـێ

باوکمـان بـە گـەنم بـە هـەشتی دانـا
گـەنمـە بـۆ داوئـەبـێ بـە دانـە

ئـەڵـێن: جـەهـەنـەم لـە دەم مارایـە
ئـاگری گـرانی وا لـە کارایـە

پـڕ بـەردەرگامـان ڕازیانـەیـە
ژانـەزگ مـشتەی نـاو هـە مانـەیـە

لایـە یاسـاغەو لایـە بـەرەڵـلا
بـەرد بـەستوویەو سـەگ گـەمارۆ ئـەدا

یەک بە سەد ئەشیا شەن و کەویەتی
مانگانـەی مـیری لـە جێـی خۆیـەتی

زۆر مەئموور دەرچوون کـەوتنە کاسبی
مـەعـاش! کـە تیـرم نـەکـەی، با نـەبی

تـا ئـەمـڕۆ ئێمـە لـە ڕووی جیهـاندا
زۆر بـەختیـار بـووین لـە گـوزەراندا

ئێستایش هیوامـان وایـە لـە لای خـوا
لـەگـەڵ چلـەدا، چلـەی هـار بـڕوا

لـە سـەرو لـە ژێـر شـکا ئـەڵـەمـان
چـارەیـان بـڕا، کـەوتنـە (ئـەلئـەمـان)



(یەک شەمموو) نەمام بنێ، دێتەبەر
(دووشەمموو) هەڵسە بچۆرە سەفەر
(سێ شەممو) نەحسە بۆ کورد بەجەنگە
(جوار شەممو)ی بەهار سەیرو ئاهەنگە
(پێنج شەمموان) باشە بووکی تیا دەبەن
هەینی بە جەژنی مۆمین ناو ئەبەن
(شەممو) تەعتیلی جوولەکەی تیایە
لای من هەموویان ڕۆژی خودایە
بەلام چاوی پیش پیاو دەئەنگێوێ
تەئسیری زۆرە، بگرە لە کێوێ
(وان یکادوا) کە خوا فەرموویە
بۆ ئەوانەیە کە چاو لەدوویە
حاکمی بابان چاویان هەڵئەکەند
بەوە تۆڵەیان لە چاوپیش ئەسەند
چەندێ زوبانی بەدگۆیان بڕی
هەندێ (ژوورناڵی) جاسووسیان دڕی
ئاخ خۆزگە ئەمە ئەکرا بە قانوون
چاوپیش و بەدگۆ لە ناو دەردەچوون
زمانیان بڕن، گرۆی بەدگۆیان
شوێنێکی تریان بۆ دێتە زمان
ئەڵێن: خوا بۆیە بەدکار ئەزێنێ
لە ناو ئەواندا پیاوچاک بنوێنێ
ئەمە زەمانی مەهدیی پێ ئەوی
ئێستا کەس نیيە پیاو چاکی بوێ



ئـــەوەی دەزانی گۆشـــتی پـــێ نـــاگری
خـەمی بـۆ مـەخـۆ، بـە شـوێنیا مـەگـری!
بێ گومان هەرچی کە خواستی خـوا بـێ
بـە کـەس نـاگۆڕێ، هـەر دەبـێ وابـێ
بـــۆ خواپێـــداوان لـــە پـــڕ ئـــەبـــارێ
زۆر پاروویش لە قـوڕگ ناچێتە خـوارێ
خـوا نـەیـداوەتـێ کـە بیخـوا ئینـسان
کە چی پێی دەڵێن: لەغاوی شـەیتـان
کـەوابـوو ئیمـان بـە خـوای خـۆت بێنـە
بـە خـەفـەت دڵـی خـۆت مـەڕەنجێنـە
حـەدیـس فـەرمـوویـە: ئیمـان بـە قـەدەر
پیـاو ئـەپـارێزێ لـە ڕەنـج و کـەدەر
هیـــوا دەبـــینی کـــە کـــەم ئیمانـــە
هـەرکـردەی ئـەوەو بـردەی شـەیتانـە
خـوا ماڵـی دنیـای داوە بـۆ خـواردن
هـەر خـواردن چاکـەو خـۆش ڕابـواردن
دەوڵـەمـەنـد بـاوەڕ بـەمانـە ناکـا
ئـەو هـەر ئـەیـەوێ زۆرتـر پـەیـداکا
ئـەڵـێ: کـە پـارە خـەرجـکـەی نامێنـێ
کە نەشما، خەڵک، پێت پـێ ئـەکـەنـێ
ئـەمیـشە ڕاستە لای پـارەپـەرسـت
ئاخ مـەرگ بـواری کـەس نـادا بـە بست



ڕەشەبا شەڕیە، ئەیشڵێن بەهارە
چەرخی چەپگەردیش، شڕی بەهارە
خوا ئەم گەرشە بۆیە ئەنوێنێ
بڵێن: هیچ لە سەر ڕێی خۆی نامێنێ
خوا فەرمووی: ئەگەر لە قەڵایشدا بن
ڕزگاری نییە لە چنگی مردن
ئەمە بە چاوی خۆمان ئەبینین
کە چی بە مردن ئیمان ناهێنین
ئەگەر بە مردن ئیمانمان ئەبوو
گرانجانیمان لە ناو دەردەچوو
هەموو ڕزقێکمان یەک بە دە زیادکرد
ئابڕووی ئایینی ئیسلامیان برد
بۆ خوێنی هەزار قەپ درێژ ئەکەن
هەر بەو خوێنەوە ئەچن نوێژ ئەکەن
هیچ ساڵێ برنج وەک ئەمساڵ نەبوو
تێفکرن! نرخی لە وزە دەرچوو!
سەعدی فەرموویە: بۆ ئەم هەڵدایە
(بەرد بەستراوە، سەگ بەرەڵدایە)
منیش بێ ترسو پرس بن وا ئەبم
بە تەفرەی شەیتان زوو ئیغوا ئەبم
ئەم تۆزو خۆڵەی ئەیکانە خاڵە
لە ڕێی ئاییندا هەر غەشەو غەڵە



ئـەوکـەسـەی کـەوا لـە خـۆی بایـە
دووی بـا کـەوتـوو، ڕەنـج بـە بایـە
خـودبینی عـەکـسی ئاوێنـەی دێـوە
ئـەمـدیوی دیـوی، دێـوی سـەرکێـوە
بۆیـە گلێنـەی چـاوم خـۆش ئـەوێ
ئـەبینـێو چـاوی بـە خـۆی ناکـەوێ
دنیـا ئـەبینـێو خـودبینی ناکـا
عـەزیـزە لـە نـاو ئـەنـدامی چاکـا
بـەدکـار لای گـەورە کـە تێـدەکۆشـێ
پـەڵـە هـەور تیـشکی ڕۆژ دائـەپۆشـێ
خـوا ڕەگـی چقـڵ لـە بـن هـەڵـکەنـێ
دەست بۆ گوڵ ئەبەی، دەستت ئەڕنـێ
هەنگوینیش چزووی هەنگی لەگەڵە
بـەڵـێ هـەر تۆشـێ، نیـشی تێکـەڵـە
ئـەمـە فـەرمـوودەی ڕاسـتی (نـەبی)یـە
کـە لـە جیهـاندا ئاسـایش نیـە
ئەگەر سەرکەوتن تا سەر، سەربگرێ
بۆچی لە بەهەشت ئەکراینە دەرێ؟
دیـارە کـە خۆشـێ بـۆ کـەس نامێنـێ
لـە بـیر نامێنـێ کـەیفـەی دوێنـێ
ئـەمڕۆ کـەوتوویتە نـاو دۆسـت و ئاواڵ
کـە شـەوت لێهـات، خـەوە یـا خـەیاڵ
لـەگـەڵ تاڵیـشیا دنیـا شـیرینە
هـەنـدێک بـە دیـنی دنیـا بـێ دینـە

هــەیــشه كــه دنیــا (دەنی) ئــەزانــێ
دووره لــه دەوری دوونـــان بــۆ نانــێ

بــه هیــوای ڕەزای خــودا بــێ غــەمــه
لــه پاشــەبــەرەی نهــوەی ئــادەمــه



دوژمـــــنی یـــارو، یـــاری دوژمنـــــان
دوژمنێکـــی ڕاســـت چـــاکترە لـــەوان
دوژمـن بـە درۆ خـۆی دەکـا بـە دۆسـت
ڕۆژێـک ئـەیبینی دەردەچـێ لـە پۆسـت
چونکو خوا ڕاستەو ڕاستی خۆش ئەوێ
داری ڕاســت بــە لای چــەوتـا نانــەوێ
گۆچــان کــە بــە زۆر ئــەچــەمێتــەوە
لــە ئــاوا داینێیـــت، ڕاســـت ئـــەبێتـــەوە
(بەدگەوهەر) شەوقی (فویە) ئەنوێنێ
کـە (فویـە)ی لاچـوو شـەوقـی نامێنـێ
ئەڵماس بە (کان)ی خۆی خۆش (تینەتە)
بۆ پـەنجـەی پیـاوی گـەورە (زینـەتـە)
ئـــەوەی سروشـــتی خـــواداوی پاکـــە
لــە درۆی بـــەدخـــواو دوژمـــن بێباکـــە
چوار کەس لە چوار جێ خۆیان ئەنوێنن
لەو چوار جێیە (گۆی) هونەر ئەفرێنن
ئـازا لـە جـەنگـا، خـویش بـە زەبـوونی
دۆسـت بـە تـەنگانـە، ژن بـە نـەبـوونی
گـەورە کـە هـۆش و دووربـینی لا بـێ
ئـەشـێ (بـەدزوبـان) لێـی تـەوەڵـلا بـێ
مـــەســـــنەدی دنیـــا کـــە گڕوپفـــە
کـــە بـــۆ ئازاربـــێ شایـــستەی تفـــە
هـەنـدێ بـە پـارە سـەڵـەم ئـەبـڕن
دانـەی داوێکـە پێـی خـەڵـکی ئـەگـرن
هـەنـدێکیش چاکـە بـۆ پـاداش ناکـەن
هـەر بـە تـەبیعـەت مایـل بـە چاکـەن



هەندێ وەک (کەروێشک) خەوی درۆیە
هەندێ وەک (ڕێوی) بەچلوچۆیە
(کەمتیار) بەوەی پێی دەڵێن چاکە
قولەپێی ئەسمەن، نقەی بۆ ناکا
(تانجی) قەلادەی زیوی بکە مل
کەروێشکو ڕێویت بۆ ئەخا لەگل
سەگیش بە نانێ نایەڵێ (دوون)ان
بە دزی شەوان ڕووبکەنە مالان
ولاخ بە (ئالیک) ئەتبا بەڕێوە
خزمەتکار بەندی خۆراکی شێوە
ئەگەر ئەولادت باش نەکەوی بەخێو
لە هەموو شوێنێک لێت ئەبێ بە (خێو)
خوا کە گیانو نان ئەدا بە بەندە
ناسینی ئەۆیش بە (کەرەم) بەندە
کەم کەس چاکەیان وا لە پێش چاوە
(بەدنمەک) سپڵەی ناوە، بەدناوە
لە پێشدا (چەقەڵ) لە ناوشارا بوون
(سەگەل) فێڵیان کرد، ئەوان بۆی دەرچوون
ئێستا کە بە شەو، دێن دەلوورێن
سەگەل بە (یۆخ، یۆخ) ڕایان ئەفرێن
ئەم پەندە کەڵکی ئەوە دەگرێ
بە بەڵێنی سەگ باوەڕ ناکرێ



هەر قینە دڵی دۆست ئەڕەنجێنێ
(حیلم) ئاگری قین دادەمرکێنێ
(شەیتان) یەکێکی داناوە لێرە
کورتە باڵایەو چاوێکی کوێرە
شەیتان لاسایی ئەو ئەکاتەوە
بە بێ (شخارتە) ئاگر ئەکاتەوە
(دەهۆڵ) بەو دەنگەو بەو شیرەتییە
سەری بێمەغزەو هەوای پەتییە
بەڵام سەد عاقڵ هەڵدەپەڕێنێ
هەزار کەس لە دوور بۆ شایی دێنێ
چاک ئەڵێ ماڵی بەدکار ئاوا بێ
تاریکی نەبێ، ڕۆژ قەدری نابێ
بە زستان ئینسان ئاگر یاد ئەکا
هاوین قیمەتی بەفراو زیاد ئەکا
دەوران دەورانە هاوین زستان
لە سەر هیچ حاڵێ نامێنێ ئینسان
نەخۆشی قەدری ساغی ئەنوێنێ
برسێتێ تامی نانت بۆ دێنێ
هەندێ کە لە پڕ دەوڵەمەند ئەبن
یا پیاو ئەکوژن، یا ئەیدەن بە ژن
تازە دەوڵەمەند خانوو ئەکڕن
یا ئۆتۆمبیلی تیا لێ ئەخوڕن
لەوە ناپرسن خەڵکی ژێرکەوێ
شاهی هەر خۆشە بۆ تەنها شەوێ



سەیری نادان کە، خەم ئەڕەوێنێ
(تەرسەقول) ژانی چاو ئەشکێنێ
(مێباز) بە ئازا ناوی ئەبڕێ
ژن لێی دەرکەوێ، شاربەدەر ئەکرێ
(زەروو) خوێنێ پیس لە نەش ئەمژێ
(ئەسپێ) بە میکرۆب ئینسان ئەکوژێ
(گوێز) بەو بە رزییە بەری وا وردە
تەرزێکی (شووتی) بەشی دوو گردە
(وەلەک)ێ پەنجا (وشتر) یەخ ئەدا
(گولله)یێک، ئاگر لەویش بەرئەدا
بە تایی، شایێ تەختی تەخت ئەبێ
یەکێ بە ئەسپێ خاوەند بەخت ئەبێ
لە کێلی قەبری شای (قەلاچوالان)
نووسراوە هاوار بە دوو (جلق)ە نان
ئێستا دوو سەدەو کەسیش ناپرسێ
دەوری مەهدییە وا کەس ناترسێ
تا دێت زەمانە ڕوو لە (بەدی)یە
بەرێکەوت باوی (نەدیوبدی)یە
ئێرە زۆر چاکە ئەولا بڕوانین
هەموویان دزی (گوێلک)ی خۆیانن
ئەم حالە دیارە خواستی خواییە
دوان لە کاری خوا، خۆڕاییە



سپلە شەربەتی گیانی دەرخوارد دەی
ڕۆژێ نەتدایێ، ئەڵێ (بڕۆ دەی)

سەگ پاڕووە نانێ لە تۆ ببینێ
شوێنت دەکەوێ بۆ هەموو شوێنێ

هونەر لای پیاوی (نەوسن) نابینی
(تەن پەروەر) هەڵدێ کە گەیە تینی

زەوی لە ئاسمان هەر بۆی دەبارێ
لە زەویش بۆ ئەو، تۆزو غوبارێ

کەوابوو ئەبێ پایە بڵندان
پارە ببەخشن بە مستەمەندان

خوا چاوی لێیە، عەیبت ئەپۆشێ
هاوسێ بۆ عەیبت، لە غەیب ئەکۆشێ

خراپە بکە لەگەڵ پیاوی چاک
بەلام مەرحەبا مەکە لە ناپاک

چاک خاک بۆ سەر خۆی ئەبێژێتەوە
ناپاک میللەتێک ئەرێژێتەوە

بێ دەوڵەتێ ڕوو ئەکاتە شارێ
بە (دەوهن بە ئاش) باراش ئەهاڕێ

ئەم قەومی کوردە بەوە دەمرێ
هیچ کەس، هیچ کەسێ لە ژوور خۆی ناگرێ

ئەو دەڵێ خاوهند پێوانەو گەزم
ئەم دەڵێ ئەزم وا هەڵدەبەزم

ڕۆژێکیان لێ دێ کەوا سەرسەختی
ئەبێتە مایەی کزیو بەدبەختی

ئەوسا کە دەورلێ ڕووی کردە کەچی
ئەڵێ (گەزی چی)؟ لاچۆ (جاوی چی)؟



بەورو ڕەشەبا، حەز لە یەک ناکەن
خوا با هەردووکیان لە یەکتر ڕاکەن
ئەم دوانە هاوین ئەگەر یەک کەون
هەناسە ئەبڕن (مێمل)ی خەون
چەند خۆشە هەوای ساف‌و سینەی ساف
لە پێشدا ئەمە، خوا دابووی بە (جاف)
ئێستا لە شوێن (ڕست) خێوەتی شای جاف
ڕستی (ڕەست) ئەستۆی پێچا بە تاناف
(پۆکەر) ئالیکی خستۆتە جۆکەر
دیارە پیشەی وا چۆن ئەچێتە سەر؟
ئەی: گڵە کوێر بی، بۆ مەحموود پاشا
دەک شەرمەزار بی چەرخی چەواشا
لە شوێن ئاوازەی قورئانی ئەوان
کار کەوتە (کارێ) و (فلۆش) بە شەوان
گوایە (ئیدمان)ی پایەی بڵندە
بەڵام کێ ئەڵێ کەرت بە چەندە
شەڕ خاوەند موڵکی کرد بە (ملیۆنەر)
یا هەزار دینار بدەن بە (پۆکەر)
خۆ کەسیان ناڵێن هەژارمان هەیە
چاو هەڵنابڕن بزانن کەیە؟
دوای ئەوەی شەڕو گرانی لاچوو
ئەڵێن: دریغا ئەویش خەوێ بوو
وەک من بە دەنگی ئیزاعەی کوردیم
ئەڵێم خەوێ بوو، دیم و یا نەدیم



لـە نـاو گێـژاوی گـەردشـی دەوران
بـە نـەپـەشـۆکان ئـەبیـە مـەلـەوان
ئەگەر سەبرت بوو هیچ ناشلەژێیت
کە پەلەت نەبوو هەڵناخلیسکێیت
هاونیشینی بەد، ئەخلاق ئەگۆڕێ
پیاوخراپ چاکیش ئەخاتە گۆڕێ
ئەو پادشایەی گوێی لە (هامان) گرت
لەگەڵ میللەتی خۆی دەری نەبرد
ئیمان ئەوەتە کە لە دڵ دەربێ
نەک ترسی شیرو حەپست لە سەر بێ
لەگەڵ خراپا نالێم تو چاک بە
بەلام بە کردەی چاک خۆت بێباک بێ
لە بەخش و بەخشین پەشیمان مەبە
بە شەرتێک دۆستی (لە ئیمان) مەبە
چەند خۆشە خەوی خۆشی بێ گرێ
دوژمنت نەبێ، خۆشیت سەرئەگرێ
ڕۆژ ئەرکی مەسنەت، شەو خەیاڵی ماڵ
سرەوتت نابێ و عەیشت ئەبێ تاڵ
تۆ کە ئەزانی هیچ تا سەر نییە
ئەم تەقەللایەو ئەرکەت بۆچییە
لێدە لە تیپی ڕەندان بە تی تی
چی دەبێ، ببێ، کەیفی خۆیەتی
هەزاران وەک تۆ هات و تێپەڕی
پاسیان ئەکردو سەگیان پێ وەڕێ



هەرکەسە هەوڵی گیانی خۆی ئەدا
هیچ کەسم نەدی ڕۆح بکا فیدا
هەرچی هەڵدەستێ نیشتمان پەروەرە
کە دەرفەتی دی، بەشی خۆ بەرە
ئەگەر هەر مەلێ هەنجیرخۆر بوایە
ئەشیا بە کاڵیش هەنجیر نەمایە
ئەوانەی کەوا سەرکەوتوون تەواو
بە فیداکاری لاوان هاتنە ناو
هەندێکیش پیاویان ئەکەویتە ڕێ
توێکڵە شووتییان ئەخەنە ژێر پێ
(دڕک) ئەخەنە ژێر، کلکی ئێستری تۆڕ
بۆ ئەوەی سواری بگلێنێ بە زۆر
لیسی کوێرییە کەوتۆتە ناومان
هەروا ئەکەوێ لە سەرو چامان
بۆ هەموو کارێک غایە پێویستە
بێ غایەو مەسلەک هەر نەنگەویستە
ئەوەی ئەخوێنێو ئەیهێنێتە کار
ئەبێ بە چرا بۆ ڕووناکی شار
هەندێکی واش هەن چراوەکوژێنن
(جووتە) ئەهاون، کاسە ئەڕژێنن
ئەمانە ئەبێ کە (ئەشکیل)یان کەن
یا بە (نەقیزە) ڕەقەنکێلیان کەن
هیواشیان هەیە (قۆچ) ئەوەشێنێ
کەڵەکی (میری سوور) ئەڕووخێنێ



بەر چاوو پێلاو هەردووکیان تەنگ بێ
ئەبێ پێی دڵ و پێی ڕۆین لەنگ بێ
ناوەجاح بێتە بیخەرە سەر کار
لە پێشدا برای خۆی ئەدا لە دار
خوا غەنی کردو لە وزە دەرچوو
(ان الانسان لیطغی)ی فەرموو
کە بە هەڵپەهەڵپ، پاروو نەجوورا
کاتێک زانی لەبینت گیرا
ئەگەر عەیبی خۆت بێنیتە پێش چاو
(عەیب) لە کەس ناگری، زوو ئەبی بە پیاو
بەڵام ئەو عەیبەی کە واپێتەوە
بە زۆری (کوتەک) ناشارێتەوە
ئەوی بێعەیب بێ، خوایە بە تەنیا
لە پێغەمەران عەیبیان دەرهێنا
سەرکەوتنی شاخ چەندە گرانە
هاتنە خوارەوەی هێندە ئاسانە
قەسابی ناشی پێستی مەڕ ئەدڕێ
لەپڕێ هیچ کەس نابێ بە کوڕێ
ئەگەر (مەبعووسی) بێ مەعاش ئەبوو
(ڕەئیسی تەجنید) ئەرکی تووش ئەبوو
گوێم لێبوو پیرێ، وای ئەگوت پیرێ
خوا دەوڵەت بۆ سەر دەوڵەت ئەنێرێ

❀❀❀

ئـەگـەر لـە پـارەی خـەڵـکی بپرسـیت
چـاوت تێرنابـێ، تـا دەمـری برسـیت

ئـەوەی بـە چاکـەی چاکـان نـەزانـێ
دۆش دادەمێنـێ دوایـێ بـۆ نانـێ

هـەر شـوێنێ کـە ئـاو گـرتی ئاوایـە
(دێمـەکـار)کـێڵان ڕەنجـی بـەبایـە

ئـاو بـۆ خواردنـەوە زینـدەگـی دێنـێ
لـە وزە دەرچـێ پیـاو ئـەخنکێنـێ

(هەنگ) کە بۆ هەندێ، هەنگوین ئەڕژێنێ
بـۆ پیـاوی (ناعـال) ژار ئـەپرژێنـێ

تـا (زوقـوم) نـەبـێ دەسـتت ناتـەزێ
تـا پێـی پیـا نـەنێـت ماریش ناتگـەزێ

دەسـتی دۆسـتان لـە خـەنـە بگـرە
دەسـتی دوژمنـیش، اری پـێ بگـرە

(هـەلاتـت) نیـە بۆیـە وا لاتی
حـەلاڵ خۆرییـەو کـەم دەسـتەلاتی

ڕەمـەزان هـەر چـەنـدە دیـسان دێتـەوە
لـە کـۆڕی (پۆکـەر) جێـی نابێتـەوە

پـارەدار ئـەڵـێ گـرانی کێیـە؟
چولـەکـەی دەشـتیو بـەردی دەشـتیە

ئوتۆمـۆبیلچی قۆنـاخ ئـەسـێنێ
بێ دەرپێش، هـەر جاو لـە خـەو ئـەبینێ



هەرزەگەرد بە هیچ پێڵاو ئەدڕێ
هەندێ ڕۆژووەوان ناشتای پێ ئەبڕێ
دڵو زوبانت کە یەک نەکەوێ
باری ئیمانت لاسەنگ ئەکەوێ
ناڵەیێکی شەو بۆ قاپیی یەزدان
کاریگەرترە لە نوێژی ڕۆژان
(شەوان خەڵوەتە، یار بێ ئەغیارە)
(گشت لایی نوستوون، دۆست خەبەردارە)
سەردەقی مانگی خێر، ڕەمەزانە
نۆمینەی حەجیش، جەژنی قوربانە
بەلام ئەم پەندە لای ئێمە باوە
ڕەمەزان بەجەنگەوە (سەفەر) بەدناوە
لە ڕەمەزاندا (شەیتان) دەرئەکرێ
بنیادەمی بەد لە جێی دائەنرێ
سەد نوێژ بۆ ئاغاو شێخ دائەبەسترێ
بەلام ڕۆژوو هیچ ڕیای تیا ناکرێ
حەج پیاو لە گوناە پاک ئەکاتەوە
زۆرتر بۆ سوێندە کاتێ هاتەوە
تەفرەی (مامەڵەی)کە هاتە مەیدان
قوڵفی کابەیە سوێندی درۆیان
ئەڵێن تەئسیری حەج وەک شەرابە
پێی دەرئەکەوێ چاکەو خرابە



میوان ڕزقیخۆی لەگەڵ خۆی دێنێ
کوێ خانەخوێ بێ لە جێی دەستێنێ
خوا فەرموویەتی تۆ هەر بیەخشە
سەد هێندەی ئەوت بۆ دێ مەلەخشە
ئەو ڕزقەی کەوا خوا بۆت ئەنێرێ
لە ئەجەل زیاتر، لە دووت ئەگێڕێ
بەلام ڕزقی خوا شەرتی باوەڕە
بێباوەڕ ماسیش ناگرێو تەڕە
بە بەش ناڕەزا، لە خۆی بێزارە
تۆ دایم لە خۆت خوارتر بنوارە
هاونشینی چاک خەم ئەڕەوێنێ
بەدخوو پرشنگت، لێ ئەپرژێنێ
مەبە بە مورغی قورسە هێلانە
خۆت لە دنیادا غەریب بزانە
ئەو دراوسێیەی کەوا بێوەیە
بزانە چاکەی بەسەرتەوەیە
کە دراوسێکەت بێشێو هەلیکرد
حەق وایە فریای کەوی دەست و برد
کەبابی سەخی دەوای دەردانە
پاقلاوەی چرووک دەردەو سندانە
چەند خۆشە لەگەڵ یەک دوو، دۆستی چاک
هەڵسیو دانیشی بە دلێکی پاک
ئەوسایە بلێی بەهەشتی دنیا
بە من دراوە بە تاقی تەنیا



ئەو کەسەی ئەبێ بە وایستەی خێر
بۆ باغی بەهەشت ئەبێ بە ئاودێر
بەهەشت قۆناغی پیاوی سەخییە
(بەخیل) لە سایەی (توبا) بەرییە
ئەوی ئەیبەخشی مایەی نەجاتە
هەرچی مایەوە ماڵی میراتە
سێ ڕۆژ ناکۆک بی لەگەڵ برای دین
دڵت ژەنگ ئەگرێ (مەحرورمە) لە دین
عەزیزی قەومت کە هاتە کزی
دەسگیریی بکە زۆرتر بە دزی
پزیشک ئەپرژێ لە پیر وەک (کوورە)
بە دەست خۆی نییە تۆ لێی ببورە
کە بەڵێنتدا زوو بە جێی بێنە
شەرت بە جێهێنان، ڕۆکنی ئایینە
کە بە دۆستی دەستێکیت گوشی
ئەبێ بۆ ئیشی بە دڵ تێکۆشی
هەر خزمێ لەگەڵ تۆدا نەسازێ
ڕاستی کەرەوە بە چەکوش و گازێ
چونکە مودارا حوکمی دنیایە
ئەوی موداری نەبێ تەنیایە
بە پێی عەقڵی خەڵک لەگەڵیان بدوێ
کە گیا بە هەوای سروشتی ئەڕوێ



مـن بـۆت ئـەنووسـم بـە دەرس بیخوێنـە
دەسـتێ کـە حـاکم بیبـڕێ بـێ خوێنـە
بـەڵام ئـەو دەسـتەی لـەو هـەڵـدەبـڕێ
حـەق بـێ! خـوا نـانی ئـەویـش ئـەبـڕێ
خـەڵـک بۆیـە ڕانی بـە شـوان ئـەسپێرێ
کـە لـە گـورگ‌و دز، پاسـی بـدێرێ
ئـەگـەر گـورگ هـات‌و مـەڕێکـی فڕانـد
ئەو گورگـە قـەدری شـوانەکـەی شکاند
شوان ئەبێ سەگی گورگ خنکێنی بێ
خۆیـشی گاڵـۆکی سـەرشـکێنی بـێ
ئەوەی ماڵ بە زۆر لـە خـەڵـک ئـەسێنێ
خۆڵـەمێـشێکی لـە جـێ ئـەمێنـێ
گـڕی ئـەو ئـاگرە بـە چـاو دیـارە
کـەس بـاوەڕ ناکـا هێـشتا لـەم شـارە
ورچ هـات بـە خۆیـاو کـەوتـە چـەپۆڵـە
پـشتی پـڵنگی کـرد بـە کـەمۆڵـە
کـەس لـەمـە سـەری لـێ سـوور نامێنـێ
خـوا تۆڵـەی بـزنی بـێ‌شـاخ ئـەسێنێ
بـە (دیمـوقراتی)مـن ڕەنگـم سـوور بـێ
خـوا بکـا پـڵنگ‌و ورچـم لـێ دوور بـێ
پیـشە یحو کمـدار دڵـنەوایـە
لـەسیاسـەتـدا (ئـابی) دایـە



خەزان هات گەڵای ڕەزان هەڵوەری
تێکڕا تێپەڕی بەرو سێبەری
درەختی وەفا هەر ئەو چاک ئەکا
داڵدەی سێبەرو، بەفر، بۆ کەس ناکا
شێتێک کە سەودای وەفای کەوتە سەر
نایگاتێ، هەروەک شوێن کەوتەی سێبەر
(عەنقا) بە خەیاڵ باڵی بۆ ئەکرێ
(وەفا) بە هیوایش ڕێی پێ نابڕێ
ئەم بووکە کۆنەی کە دنیای ناوە
هێشتا (جیاز)ی بە کەس نەبڕاوە
شەیتان لە خەودا دیتە باخەڵ پیاو
دنیا بە خەۆیش ناکەویتە داو
بۆ هەندێ دۆستی بە سەرزارییە
ئەوەی ئەیداتێ دڵ ئازارییە
پیاوی دنیایی نەیوتوە ئۆخەی
وەک (هل من مزید) هەر بانگ ئەکا دەی
تا دوایی لە دوای ئەو بە جێ ماوە
سووکێ بۆ مێردێ ژنی براوە
هاوین کلاوێک با فڕاندبووی
پەلەیان نەبوو، پایز کەوتنە دووی
منیش کە عومرم ڕۆیی و بە سەرچووم
وا شوێن کلاوی بابردوو کەوتووم
واتەیێک لە ناو (سنە)دا باوە
وا (مەلیچک)ێک ها وەحەواوە
ڕووئەکاتە خەڵک هەروا ڕووبەڕوو
یێژێ کە ئەوەی لە دەست دەرچوو چوو



هەر قینت هەڵسێو دەست بوەشێنی
پەتی ژیانی خۆت ئەپچڕێنی
خەتی جارانمان جەوهەری شیر بوو
نەخوێندەوارمان ئازاو بەگیر بوو
ئێستە بۆمبایە لەگەڵ کەوتە کار
نە شیرت دێڵێو نە دار نە دیوار
جاران ئەیانگوت، فلانکەس مەردە
لە لێقەوماندا کوردی نەبەردە
ئێستا کەلیمەی (مەرد) وەرگەڕاوە
لە جێی ئەو (درەم) پەسەند کراوە
(دینار)یش ناوی بە فارسییە
(دین ئار)ەو پیشەی فریادڕەسییە
کە چی (دینار)ە جێنشینی (دین)
سەودای ئەو بووە بە لەکەی ئایین
پارەدار ئەڵێ: خۆ ئەم قسانە
واتهی لاتییەو داخی دڵیانە
ڕاست ئەڵێن بەلام ئەوانیش بە فێڵ
هەزار هەژاریان خستۆتە ئەشکێل
ئاخ چی بکەم ئەمە دەردێکی قورسە
کە ترس لە پرسە، لەویش مەپرسە
شاعیر لە هەموو ئەزمێ ئەبێژێ
نەیزانی شیری داپیر ئەرێژێ



ئەڵێن بەرد لە جێی خۆیا سەنگینە
ئەوی کە تۆرا، بچۆ بیبینە

ئاو کە مایەوەو نەڕوا لە بەری
کەس لە بەر بۆگەن ناچێتە سەری

ئاگر مەرحەمەت بۆ کەس نانوێنێ
بیشی پەرستی، هەر ئەتسووتێنێ

دار چاکە ئەگەر بێتو بینێژێ
زۆری پێ ناچێ بەری ئەچێژی

دزێک نیوەشەو ئەچێتە ماڵێ
ئەیەوێ هەرچی تیایە بیماڵێ

لێی ڕائەپەڕین، ئەڵێن کورە کوێی
ئەڵێ من (بەگچیم) باوەڕ ئەکەن پێی

ئەڵێن: بەگچی چۆن بێ دەهۆڵ ئەبێ
ئەڵێن: بەیانی گوێتان لێ ئەبێ

بەیانی دەهۆڵ دەنگی دایەوە
بەگچی دزیبووی، هیچ نەمایەوە

پف لە (دۆ) ناکا، ئەوی لوا بۆی
هەرکەسە بووە بە دزی گای خۆی

(دز)و خاوەن ماڵ ئەگەر یەک کەوێ
بە کونەباندا گا سەردەکەوێ

پەندی پێشینان کە بێ مەعنایە
هەم (بێ بەهایە) هەم (بێ بەهایە)



بیانووی نەوسنیم دۆزییەوە بۆ خۆم
ئەوی ئازایە بڵێت: من ناخۆم
برسێتیّ ڕەگی هاریی پێوەیە
وەک زستان تۆفەو بەکرێوەیە
ئەم هەراو جەنگە هەر بۆ خواردنە
نەخواردن دوایی گیان سپاردنە
ئەو دەخواو ئەمیان تەماشا دەکا
دیارە لە دۆستی ئەو حاشا دەکا
یەکیّ زۆردارەو یەکیّ بیّزۆرە
بۆیە لە ناوا فیتنەو زۆر زۆرە
هەرچی بە بەشی خۆی ناڕازییە
ناسزاو سزای جەزای قازییە
کەس بە خۆی ناڵیّ سبەینیّ دەمرم
بۆچ باری گوناه لە ئەستۆ دەگرم
چەقەڵ کە فرسەت لە مریشک ئەبینیّ
لە پێشدا بەڕیز ئەیانخنکێنیّ
ئەڵیّ کە خنکان فڕیّ ئەدرێن
بە ناچار هەموو بە من ئەبڕێن
نازانیّ سەگی چەقەڵکوژ هەیە
ئەوی بە(وەیە) گۆڕی ئەوەیە
گشت سەرنویشتی ڕۆژی ئەزەلە
ئێمە دەخاتە سەر پەلەوزەلە
لەولایشەوە پێم ئەڵیّ: موختاری
کردە، خواکردە و تۆ گوناهکاری



بۆ ئەوەی بە دڵ بەندەی خودایە
سەرو ژێری خاک وەکوو یەک وایە

هەر ئەودەستەیەی کە خوا ئەناسن
هیچ خەمیان نییە، کە بێ کراسن

دەستەیێکی تر (کۆستۆم) لە بەرە
کە دایانماڵین خەمیان لەبەرە

هەندێکیش خۆیان بۆ ماڵ ئەکوژن
وەک (زەروو) خوێنی خەڵکی ئەمژن

کاتێ دەستی مەرگ ئەیانجەڕێنێ
هەموویان بەزۆر لە زگ دەردێنێ

بۆ دەولەت ئەوهی کە شێتگیرترە
تا باری قورس بێ، لە لای خۆشترە

هەرچی ئینسافی نا بەتاقەوە
ڕۆژێک ئەبینێ بوو بەفاتەوە

منداڵ خوێنی دایک ئەمژێ لە زکا
کە هاتە دەرێ ئاوڵە دەرئەکا

کە چی ئەوکەسەی کە (شەکر) ئەخوا
تووشی عیللەتی (شەکری) ناکا، خوا

بە تورکی (شەکر عیللەتی) هەیە
دوکتۆر ئەزانێ مردنی کەیە؟

(شوکور) وەک (وەفت) کە نابەدیدە
هەرچی بە شەکر بمرێ شەهیدە

(شەکر عیللەتی)و شەکر قیللەتی
لێکی بڕیون (قاوە)و داڵتی



ئەگەر (پەنجەرە)ی تۆ شووشەبەندە
بەرد بهاویە خەڵک، کاری تۆ گەندە
کە شەڕجێو بکەی لە کۆڵان
دایک و باوکی خۆت ئەکەی بە قەڵغان
ئەگەر تۆ ئێشی دەرزی بچێژی
بە سووژن خوێنی خەڵکی نارێژی
ئەوی ژاری چەشت لە زەردەواڵە
ئیتر هەنگوینی لەدەمدا تاڵە
هەیە بۆ تەفرەی دوو (حۆقە) ساوەر
حەجێ ئەنێتە پێناوی باوەڕ
مەئمووری گەورە ئاوە دەکێشێ
وردەڵەکانمان زیخە ئەنیشێ
ماسی کە زل بوو ئەچێ بۆ دەریا
(ئەژدەها)یش بە زۆر بۆ (دۆزەخ) بریا
ئاو لە جێیەکدا کە زۆر بمێنێ
ڕەنگی ئەگۆڕێو (زەروو) هەڵدێنێ
(زەروو) خوێنی پیس لە لەش ئەمژێ
(کوڵەوەیابە) کە پیاو ئەکوژێ
ئاخ کوڵەوەیاب، داخ کوڵەوەیاب
جەرگی عالەمت سووتاند وەک کەباب
لەم گێتییەدا دەنگی باش باشە
کە لە گۆڕیشدا یارەو ویلداشە



دەم مەنێ بە دەم (قلیانی) خواوە
لە بلێسەی بەسێت هێلکت براوە
لە کاری خوادا ورد مەبەرەوە
سەر شۆڕکەو، برۆ، لە دووری کەرەوە
ئەگینە هەر تۆ (سوخرە)کێش ئەبی
بە کاری (بێگار) ناوکەرێژ ئەبی
ئەگەر بڵێی من هونەر ئەنوێنم
بە کارزانی خۆم (مەسنەب) ئەسێنم
لە ڕەزاقیی خوا ئەکەویە ئینکار
ئەوسا ئەویش تۆ ئەخاتە ژێر بار
(هارون‌الرشید) کاتی میسری گرت
وتی: بەم مولکە (فیرعەون) خوایی کرد
لە قینا دایە دەست (قولەرەش)ێ
سەیرکەن خوا مولکی خۆی چۆن ئەبەخشێ
پەموودانەیان چاند، ئاو دای‌پۆشی
هاواریان بۆی برد هیچ بۆی نەلەخشی
وتی: ئەمساڵ خەڵک (خوری) بچێنێ
ئاو ئەیشواتەوە (چڵک)ی نامێنێ
ئێمە تێ‌ناگەین (حکمەالله)یە
ئیتر چییە ئەم قیرەو هەڵلایە
(رجال الغیب)ی ئەمساڵ (خووی) وایە
دەستەی خودپەسەند، ناخاتە کایە
وا چاکە، هەموو ئاوێک بنۆشین
چاو لە گوناهی یەکتر بپۆشین



هەورە تریشقە گرمەی بڕاوە
بۆیە (دوومەڵان) لێمان تۆراوە
دوومەڵان ناوی دەمەل لە کۆڵە
بە بێ تۆو ڕیشەی دەردەچێ، زۆڵە
کە چی بڕەوی زۆرە ئەمەندە
لەبەر زۆڵییە کەوا پەسەندە
بێ بارانییە کە گیا نەڕاواوە
نوێژە بارانەیش مۆدەی نەماوە
ئەمساڵ حەج بووبوو بە بابیبابی
پارەی ئێرە بوو، چوو بۆ (وەهابی)
من کە منداڵی شارم برسی بێ
ئەیدەم بەو ئەگەر لە خواترسی بێ
هەر مەولوود چاکە کە تام لە خۆیە
بەلام لەوەیشدا (کەوا بخۆیە)
ئەگەر سەیرانی نەورۆزی ئەمساڵ
بە دوو مەعاشم بۆم بێ بە ماڵ
بۆ هەموو کەسێک هەر سەیرانێکە
تێکڕا پێنج یا پراخ لەگەڵ نانێکە
چایش ئەخۆنەوە بە هەلپەڕکێوە
چۆپێی کیژانیش ئەبەین بەڕێوە
خوا ئەمساڵ گەورەی چاکی داوێنی
قەوم بە قدوومی ئەو خێر دەبینێ



هەندێ کەس کە هات نۆرەی خۆی دەست کەوت
ئەبینی سووکێ بەدارا سەرکەوت
کە بەرزبووەوە هێند بێترس ئەبێ
ئەمەندە ئەخوا هەتا قورس ئەبێ
کە قورس بوو ئیتر دار ڕای ناگرێ
تەقڵە لێ ئەدا بە سەرەنگرێ
وا چاومان لێیە ئەو چی بەسەرهات
کە چی لەو زیاتر ئەکەونە هەڵات
مێشێ لە هەنگوین کە پێی گیر ئەبێ
تا دێت مێشی تر لێی شیت گیر ئەبێ
میوەی نەگەیو زگ ئەیێشێنێ
تەماع بۆ پیاوان ڕووزەردی دێنێ
وا گەورەی دیوان کەوتۆتە بژار
لاڵو پاڵ کەوتوون، مشکو مار پەژار
ماری کەسیرە کە کەوتە هەتاو
هیچ ئامان نادا بە ژن و بە پیاو
دەرمانی ژاری مار، کە تریاکە
ئێستا بە (تریاک) زۆر کەس هیلاکە
پشیلەبور وتی: نەمرم بە تیرە
منو مشکوجێی ئەو ژنەپیرە
ئینسان وا ناڵێ چاوی ناترسێ
هەلی بۆ هەڵکەوت لە هیچ ناپرسێ
خوا فەرمووی ئێمە ئەمانەتیمان
هاتین خستمانە سەر کەژو کێوان
هیچیان نەیانویست (ئیبا)یان لێ کرد
ئەولاوە ئینسان هات پڕی پیا کرد



دنیـا لـەسـەر هـیچ بـارێ نـاوەسـتێ
نابـێ پیـاوی ژێـر پـشتی پـێ بـەسـتێ
هێجگـار ئـەوانـەی کـە لـەم دیوانـەن
ئـەگـەر بـایی بـن، شـێتو دێوانـەن
چونکـو لـە پـرێک کلکیـان ئـەگـیرێ
(بێنـەو بیبـە)یـان لـێ وەردەگـیرێ
کـەوای دیوانیـان لـە بـەر دامالـێ
روویـان نایێنـێ بچنـە هـیچ مالـێ
بـەلام ئـەوکـەسـەی سروشـتی چاکـە
لـەنـاو گێـژاوی چـەرخـا بـێ باکـە
ئـەلـێن (چـەرخ) لـە سـەر بـارێ نامێنـێ
ئـەمرۆ (گـەدا)یـە، کـە شـا بـوو دوێنـێ
سـەگـی بـەوەفـا کـە مووچـەدارە
پـشیلەی زیانکـار بـەشـی هـەر دارە
ئـەم دوو چـەورە بـێبـالا نییـە
مـەروانـە ئـەوەی کـەسـی لا نییـە
شەیتان رووی کردە لای هەر سەرمەستێ
دەمودەسـت، دەمو دەسـتی ئـەبـەستێ
زوبـانیش زۆرجـار مایـەی زیانـە
دەمو دەسـتی چـاک خۆشـی ژیانـە
ئەگەر هـەلـت کـرد بـە وشـکو بـە تـەڕ
نـاوی خـۆت بنـێ، پاشـای بـەحـرو بـەڕ



کیسەی باخەڵت و کاسەی هەژاران
خاڵی کەو پڕ کە ئەبی بە یاران
دوو ڕێت لە پێشە لە (گردی سەیوان)
هەوای ئەمان، هەواری ئامان
وەک خاک بە فەیز بە، بۆ هاوجنسی خۆت
خاکیش ئەبێتە دایکی دڵسۆز بوت
ئەوەی ماڵ خەڵک بە زۆر ئەسێنێ
(گۆڕەوشار) هەمووی لە زک دەردێنێ
(جۆ) بۆ فەقیر دێت، ئەیدزن ئەیبەن
گۆڕ وایە وەک کەر، کلک و گوێیان کەن
ئەوانەی (کووتاڵ) لە خەڵک ئەگۆڕن
بێبەرگ و کفن شایستەی گۆڕن
ئێستا دزێتی بووە بە هونەر
نازانم ئەمە چۆن ئەچێتەسەر
دەستبڕ کە دەستی لێ هەڵئەبڕن
ڕۆژێکیش ئەبێ دەستی ئەبڕن
کێشانە بە ڕاست ئەمری قورئانە
ئێستا بە (قەپان) قەپان، قەپانە
یاخوا ئەوانەی کە (سەنگیان)سووکە
گورزیان گران بێ بە (مەڕنەمووکە)[1]



١. مەڕنەمووکە: مەبەست لە (من ربک)ەیە.

نـادان ئـەگـەر بـێ‌و زوور دانـا کـەوێ
دانـــایی دانــا، هـــیچ داناکــــەوێ
دووکەڵ لـە ئـاگر هـەرچەند لە ژوورە
ئـەو چـاو دێشێنێ‌و ئەم بۆ چاو نوورە
بروانــە (بـــرۆ) بـــە ســەر چـــاوەوە
ئەو (کەچ) و ئەم (ڕوون) لە سەرچاوەوە
دڕکو داڵ کـە وان بـە سـەر دەریـاوە
قـــەدری مــرواری پــێ نەشـــکاوە
کەری گوڵ کە پێش حوشتر ئەکەوێ
بـــەوە قیمــــەتی حوشـــتر نانـــەوێ
مـەڕوانـە ئـەوە کـە ئـەمڕۆ (دونـان)
(قـەلـە مرداری) کـردنی بـە چـوار نـان
گـــــڕو پفێکــــــە ئـــــاگری دزان
کـە ڕۆژیـان لێهـات، لـە تـەنـدوور خزان
پـەرێـزت پـاک بـێ، باگوڵـەوەمەچن
لەسەر شوێن پاکی لێت بێ بە دوشمن
کـەرویـشک لـە خـەودا چـاوی ئـەبینێ
کە (دیاردیت)لێ کرد توند ئەیقووچێنێ
ئـــەوەی کـەە ئابـڕووی نـەبـەتاقــەوە
کاتێـــک زانی بـنوو بـــە فاقـــەوە
مـەلی بـەسـەزمـان گۆشـتی ئـەخـوری
دڕنـدەیـش گۆشـتی دەرخـوارد ئـەدرێ



مەلای مەزبوورە چووبووە سەر دارێ
لقێکی ئەبڕێ بیکا بە بارێ
ئەیویست ئەو لقەی خۆی وا لەسەری
لەبندا ببڕێ، عەقڵی وای بڕی
ڕێبوارێ پێی‌وت: مەلای سەردارێ
ئەو لقە ببڕی ئەکەویە خوارێ
مەلا لێی نەبیست، سا ئەو بەڕێ‌بوو
ئەم لەگەڵ لقدا سەرەنگرێ بوو
کە کەوتە خوارێ، وتی ئەم پیاوە
لە غەیب ئەزانێ، (وەلی) تەواوە
ڕای کرد، چوو پی‌وت: کەرامەت دارێ
تۆ کە زانیت من ئەکەومە خوارێ
ئەڵبەت ئەیشزانیت کە من کەی ئەمرم
توخوا پێم بڵێ لەبەرت مرم
وتی: عومری تۆ، پێت بڵێم چەندە
بە سێ بای زگی ئەو کەرە بەندە
منیش بەوانەی کە (کۆیۆن) ئەکرن
ئەڵێم: لقی ژێر خۆتان ئەبڕن
میللەت دارێکە کە سێبەرداره
چۆن لق و پۆپی ئەشکێ ئەو دارە
دەستی داد زۆریان ئەخاتە خوارێ
کەچی عار نانێن بە کەوتنی جارێ
وا چاکە بە داخ نیشانەیان کەن
کە عاریان نەنا، ڕەوانەیان کەن



ئـەو شـوێنەی کـەوا پڕیـە لـە نـادان
دانـا، ناچـارە دەرچـێ لـە ناویـان

کە زانیـت زۆردار کەوتوونە سەر کـار
یا مل کـەچ کـە، یا کـۆچ کە بە ناچار

سـێ تـیرە هـەیـە کـە هونـەرمـەنـدن
لەلای خواو بەنـدە، هەر سێ پەسەنـدن

یـەکـی زاهیـدە خـۆی ڕزگـار ئـەکـا
دووەم عالیمـە دەرسـی کـار ئـەکـا

سـێیەم بـەخـشندە کـە فریـادڕەسـە
هـەر ئـەوە کـەوا بـۆ ێکـەس کـەسـە

ئەو دووانـە کـەڵـکیان هـەر بـە زوبانـە
کـەڵـکی بـەخـشندە نانـە، بـۆ گیانـە

پیشەی پەسـندی خـوای پـەروەردگـار
کـەرەم کارییـە ئـەیهێنێتـە کـار

زۆر کەسی وەحشی توند لوو سەهەنـدە
بە دەسـەنـدە بـۆت ئـەبـن بـە بـەنـدە

کـە کـۆی کـەیتـەوە و بیـشارییەوە
ئـەڵـێن دامـاوە بـە بارییـەوە

کـە لـەڕێی خـوادا بـە دڵ بیبـەخـشێ
کردگـار گونـای ئـەویـش ئـەبـەخـشێ



ئـاو کـه تینـویتی ئینـسان ئـهشـکێنێ
زۆر جـاریش ئـهبـێ پیـاو ئـهخنکێنـێ
ئـاگر کـه چێـشتت بـۆ ئـهکوڵـێنێ
خـۆت نـهپـارێزی، دەسـت ئـهسـووتێنێ
هـهناسـهی هـهوا گیـان ئـهژێنێـێ
زسـتان بـێبـهرگ بی، ڕەقـت هـهڵـێنێ
خـاک خـواردەمـهنی پێـدەگـهیێنـێ
بـهسـهرتـا ڕووخـا ملـت ئـهشـکێنی
ئێمـه لـهم چـوارە دروسـت کـراوین
هەریەکە لە خووی، خۆی بەشی داویـن
ئـاوو خـاک مهنـدیو هـێمنی داوە
بـاو، ئـاگر تونـدیو تیـژی هێنـاوە
بـا کـهوتـه کـهلله، شـعوور نامێنـێ
ئاتـهش مـهزاجـیش پیـاو ئـهسـووتێنێ
کـهم کـهس ئـهبیـنم کـهوا لـهم چـوارە
بـه ئـهنـدازەیێـک بـڵێم بـهشـدارە
زۆری وا هـهیـه بـه بـا، بایـه
خـۆی بـهرز ئـهبینـێو پـارەبایـه
ئـهم ئـهفـسانهیـه هـهمـووی بایـه
چاکـهو خراپـه، دادی خوایـه
ئەگەر کردگار گوێی لە من ئەگرت
هەر چی چاکە بوو، بۆ خۆم هەڵدەگرت



سـەگـی بـەوەفابـە (زێـر) ئـەکـرن
پـشیلەی زیانکـار، کلکـی ئـەبـڕن
بـە (لبـاد)دانی مارهـەڵـدەکێـشن
داخـی بـێ دانی پـێ هـەڵـدەڕێـژن
(قوڵـەڕەش) ئـەیـدهن لـە بنـەکۆتـەرە
ئینجـا لـە (حـەرەم) پێـی دەڵـێن: وەرە
گاجووت لە (گێرەی) فەرمان ئەبەستن
بە (کەڵەمە) تونـد، دەمی ئەبەستن
بەدخـوو کـە لـەگـەڵ گـەڵـدا بـەوەیـە
کـە کزبـوو ژیـا مـەرگـی ئـەوەیـە
بـە ئـاگر سـەهـۆڵ دروسـت ئـەکـرێ
کـە چـی هـیچ بـەرگـەی ئـاگر نـاگرێ
لـە عـیلمو فـەنـدا شـەقـیین پیـاوو ژن
هـەر بـۆ ئـەوەیـە یـەکتـر بکـوژن
ئـەهلـی فـەن ەک یـەک ڕەهـەنـدەتـرە
ئـاخۆ کـام بۆمبـا کوشـندەتـرە
شـەیتـان لـە ڕاسـتی ئێمـە نـەزانـە
ئیتـر بـۆچ بـڵێن: تـەفـرەی شـەیتانـە
ئـەمانـە هـەمـووی خواسـتی خوایـە
بـە ئیـستیغنای خـۆی ئینـسان بایـە



لـە کـەسـێ بـووردی پـەشـیمان مـەبـە
لـە خـوا لامـدە، بـێ ئیمـان مـەبـە
بـە هیـوا بژیـت، دڵـت خـۆش ئـەبـێ
بـە نائومێـدی ڕەنجـت بـۆش ئـەبـێ
کە بە ڕەنجی شان پارەت پەیدا کرد
بە فیـڕۆی نـادەی هـەروا دەست و بـرد
بەلام لە (ها)یی بە (هوو)یی ئەڕوا
بەم هایوهوویەی، ڕەنج ئەچێ بە با
ئەوکەسەی چاوی لە ماڵی خەڵکە
بێ بەرو، سێبەر، وەک داری پەڵکە
قـەناعـەت ئینسان دەولـەمـەنـد ئـەکـا
تـەماع بـەنـد نابێ، پێ لـە بـەنـد ئـەکـا
کـە بـە تـرس و لـەرز ئـەیـدزی شـەوێ
ڕۆژ دڵ لـە مستی، لێت دەرنـەکـەوێ
تـۆ بزانـە ئـەگـەر ماڵـت بـدزن
چەنـد پێت ناخۆشەو ئەبی بـە دوژمـن
دیارە کە خەڵکیش ماڵی خۆش ئەوێ
کە ئەو پەیدای کرد، بەر تۆ ناکەوێ
ئـایینی ئیـسلام ئـەگـەر بـزانی
بـە ئاسـوودەیـی مـەردی جیهـان
لەو ڕێیە لادەی شوێن شەیتان کەوی
پێت هەڵـئەنگوێ، لـە پڕ ئـەکـەوی
هـەڵـکردی دنیـا، دەوران دەورانـە
لـە هـەمـوو لایـی هـەر شـەڕەنانـە

ئەگەر بە بێنان هەڵکردمان ئەبوو
کەس بەسەر بەشی کەسا نەدەچوو
بەڵام ئاخ باوکمان کە ئەو گەنمەی خوارد
خۆیشی دەرکرا بە هەناسەی سارد
ئێمەیش بەو ئیرسە لە دووی نان شەقین
شەق تێهەڵدانەو بەدخۆلق و شەقین



دڵ ئاوێنەیە ڕێی خوا ئەنوێنێ
ژەنگ بگرێ جەلای جەلا نامێنێ
خۆش ڕابواردن، بە دڵی پاکە
ئەوی دڵپاکە، بێ باکە، چاکە
هەموو دەوڵەتی دونیات دەس کەوێ
خۆشی نابینی کە دڵ نەسرەوێ
چەند خۆشە لەگەڵ چەند برادەرێ
بێ کینەو بێ غەم، پیاو بە سەر بەرێ
دەوڵەت کە زۆر بوو سەر ئەشێوێنێ
بڵێی کەیف ئەکەم لە لات نامێنێ
من چەندێ هەندێ ئاڵتوونم دەستکەوت
بە لێکدانەوە خەوم لێ نەکەوت
بێ خەویش ڕێگەی ئێشتیهای بەستم
تا شوێنێ کەوتم دەرچوو لە دەستم
ئێستا ئەو بە شوێن مندا ئەگەڕێ
چونکو قانیعم بە وشکو تەڕێ
ئەمانە واتای گوێ ئاگردانن
ئادەمی لە دووی ماڵ سەرگەردانن
خۆهەڵکێشانەو دڵخۆشی بە زۆر
کەم دەسەڵاتی کردیە حەڵاڵ خۆر
ئێستا کە ئەیخۆم ژەمی (گورگ)یە
کێ ئەڵێ: پیشەی ڕێی بزورگییە
بەڵام ئەمەندە هەیە خوا پێداو
بە شوێن ماڵا خۆی ناخاتە قوڕاو



(بنـاوان) شــل بـێ، ئـاوی لــێ ئــەڕوا
پێش (قـەتـار) شـەل بـێ ئـەکـەوێتـە دوا
سـەر مــەلا کــە بـای لــێ بــەربێتــەوە
نـــوێژی جـــەماعـــەت ئـــەبڕێتـــەوە
کـــە وتیـــان بێـــستان وا بـــەرەڵـــدایە
خەڵـک تێـی ئـەورووژێ قـڕەو هـەڵدایە
بۆ ئـەوەی کـە خـۆی کـەوتـەو نـابوودە
داوو دەرمـــانی عـــەتـــار بـــێ ســـوودە
ئـەو شـوێنەی کـەوا وتیـان (خـەرمیـز)ە
کـەر لێـی ئـەمیـزێ، یـەکـسەر بـەڕێـزە
مـەڕوانــن ئــەمــە پیــشەی کــەرییــە
مـۆدەی ئــەم دەورە چاولــێ کــەرییــە
پـاکو تـەمیــزی چونکــوو بـەئـەرکـە
ئەو ئەرکە لە لای فـەیلەسوف تـەرکـە
ئــەو دەڵــێ: کــە مــن دەروونم پاکــە
جلـــم چـــڵکن بـــێو دڕاو چ باکـــە
فۆرمـــەی مـــەلـــەکیـــیو لبـــادەی دڕاو
بۆ داکـەنـدن بـێ، وەک یـەکـە بۆ پیـاو
مــەلــێ: ئــەم باخــە بــێباخــەوانــە
خــوا ئاگــای لێیــەو جێـی دز، زیندانــە
ماڵـــــی دزیـــــتی تـــــۆ بیـــــشارەوە
ئـەزانـرێ بـەلای، خـەڵـکی شـارەوە
دوایـی کـە دەرکـەوت پـەنهـان نـاکرێ
دەهـــۆڵو زوڕنـــای بـــۆ لـــێ ئـــەدرێ



کوێخـای بـەدەسـت کـەسـێ نـادرێ
هـەمیشە دەسـتی لـە دەسـت هـەڵـبڕێ
کـار بـەدەسـت ئـەگـەر لـە تـۆ بترسـی
دیـارە ناڕاسـتە، خـوا لێـی ئـەپرسـێ
خۆ بێت و کـەسـێ کـردەوەی ڕاسـت بـێ
لە کەس ناترسێ سەدجار بازخواست بـێ
بـەدبـین و خـودبین هـەردووک ناسـزان
لـە لای خـواو بـەنـدە شایـستەی جـەزان
پێ خاوس بەو نەک پێڵاوت تـەنـگ بـێ
بێ ژن بەو نەوەک لـە ماڵـتا جـەنـگ بـێ
قەرز مەکە هەرچەند وادەت مەحشەر بێ
درۆ مـەکـە بـا تیغـت لـە سـەر بـێ
کە هەوات بەرز بێ، سـەرت شـۆڕ ئـەبـێ
(جوانووی) بێ‌لغـاو، هـەروا (تـۆڕ) ئـەبـێ
دنیـا لـە بـارێ نابڕێتـەسـەر
زسـتان هـەتـاوو بـە هـاوین سـێبەر
هـەوڵ نـەدەی، ڕوانیـت وا لێبوویتـەوە
ئـەبـێ بیچـێنی، تـا بیدروویتـەوە
چاوت لـەوە بـێ تـۆ بیـدەی بە خـەڵـک
نە وەک چاولە بەر، بێ‌ئەرک و بێ‌کەڵـک
کـە بـە سـەردڕی خـۆت نـاڕازی بی
ئەبێ بـۆ قـەرزی خـەڵـک لای قـازی بی



ئەوی (بەربووره) لە پیاوچاک ئەدوێ
وەک پەشیمانان شاخی لێ ئەڕوێ

تێهەڵچوو مەبە، مەبە بە سەردەق
نەینێتە (تەبەق) پێی، مەڵێ (سەدەق)

لە ناو کەشیدەی حاجدا، خاچ دەرچوو
لە ژێر خەرقەدا، مرقەم گوێ لێ بوو

ئەو (قەلەندەره)ی ئازادەسەره
ئەگەر ئەو نەبێت، تۆ بڵێ وەره

ژاری پیاوکوژه کە گۆڕا هەنگوین
هیچ تاڵێک نابێ، بە تاڵی شیرین

گەلێ جار تاڵی بە دەرمان ئەکەن
بە دەرمان لە دەست دەرد، دەرمان ئەکەن

هەرچی کە تازه هاتە سەر کارێ
نەشارەزایە لێی مەگره جارێ

کاتێ پوخت بوو، بۆ جاری دوایی
زۆر ئیش ئەبینێ بە شارەزایی

بەڵام تۆ پەرده لە ڕووی کار لابە
پێش هەموو شتێ (نیەت) حیسابە

کە حوسنی خولق و نیەت بوو لای پیاو
هەر ئەوە ئەبێ بە پیاوی تەواو

هاوار پیاوەتی بارێکی قورسە
کەوتە سەرشانت لە خۆت بترسە

ئای (وردم دویماز) چەند سەرئازاده
وەک (هوما) وایە، دایم دڵ شاده



لـە کـردەوەی خـوا سـەرم سـوور ماوە
مـەخلـووقی چـۆنی خـستە ئـەم نـاوە
مـــاری دانـــاوە زســـتان بتـــەزێ
بـــە هاوینـــانیش گیانـــدار بگـــەزێ
(دووپـشکی) هێنـا کـوێری بـێحـەیـا
بـێقـرەوبـرو بـەخـەڵـکەوە بـا
هـەنـدێ باڵـدار هـەن وەک زەردەواڵـە
هـیچ کـەس نازانـێ بـۆچی عـەوداڵـە
یـەکێکـی تریـان ژەنگـە سـوورەیـە
ژاری چـزووەکـەی ئـاگری کـوورەیـە
هەنگ نەجیبە بۆ، هەنگوین کەڵک ئەگرێ
کە پێیشیەوە دای، ئەو بۆ خۆی ئەمرێ
گـورگی سـەرسـەری، بـەگـەڕو گـوڕە
لــە هــەمــو شــوێنی مێــڵمی مــەڕە
سـەگ بـۆ پـشیلە، پـشیلە بـۆ مـشک
یـەکتریـان نـاوێ وەک مـار دووپـشک
ئـەمانـە هـەمـوو یـەکـەبـەیـەکـە
هـەرچـی ئـەڕوانی دوژمـنی یـەکـە
(هـارووت)ۆ (مـارووت) فریـشتەی بـاڵان
کـەوتنـە نـاو ئێمـە، ئێستەیـش لـە چـاڵان
وێنـەی گـورگـو مـەڕ زۆرداره هـەژار
خـوێن ئـەمژێو ئـەم دەم بـەهـاوار
ئـەوی بـە کـەڵـکو بـێوەیـە، کـەرە
هـــەم بـــێزوبانـــە، هـــەم بـــارەبـــەرە



کە هاتی دوعای بەد لە دوژمن کەی
پێی بڵێ: یاخوا هەرگیز تێ نەگەی
تێ‌نەگەیشتن هێندە ستەمە
بڵێی: حەیوانە، هێشتاکوو کەمە
ئەگەر فریوی شەیتان نەبوایە
هەموو باوەڕمان ئەکرد خوا، خوایە
تینمان نەگاتێ بانگ ناکەیتە خوا
کوردی ئەم خوارە، بە (خوێ) ئەڵێن (خوا)
چاوبرسی هەروەک جەهەنەم وایە
(هل من مزید)ی دایم لە دوایە
(بناوان) شل بێ، جۆگە گرفتە
ئاغاژن وابێ کارەکەر مفتە
باغ بەرەڵلا بێ هەر کەس بۆخۆیە
کەوتووینە دەورێک کەوا بخۆیە
ئاینە کەوا پاریز رائەگرێ
ئاینە کەوا پاریز رائەگرێ
سەری تەماعت بڕی سەرداری
کە ماڵی خەڵکت خوارد شەرمەزاری
کە لەگەڵ مردوو ئەچیە سەرقەبران
باوەڕ بە مردن ئەکەی بە گریان
لەگەڵ هاتیەوە لە بیرت ئەچێ
ئەگەر وایش نەبێ دنیا تێک ئەچێ



ئەڵێن گوندۆرە بە ڕەنگ ناناسرێ
هەر، ترێ چاکە، تامی ئەچێژرێ
شووتی بە شەرتی چەقۆ ئەکرن
جارێ لە پێشدا بە خێوی ئەبڕن
کاشکی بۆ پیاویش ئەمە ببوایە
نەیانناسیایە، دایان نەنایە
ئەوی بەزەیی بە کەسدا نایە
گۆڕ ئەوە نیە بیهێننە کایە
زستان بۆ خوری مەڕ ئەبڕنەوە
بەهار هات مەڕیتر ئەکڕنەوە
تا (شارەزوور)م بە دەستەوەیە
هەمیشە (کارێ)م بە ڕێستەوەیە
ئەوەی بە ڕەنجی شان دەس نەکەوێ
هەمووی دائەنێ بە کەیفی شەوێ
ئەڵێن: شەرابی مفت بەخومارە
نازانن خومار دەردی قومارە
شەیتان ئینسانی لەڕێ بردووە
قوماری هیند لا شیرین کردووە
لەو شوێنەی دانیشت نایەوێ هەستێ
ڕێی ئیش و کاریتر ئەبەستێ
ڕاستیشت ئەوێ (پۆکەر) زۆر خۆشە
(بانقۆوسیویەک و کۆنکەن)ی بۆشە
بەخۆت مەنازە بە هۆش و تەدبیر
(پۆکەر) نەزانی، نانی بە وەزیر



ئـاو لــە ئـەزەلـدا کــە ڕوونــەو پاکــە
لـە کـەلـکی ئـەخـا (گـا) بـە شـیاکە
زۆر پـاوی پـاکی تـەمیـز وەک گـەوهـەر
هاونیــشنی بـەد لــەکـەی خـسته سـەر
خواستی خوا وایە، کـە زۆر مـەردی خـوا
بــە چــاووڕاوی بــەد تــەفـرە ئـەخــوا
پــەلــە دەرناخــا ئــەوەی ڕەش کــارە
قوماشــی ســپی لــەکــەی تیــا دیــارە
ئاخ ئەو کەسانەی کە چاک ئەگۆڕن
بــۆ ژیــان ناشــێن، شایــستەی گــۆڕن
نــە کــاری عــەقــڵەوە نــە دیرایــەتــە
(شــیاطین الانــس و الجــن) ئایــەتــە
ومــــا بتــــانگرێ پیــــاو خراپینــــە
لــەگــەڵ چاکانــدا چیــە ئــەم قینــە
شـەیتان لـە ڕاستی چـوار چاکمـان لادا
ئێمـەیـش چوارچاکمـان بکـەیـن بـەلادا
با بـەس لـە کـەلی شـەیتان سـەرکـەویـن
تۆزێکیش لـە نـاو خـەڵکا سـەرکـەویـن
عـەشـرەت بـزانن جارێکـەو ئـەم جـار
نـەکـەونـە خۆتـان، ئـەکـەونـە ژێـر بـار
(بــەراتــە) و قــاپی کــراوەتــەوە
بــەراتی نــەجــات نووســراوەتــەوە
هـەر هێنـدەی ئـەوێ بـڵێی منیش هـەم
هـەمـوو کارێکـت بـۆ دێتـە بـەرهـەم
ئـەگینـە بـەرگـەی گـرانی نـاگرین
جـاویش گرانـە، بـێ کفـن ئـەمـرین



چـوارده پـەنـد (هۆشـەنـگ) داینـاوه
کـە لـە خـەزینـەی (کـەیـان)دا مـاوه
پـەنـدی ئـەوەڵـی بـۆ دووزوبانـە
بـە دووزوبـانی وەتـەن ویرانـە
جـاران ئـەوانـە زوبانیـان ئـەبـڕین
ئێمـە ئـەوانـە بـە پـاره ئـەکـڕین
فیتنەی دووزوبان دۆست لـە دەسـت ئـەدا
ئەوی گویی لێ گرت دەست لە دەست ئەدا
سێ کـردەوەی بـەد کـەوتـە نـاو بـەشـەر
بـاوک بـراو دۆسـت، زوو ئـەدا بـە شـەڕ
بەدعەهدی‌و درۆو قـین لێـک هـەڵگرتن
بـەسـە بـۆ بینـای خۆشـی هـەڵـگرتن
(مەرد)ێکی گـەوره کـە هاتـە ڕووی کـار
ماکینـەی درۆی بـۆ ئـەخـەنـە کـار
ئـەگـەر ئـەو مـەرده نیـەتی چـاک بێ
بـۆ ڕێتمـایی خـوا دڵـی پـاک بـێ
هێنـای ڕووبـەڕووی یـەکـی کردنـەوه
دیـاره گـرەوی زوو لـێ بردنـەوه
ئیتـر درۆزن لـە کـۆڵ ئـەکـەوێ
ئـەوسـا قیمـەتی دۆسـت دەردەکـەوێ
بـە هـوێ دۆسـتەوه کـار ئـەچێتـەسـەر
خـوا فـەرمـوویـەتی: (شـاورهم فی الامـرْ)



گـێتی لـە سـەر هـیچ بـارێ نـاوەسـتێ
چـۆن ئـەبـێ دانـا پـشتی پـێ بـەسـتێ
پـاک هـەڵـدەخـزێ و هـەڵـدەسـێتەوە
ناپـاک نـەیـشکەوێ ناحـەوێتـەوە
هـەنـدێ کـە دۆسـتی جـاەو ئیقباڵـن
تا لە (مەسنەت)دای جێت بۆ ئەماڵن
لـەگـەڵ لێکـەوتی بیـڕای ببڕایـە
هاتیـەو کایـە، هـەر ئـەو سـەودایـە
خۆزگە پێستی ڕووم چەرمی (گا) دەبوو
تـەریـق بوونـەوەم لـەلا (بـا) دەبـوو
بۆ چەرمەسەرێ زوو بە کێش ئەبووم
لە هەموو شوێنی هەر لە پێش ئەبووم
بـەڵام قـوڕ بـەسـەڕ ئـەوکـەسـەی وایـە
ئـەم ڕەزاڵـەتـیش مـەرگـی لـەدوایـە
ئـای بـۆ نـانێکی کـەسبی ڕەنجـی شـان
سـەر ئـازادەتـر لـە شـاهی جیهـان
ئـەمانـە هـەمـووی فـەرمـانی خوایـە
کـوا دەسـەڵاتی بـەنـدەی تێدایـە
دەریـای قـەدەرە، عـەقـڵی تیـا گومـە
(زیـن لهـم اعمـالهم)
هـەنـدێ ئـەیـەوێ لـە مـەجلیسان بـێ
هـەنـدێکیش نـاوی لـە نـاو نـاوان بـێ



هاوینی بێ ئاو، ئای چیت پێ کردین
وەک ماسی ناوی جەرگت ڕەش کردین
ئاخری وا چلەی تۆیشمان بردەسەر
چلە چوار نەوعە، یەکێکیان بەتەر
جاران جێ مالّی باوەشاوان بوو
ئێستا دەرمانی ئەویش هەرزان بوو
هەموو کاریکمان بۆ دەبێ ئاسان
مەرد ئەو مەردەیە نەبێ هەراسان
خۆشیو تەنگانە نامێنن تا سەر
پەندیکمان هەیە کە بیکەینەبەر
با تالّیو خوشی هەر بلێی ئەڕوا
نەوەک بە زوبان، بە دڵ و بڕوا
کەلیمەی (ا ق با ا ل) پەندیکی تیایە
وەری گێڕیەوە خۆی (ل ا ب ق ا)یە
لە قورئانیشدا فەرموودەی خوایە
ڕاستە تەنگانە خۆشی لە دوایە
چەند خۆشە ئینسان وا دلّنیا بێ
بوون و نەبوون لای کاریگەر نابێ
بەختیاری پیاو، دلّی بێ غەمە
با خەلّک هەر بلێن دانایی کەمە



کــە خراپــەت دیو موقابــەلــەت کــرد
ناوی خراپیت لـە سـەر خـۆت بـار کـرد
بــە چاکــە جــەزای خــراپ بــەیتــەوە
بـــەوە گـــرەوی پـــێ دەبـــەیتـــەوە
بــەد، بــۆ دۆســتی ئــەکــەویتــە دووت
(اوهــن البیــوت، بیــت العنکبــوت)
وەک شـیر هـەڵـمەچـۆ بـە تـینی گـرێ
دوایـی قـاپێکی بۆشــت پــێ ئـەبــرێ
بــە شــێنەیــی بــێ، شــوێن بــزر ناکــەی
زوو ماندوو ئەبێ، ئـەگـەر تونـد ڕاکـەوی
تــەنهــا بــۆ چاکــە بــەدەســتوبرد بــە
دەربــەســتی دڵــی درشــتو ورد بــە
بـە تـەدبـیری دۆسـت کـار ببـەرە سـەر
خـوا فـەرموویـەتی: (شـاورهم فی الامـر)
کۆنــە پۆشــانیش بــە کــەم مــەزانــە
کلــیم، کــەلیمــی تێــدا پــەنهانــە
زێــوەری دنیــا هــەر بــۆ ژن چاکــە
مــەرد لــە ئــارایش دوورەو بــێ باکــە
وا چــاوت لێیــە کــە کــۆچی خێــڵە
ناوی چاک لە شوێن خۆت بە جێ بێڵە
توخــوا نــایزانی دەوڵــەت وماڵــت
لــەگــەڵــتا نابــێ، هــاوار بــە ماڵــت
گوناهـــەکـــەتـــە کـــە وەفـــادارە
لــە نــاو گۆڕیــشدا هــاودەمــەو یــارە



چـارەی رزگـاری رێـی ڕاسـتە، ڕاسـتە
پـارێزی نـەخـۆش بـە نـان و ماسـتە
پیـاوی بـێ ڕۆژوو ئێـوارەی لێهـات
کـز دادەنیـشێ پـەشـیمانو مـات
ئاغـا ئـەمـر ئـەکـاو خزمـەتکـار نایکـا
ڕووییکـی ئـەوێ کـە تـەماشـای کـا
پیـاو هیـوادار بـێ نـەوەک ناهومێـد
چۆن ئـەژیـت ئـەگـەر هیوا ببـڕێ لێت
هیوایـە بـەرگـەی تـەنگانـە دەگـرێ
کـە بـێ هیـوا بی برسـتت دەبـڕێ
بـاوەڕت بیـێ کـە ئـەم خودایـە
دوایـی ڕۆژ ئـەجـرو جـەزای لـە لایـە
زۆردار کـە ئێـستا لـە خـوا ناترسـێ
(مەڕنەمووکە)ی گۆڕ دێو لێی ئەپرسێ
ئـەوسـایە هـاوار پـارەی بـۆ ناکـا
ڕێگایـشی نیـە کـە هـەسـتێ و ڕاکـا
لـوتی لـە بـەردی (ئـەلحـەد) ئـەکـەوێ
هـەوای زۆرداری ئـەوسـا ئـەنـەوێ
جا ئەگـەر ئینسان کـردەوەی چاک بێ
لـەویشا بێ باک گـۆڕی ڕووناک بێ
بـەر عـەفـوو لیقـای یـەزدان ئـەکـەوێ
جێگـای بـەهـەشـتە ئیتـر چـی ئـەوێ



بە (مازوو) لە دەست چووبوو سەرمایە
ئەیویست بە (سیچکە) بێتەوە کایە

قەرز نەیدەیتەوە، نابڕێتەوە
(بەرتیل) جێگای قەرز ناگرێتەوە

سەد چاکە بکەی لەگەڵ ناپیاوا
کە دڵت شکاند ئەیدا بە ئاوا

بە قینی دوژمن دۆست لە دەست مەدە
دوو کەس حەق بێژەو بەدگۆ دووسەدە

تا بە چاوی خۆت چشتێ نەبینی
مەکەوەرە سەر ڕێگای بەدبینی

لە سەر کاری چاک هەرگیز مەوەستە
بۆ (تۆڵە) پەلی، پەلە ببەستە

کە دڵت شکاند خێرت پێ نابڕێ
کە شووشەت شکاند پینە ناکرێ

هێواشی ئەسپی (تۆڕ) ئەحەملێنێ
(سرکە)ی توند قاپی خۆی ئەتەقێنێ

بۆ (درۆینە)ی بەد (پەرێز)ت پاک بێ
بەڵام لای گەورە زوبانت چاک بێ

قسە لە پێشدا لێک ئەدرێتەوە
لە دەم ترازا ناگەرێتەوە

دەست بۆ تەنگانە ئەبێ بە پەرژین
زوبانە سەرت ئەدا بە بڕین

خوا ئیختیاری داوەتە دەست خۆت
ئەگەر خۆت چاک بێ عالەم چاکە بۆت



ئــەوەی دەرامــەد، ئــەبــەشــێتەوە
تــۆوی چاکــەی لــێ ئــەوەشــێتەوە
خوا (قـەناعـەت)ی دا بـە بـەنـدەی خـۆی
ڕووی جیهان ئەبێ بە مولـکو مـاڵ بـۆی
ئـەگـەر قـەناعـەت چـاوی تێـر نـەکـا
کـوێرەوەریو خـەم سـەری تـێ دەکـا
خزمـــی نزیکـــت خۆشـــەویـــستییە
خـــۆش ڕابـــواردن، تـــەندروســـتییە
کـــە پادشـــا بیو لـــەژێـــر(جـــێ)دا بی
ئـەبـێ بـە خۆشـی لـەگـەڵ کێـدا بـێ
تـــا لـــەشـــت ســـاغە قـــەدری بزانـــە
نـــەخـــۆش بی لـــە لات دنیـــا زینـــدان
تـا دەسـتت هـەیـە دەسـتت دریـژ بـێ
نەک لـە پـڕ ڕۆژێ ڕێـت سـەرەولێژ بـێ
کـە لـە دنیـادا بـۆم نـەکـەیتە تـەشـت
گوایـە بـە خێـرت ئـەمبـەیتە بـەهـەشـت
بـە چـی دەزانی کـە خـۆت بـەهـەشتیت
ئـەبیـنم چـەشـنی تـەریقـەی چـەشتیت
لـە (پاپـا)و شـێخان بـەهـەشـتیان ئـەکـڕی
عـەقیـدەی عـەسـری، ئـەو نانـەی بـڕی
(نێـــرە بیدۆشـــە) بـــۆ مریـــد بـــاو بـــوو
چی بکەین؟ ئەو دەورە، مۆدەی تەواو بوو
کـە ئـەو لـە پێـستی خۆیـا نـەوەسـتێ
ئەم خەڵکە دەمی خـۆی بـۆچ ئـەبـەستێ



ئــاو هــەر شــوێنێکی گــرت ئــاوەدانــە
زوردار لـــە دییـــک دانیـــشت وێرانـــە
خۆمـان دووی پیـاوی زۆردار ئـەکـەویـن
هــەروا ئــەزانــین مــەخلــووقی ئــەویــن
هەر چی پەیدا کەین ئەو ئەیباو ئەیخوا
ئـەوسـایە هـاوار ئـەبـەینـە بـەر خــوا
خـوایش ئـەفـەرمـویٚ: کـردەی خۆتانـە
تـــــەنهـــــا پیاویکـــــە، هێناوتانـــــە
هاوجنسی خۆتان کوشت، ماڵتان بۆ بـرد
بــە ســەر خۆتانــا ئێــوە زاڵــتان کــرد
چاکـــەو خراپـــەی خۆتـــان نـــەزانـــن
هـــــەر بناڵـــــێن کـــــە بـــــارگرانن
لـــە نـــاو خۆتانـــا ئـــەگـــەر بـــرا بـــن
دڵـسۆزی یەکـ بـن، بە بـیٚ هـەرا بـن
هـیچ کـەسـیٚ پشتتان نـادا لـە ئـەرزی
ئینجـا ئـەکـەوتنـە ڕیگـەی سـەربـەرزی
ئەڵێن چوار ڕێوی شێریٚ کەوڵ ئەکەن
ئێوە کە شێرن بۆچ پشت هەڵدەکەن؟
لــە ڕێــی خزمــەتی گــەلا مــەســرەون
وەک شێری بەیداخ ژوور سەرمان کەون
ئێـــوە دوو چـــشتتان بـــۆ دانـــراوە
یـــەکـــیٚ پـــێلاوو یـــەکـــیٚ کـــلاوە
ئـەگـەر پـێلاو بـن ئـەتانکـەنـە پـیٚ
کـلاو بـن خـەڵکی لـە سـەرتـان ئـەنـیٚ
سـەرو ژێـر کـەوتـن بـە دەسـت خۆتانـە
خوێنـدنو جـەهلـە ڕیگـای ئـەم دوانـە



هەندێکی وا هەن کە بە زیندەخەو
بە خەیاڵ ئەبنە حوکمداری شەو
هیچ نەبێ نیوەی عومریان بە خەیاڵ
خۆش ڕائەبوێرن بە مەوقیعو حاڵ
ئەوانەی کە شوێن پارە ئەکەون
بەو مەراقەوە شەویش بێ‌خەون
لەولایش ئەبینی کە کرێکارێ
پارەی ئەورۆژەی وەرگرت ئێوارێ
خۆراکی کڕی بە خێرو بە بێر
دەستی ماندووە لە سەر سکی تێر
لەم دنیایەدا گوزەران وایە
کێ ئەڵێ: گیتی ئاسوودەی تیایە؟
کۆی ئەکەنەوە بە (جەواڵ) و (هۆڕ)
نازانن بۆیان نابرێتە گۆڕ
کردوکۆشیان هەمووی تەباهە
ئەوی لە گەڵیان ئەچێ گوناهە
ئەمانە هەووی وا لە پێش چاوە
ئینسان لە (نیسیان) دروست کراوە
ئەگەر نەبوایە بە فەرامۆشی
بۆ کۆکردنەوە کێ تێدەکۆشێ؟
ئەڵێن پێغەمبەر ئەمەی فەرمووە
پەسەندە بۆیە بەگوێدا چووە
(بۆ دنیات بژی وەبزانە نامری
بۆ ئەولاش، ئەمرۆ ڕێ لە بەرئەگری)
فەرامۆشییە جیهان ڕائەگرێ
کێ باوەڕ دەکا بەیانی ئەمرێ

خـوا لـەزەتێکـی وای داوە بـە ژیـن
لـە لامـان خۆشـە، کـەرو کـوێریش بـین

برسـیو نـەخـۆشو مانـدووی شـەڕوشـۆڕ
ژیـان هـەر خۆشـە هـەتـا لێـوی گـۆڕ

بنیـادەم هیچـی لـە یـەکتـر ناکـا
وێـڵن بـە رێگـای خـراپو چاکـا

هـەرکـەسـە پیشەی خـۆی لـە لا باشـە
لـە نـاو خۆمانـدا (دەوهـن بـە ئاشـە)

ڕێێکـی وامـان نـەدیـوەتـەوە
سـەرکـەوتـنی لـێ بـووەشـێتەوە

هیچ کەس ڕابـەری کـەس پـەسـەند ناکـا
چونکـو نایانبـەن بـە رێـی ڕووناکـا

هەرچی ڕۆژێکی بەرکەوت بۆ خۆی بوو
خۆی خواردیو هەژار هـەر باوکـەڕۆی بـوو

هێجگار کە (تەموین) سەنگی مـەحـەک بـوو
بایـەع بـەگـزادە و ئـەهـالی (لـەک) بـوو

مـەگـەر ڕاوەسـتین نـەوەی خوێنـدەوار
پـێ بگـەن ئـەوان بکـەونـە سـەر کـار

گـەسـکێ بـدەن لـەم تێـر نـەخۆرانـە
ئـەگینـە ئێـستا هـەر بخۆرانـە

ئەو بێ شەرمەی وا ئـەمـەی کـرد دوێنـێ
لـە نـاو میللـەتـدا چـۆن چـاو هـەڵدێنێ

ئـەڵـین چـاو بـە چـاو ئـەکـەوێتـەوە
مـەگـەر (بـێشـەرەف) تـەریـق بێتـەوە

ئێمـەیـش لـە نووسـین نابـێ مانـدوو بـین
دەسـتی وەیـسکەیـەو سـووژنی پـۆلایین



هەرچی کە پشتی بە بەندەی خوا بەست
خوا بەو بەندەیە ئەیخاو ئەیکا پەست

بۆ هەموو کارێک هیوات بە خوا بێ
ئەوسا ناترسی کە خۆت ئەتەوێ

کاریوا هەیە کە خۆت ئەتەوێ
زۆر پێت ناخۆشە بۆت ڕێناکەوێ

دوایی ئەبینی ئەگەر بۆت ئەبوو
هەرچی کە هەتبوو لە کیست ئەچوو

زۆر جاریش چشتێ کە تۆ ناتەوێ
خێرێکی زۆرت لێ چنگ ئەکەوێ

(تحبوا شیئا) خێری لە دوایە
(تکرهوا شیئا) خێری تیادایە

کەسێک ئەبینی حەزی لێ ناکەی
دوایی سوپاسی ئەکەی بە چاکەی

کەوابێ تۆ خۆت نیەتت پاک بێ
ئەوسایە دۆستت ئەبێ بۆت چاک بێ

لە هیچ ئیشێکدا بەددڵی مەکە
لە کاری گەلدا سەرچڵی مەکە

تۆ بۆنی شیری خاوت لە دەم دێ
کە ڕێ نازانی چۆن ئەگەیتە دێ

کە ڕێ هەڵگرە کە بیوەشێنی
نەک شانو قۆڵی پێ بڕەنجێنی



هـەنـگ کـەلـە گـوڵو میـوە ئـەنیـشێ
بـە مـژین مایـەی هـەنگـوین ئـەکێـشێ
چزوکـــەی ژاری تاڵـــی تێدایـــە
هـەنگـوینیش وا خـوا فـەرمـووی شـیفایە
ئـــەمـــە نموونـــەی حاڵـــی دنیایـــە
شـــیرینی تاڵـــی هـــەر لـــەگـــەڵـــدایە
ئـــادەمیـــزادیش زۆرتـــری وایـــە
هـــەر چاکـــەیێکیـــان بـــەدی لـــەدوایـــە
هـەنـگ بۆیـە نـاوی بـە چاکـە ئـەبـرێ
کـە پێیـەوەی دای، ئـەو خۆیـشی ئـەمـرێ
کاشـکی بـەدکـاریش وەک ئـەو بوایـە
کـــە پێیـــەوەی دای خـــۆی بمردایـــە
مـــار تـــا لێـــی نـــەدەی وەزنـــدی نییـــە
شـیر ئـەمـان ئـەداو پیـشەی مـەردییـە
بـەڵام دووپـشکو هـەنـدێ لـە ئینسان
لـەبـەر قـین نیـە، بـووە بـە خوویـان
ئـەڵـێن کـە شـەیتـان خراپیـان ئـەکـا
خێـرا! شـەیتـان، هێـشتر لـەدوامـان ناکـا
ئـایێ خواپێـداو کـە لـەگـەڵ بـەدکـار
لـە جێـی خراپـە، چاکـە بکاتـە کـار



(سەعدی) فەرموویە، کە خوویێکی بەد
کەوتە ریشەوە، دەرناچێ ئەبەد
وا منیش ئەڵێم کە پیاوی نادان
هێند قەڵبە (قەلب)یش نایکا بە ئینسان
بەدناو هەڵیشی بگێرێتەوە
دیسان نادانە، ناگەرێتەوە
(خەواسی حروف) هێندیکی وایە
نەوعە سرێکی مەعنەویی تیایە
نادان، بەدئەدەب، گورگ، ئەم سیانە
کە قەلبت کردن، دیسان خۆیانە
ئەوەیش کە (مەرد)ە (درەم) ئەبەخشێ
(کەرەم) کارێکە، بە (مەرگ) نالەخشێ
ێ ئەمانەتەو سیحەت غەنیمەت
ـەخشین فرسەتەو خواستن مەزەللەت
کە دڵ ئازاری خۆت لەبیر بێ
نایێڵی دڵی کەست لێ زویر بێ
ـەرووی‌و ریا لای خواو بەندە
ـ ماری زوحاک، لەسەر شان بەندە
لە نانی (دونان) سندان ئەبارێ
چوارنان بە، وەکوو (قەلەمرداری)
ـاشە تەندوورە)و(کەوشەک) نەماوە
ـە بابی بابی سواریی کەر باوە



وەزیفەو مەقام، بە پیاو ئەگۆڕێ
ڕەنگی (شووشە)یە، کە ئاو ئەگۆڕێ
هەرچی بنێری ئەوە (بەر) ئەدا
گۆزەیش چی تیابێ، ئەوە ئەرئەدا
دنیا وەک پیاڵەی چایخانە وایە
تۆ، ئەیخۆیتەوەو هی کەت لەدوایە
ئەو پیاڵەیەی تۆ چات تیا خواردەوە
هەزار مشتەری لە تۆ شاردەوە
پارە (بەقەمە) زوو ئەچێتەوە
کە بەخشیت ئەوسا ئەمێنێتەوە
چاوبرسی هەتا بیبێ تێر ناخوا
چاوتێر بێ خەمە، کە نایخاتە دوا
دڵنیا بە لەگەڵ ئاوەڵی چاکا
ئەوی دۆست ئەیکا، برا بۆت ناکا
کە لەگەڵ دوژمن لێک ئاشکرا بووی
باوەڕ بە مەکری بکەی تێدا چووی
دۆستی نادانو دوژمنی دانا
بیانگۆڕەوە لە ڕێگا بانا
دۆستی نادانت، وەک هەڵەوەڕە
ئاگات لێ نەبێ (دز)ت لەسەرە
هەرچی هەڵدەسێ سیاسەتزانە
بە دەست خەڵکەوە، بێڵ چەند ئاسانە
(دێو) جارێک (گوردی) خۆی کەوتبوە چنگ
(گورنەتەڵە)یەو، ئاوی ناو بێژنگ



خــوا بــۆ قوربــانی مــەڕی دانــاوە
کــەچــی گــاچووتی، تێــوە گــلاوە
گوایە گاجووتێک حەوتی سوار ئەبێ
(سێ‌بەگایی)مان چۆن بە چوار ئەبێ؟
من (گـاێکم) بوو، ڕای کرد لە دەستم
ئەم جەژنە یەکی (حەوتمی) خستم
سەد قوربـان حـەقیـنـاس نافـەوتێنـێ
ئاگری جەهەنەم گایش ئەبرژێنێ
خۆ من تێر گۆشتی قوربانیم بۆ هات
چیم لەوەی خێری کەوتووە لە (سیرات)
ئەگەر تۆ مالی خەلکت خواردبێ
ناڕوا، سەد، گایشت قوربان ناردبێ
من کە حەقی خۆم بە کەس نەبەخشم
خوا پیم نابەخشێ بە تۆ بەخشم
بە دزی ئەیبەی ئەیدەی بە مەعلووم
ناوی خۆت ناوە فاسقی مەحرووم
مردووشۆر پارەی خۆی وەرئەگرێ
بەو چی لە گۆڕدا مردوو لێی ئەدرێ
(کەوا)ی نیوداشتت کە لە بەردا
خەمی تازەتر بخۆ لە بەردا



ڕێــوی تــەڵــەبــاز بــوو بــە فاقــەوە
ناســـرەوێ بـــەدەم واقـــە واقـــەوە
دەڵـەکـیش کاتـێ کـە گـیرا ئـەتـسێ
کەروێـشکیش تـانجی دی ئـەحـەپـەسێ
کەروێشک کە ئەنوێ چاو ناقووچێنێ
کـە ڕاوکـەری دی خـۆی ئـەخـەفێنـێ
کـەمتیـار دەنگـی خۆشـی پـێ خۆشـە
قولـەپێـی ئـەسمـن هێـشتا بـێهۆشـە
ئـەم سـیفەتامـە بـۆ پیـاویش وایـە
هـەرچـی ئـەیبـینی بـەشـێکی تیایـە
هـەنـدێکمان هـەتـا نـەکـەوتوونـە داو
شـاناژی ئـەکـەن بـە نـاوو بـە داو
شـا، بـە سـەپـانی خۆیـان نـازانن
پێش خـۆ نـابینن، هێنـدە بـەرز ئەڕوانـن
لەگـەڵ تێـی گـیرا ئـەبنێ بـە دەڵـەک
شاخی لـێ ئەڕوێ وەک مانگـا بـەڵـەک
کە ڕزگـاریش بـوو دیسان وەک جاران
ئـەیبـینی، نـەبـای دیـوەو نـە بـاران
بنیـادەم لـە سـەر حاڵـێ نامێنـێ
دەوڵـەتی دنیـا سـەر ئـەشـوێنێ
بتنـێ لات کـەمـە، نـەتبـێ خـەفـەتـە
هـەر قـەناعـەتـە، پیـاو پێـی ڕەحـەتـە



بـاران ئـەبـارێ کـەچـی هـەتـاوە
ئەوە بـە کـوردی (گورگـەزێ)ی نـاوە
هـەر بێچـووە گورگـێ، ئـەودەمـە بـزێ
رۆڵـــە لـــە بـــەری دایـــک ئـــەدزێ
گـورگ سالـی جارێ مـەڕ ئـەفـڕێنێ
بینـــادەم دایم خـــوێن ئـــەڕژێنـــێ
لای ئێمـــە کوشـــتن یـــەکـــە هونـــەرە
گـورگیش بـۆ گیسکێ خـوێنی هـەدەرە
تـــوورەیـــیو شـــەڕی (ڕەمـــەزان) بـــاوە
بـــە نـــای نـــارەوا (ســـەفـــەر) بـــەدنـــاوە
هـــەر یـــەک قوماشـــەو قیمـــەتیـــان جیایـــە
هـــەر ســـەربانێکـــەو دوو هـــەوای تیایـــە
بـــە تـــەقـــاویتیش ناڵـــێن ئینـــسانن
خۆیـــان لـــە نـــەسـلی ئـــەوان نـــازانن
ئـــەوانـــەی کـــەوا مـــونکیری بـــابن
ئینـــشەڵـــلا هیچیـــان تـــەقاویـــت نـــابن
جووجـەڵـە سـەری لـە هێلکـە دەرچـوو
کە چـی بـە دەنـدووک تویکـلی بـەربـوو
بـــە ئێـــستریان وت: بـــاوکی تـــۆ کێیـــە
وتی: رەســـــەنی دایکمـــــم پێیـــــە
ئێـــستر داری بـــۆ (نـــەمـــروود) کێـــشاوە
لـــە بـــەر ئـــەوەیـــە تـــۆوی بـــڕاوە
ئێمـە وەک شـەیتـان ئـەکـەوینـە بـەیـن
ئاگری جەهەننەم بۆ یەک خۆش ئەکەین



هەرکەسێ کەوتە ناو ئەم جیهانە
ئەستێرەی بەختی لە ئاسمانە
ئەو خوا پێداوەی ئەستێرەی گەشە
هەرچی خوا بەخشی ئەو خاوەندبەشە
ئەویش ئەستێرەی سیس و بێفەڕە
دانای دنیاش بێت، هەر ئاخرشەڕە
خوا دنیای بۆ کەیف هێنایە بەرهەم
کێ توانیویتی بڵێ: منیش هەم؟
بەدبەخت ئەوەتە کە بە عەقلی خۆی
ئەڕوا بەڕێدا، کە چی نالوێ بۆی
جاران کە شارێک پادشای ئەمرد
شایان حەوالەی ڕەئی باز ئەکرد
باز بە سەر کێدا بنیشتایەوە
ئەوە مەلیک بوو، ئەبرایەوە
سا چی بکەم ئەگەر من لەوێ ئەبووم
بە بۆنی کەباب، باز ئەکەوتە دووم
ئەو چاکترە کەوا شاهیم دەست نەکەوت
بە کاری دیوان دڵم نەئەسرەوت
ئەم بێخەفەتیەو سەرئازادییە
دەس کێ ئەکەوێ؟ خودادادییە
یەکێ بە ئەسپێ بووە بە داماد
یەکێ ڕەنجەڕۆ بووە وەک فەرهاد
هەرچی بێ هەمووی ئەبڕێتەوە
چاکەیە بۆ پیاو ئەمێنێتەوە



خۆزگە بەوانەی کە لە هیچ ناگەن
لە (دار العلم) و (حقوق) پێناگەن
زنجیری خیرەد ناخەنە ئەستۆ
هەرچی هات ئەڵێن: لێخورە، برۆ
خواردنی بێغەم، خەوی بێ پرخە
گلەیی نیە لەم دەورو چەرخە
خوایش زۆرتر ئەوان ئەدۆزێتەوە
بە دڵی ئەوان ئەبزوێتەوە
بە شانسێکیوا ئەیبابەرێوە
نازانێ پارە بکاتە کوێوە؟
سا ئازای بڵێ: ئەمە بۆچ وایە؟
ئەبینی شەقو زللەی چەند تیایە
خوا بە (لا یسال)وا دەمی بەستووین
پەکی دووانو پرسینی خستووین
کەوابوو، وەکوو وتمان، نازانم
بێ دەردیسەری، ڕەحەتی گیانم
لەم دنیایەدا مەچۆرە کۆڕێ
بۆ خۆت هەلاژێ، ڕەحەت لەگۆڕێ
زاتەن نەتیجەی دنیا ئەمەیە
هیچ کەس نازانێ ژینی تا کەیە؟



گایێک کە کەوتە ناو کشتوکاڵێ
گاوان گاگەل تێوە دەئاڵێ
هێندەی گوت: (کاورا گاڵت وەگوێزە)
ڕانو ڕەوگی قڕبوو بەڕێزە
خوا ئەم گیتییەی هەروا داناوە
تەماعکار زۆر جار ڕێی لێ گۆڕاوە
دەولەت کە زۆر بوو خەڕۆیی تیایە
ئاياتە (طغيان) لە ئیستیغنایە
گەنجی بادئاوەر تەلای دەستەوشار
بۆ (خەسرەو) بوونە تێلای گۆڕەوشار
میهتەر نەسیمی عەیاریش وابوو
هەمیشە لە ڕێی پارە شەیدا بوو
ئەو لە سێبەری هەموو ئەینایە چاڵ
نەی ئەدۆزیەوە، بۆی ئەبوو عەوداڵ
ئەڵێن (ئەسکەندەر) لە (شارەزوور) مرد
(بابا)ی لەگەڵ بوو خزمەتی ئەکرد
ئەگەر بۆ گەنجی بابا بگەڕێم
ڕەنگە گەنجێکی پەنهان بێتە ڕێم
ئەوە چاکترە لەوەی کە بە زۆر
لە تۆی بستێنم نەیشیبەمە گۆڕ

❀❀❀

پیاو کە لە جێگای نزم هەڵئەنگووت
هەڵدەستێتەوە بە لووت و بزووت
بەڵام لە جێی بەرز کە کەوتە خوارێ
سەرو گوێلاکی ئەشکێ بە جارێ
هەر لێرەم دیوە، دۆستی سەرسفرە
هێندە دەم گەرمە، گوللەنەبڕە
لەگەڵ تەنگانەی ئەو پیاوەیان دی
پلاوخۆرەکان ئەبنە موددەعی
ئەوانەی کەوا وەفا نازانن
دەمم نایێنێ بڵێم: ئینسانن
خۆزگە ژین دامغەی خەڵلاقی بوایە
بە ناوچەوانی پیاویا بنایە
ئەوسا ئەوانە کە ئەناسران
لە کۆمەڵی پیاو دەردەهاوێژران
چەندێ کە سوێندی سێ تەڵاق باو بوو
هەندێ سێ بەردی لە گیرفان نابوو
ئێستا سێ بەردە فڕێدراوە
سوێندی شەرەف و نامووس لە ناوە
شەرەف لە ئەشراف کە وەرگیراوە
هێندەیان کارکرد (فیکەی) سوواوە



ئەی ئەو گەوراتنەی کە فەن ئەزانن
بە (تەیارە)تان لە ئاسمانن
یاخۆ بە جەزبی قووەی کارەبا
ڕادیۆتان پەیام بۆ گێتی ئەبا
ئەم (فەندەڵ فێلە) کەڵکێ ناگرێ
بەشەر بە (فەنی) بۆمباتان ئەمرێ
ئەگەر ڕاست ئەکەن چشتێ بێننە ناو
نەفعی عالەمی تێدابێ تەواو
ئەم هەموو گیاندار لە ناوبردنە
هەموو بۆ هەوڵی زگ تێرکردنە
هەرچی کە نەبێ چاری ئەکرێ
برسیەتیە کەس بەرگەی ناگرێ
سا ئەگەر ئازان چشتێ بێننەدی
بنیادەم ئیتر بێ خواردن بژی
ئەوسا نە شەڕو نەهەرا دەبێ
ئەم خەڵکە تێکڕا وەک برا دەبێ
نامەوێ چاری مردن بکرێ
مەرگ نەبێ دنیا ئەمەندە ناگرێ
ئەوی کە خواردن بە عەیب ئەزانێ
ئازایە هەڵکا ڕۆژێ بە نانێ
بەڵان ئەگەر بێو خواردن نەمێنێ
کۆنابێتەوە دوو کەس لە شوێنێ



نۆکـەریی دیـوان، هێنـدە شـیرینە
چـزووی جـەزای لا، شـانی هـەنگوینـە
چەنـد خۆشـە بـڵێن: موشـیر، یـا وەزیـر
لای وایـە (هومـا)ی بـۆ هاتۆتـە گـیر
(میمـی) موشـیرو (یـای) وەزیـر (مـێ)یـە
سەرمەستی (شێر) و (وزر)یـش ئەمەیـە
نازانـێ مـەسـنەت تـا، بـاڵاترە
لـەگـەڵ لێیـان خـست داخـی زۆرتـرە
پیـاوێ سـەد زێـڕی دا بـە کـوڕەکـەی
وتی بـۆ ئـەوەی شـتێ تێـدەگـەی
کوڕە پارەی هەڵگرت لای وەزیری چوو
کە (سەد ئەعزەمی) سوڵتان سەلیم بوو
وتی: وا ئـەمـەم بـۆ تـۆ هـانیوە
تـۆم بـەم پـارەیـە موستەحـەق دیـوە
وتی: تـێ ناگـەم! چـۆن حـەقـی منـە
ئـەم قـسەیـەی تـۆ بـێسـەروبنـە
وتی: کـەیـاوز لـە سـەدر ئـەعـزەممـان
چواری کوشت و تۆ، هاتیە جێـی ئەوان
وتی: ڕاست ئەکەی کەرگم لە پێشە
بـەلام ئـارەزووی بـەرزی بـەکێـشە
بنیـادەم تیغیـان لـە سـەر ڕاگـەرن
بـۆ سـەدر ئـەعـزەمـی خۆیـان نـاگرن
پـشیلە ڕزگـار بـوو لـە دەسـت تـیرەزەن
وتی: (مـشک)و ژێـر کـەنـدووی پـیرەزن



عاشـق کـه بـه شـەو ناڵـەکـار ئـەبـێ
کـــه نـــازی زۆری دی بێـــزار ئـــەبی
(چــەقــۆ) کــه زوری بــسوی بــەرودوا
(دەمــەســوو) ئــەبــێو بڕشــتی ئــەڕوا
خـواردنی بـەتـام کـه زۆرت لـێ خـوارد
ئـەبـینی نـەفـست کـه لێـی هـەڵـبوارد
تــەنیــا پــارەیــە، هــەتــاکوو زۆر بــێ
تێر ناخۆی، هەرچەند بـه شـەڕو شـۆڕ بێ
بــەلام پــارەی زۆر، زۆریــان بــەلایــه
(دەم) قـەمتـەر ئـەکـاو، چـاوی لـەدوایـه
زۆر کــەم خــاوەنــدی خێــری ئــەبینــێ
بــۆ مێـــردی تـــازەی ژنی ئـــەمێنـــێ
یــاخۆ کــوڕانی ئــەکــەونــه دەعــوا
نیــوەی بــەڕەسمــی مــەحکــەمــه ئـەڕوا
ئەگەر خوا بیداو تـۆ بیـدەی بـه خـەڵـک
بۆ هەردوو (دنیا) بۆت ئەبـێ بـه کـەڵـک
چەند خۆشه لەگەڵ هەنـدێ لـه ئـەحبـاب
دڵــێکی ســـافو دەوریـــه کـــەبـــاب
بـه فـڕان بـەفـڕان خـۆتی لـێ تێـر کـەی
بــه تامــه تامــه دوژمنــت کــوێر کــەی
کـه وات بـۆ ڕێکـەوت دنیـا بـەهـەشته
ڕۆحـتَ لـه ئـەوجـی کـەیفـا لـه گـشته



چەوڵەکی (مێوەێ) ئەبڕن ئەیئێژن
کە ڕوا (ترێ)ی بەری ئەچێژن
کەچی مێوەکەی باوکی کە پیر بوو
کاتێک زانی بڕیان زووبەزوو
هیچ نالێن ئەمە بەرمان خواردووە
ترێی دیاریمان بۆ خەڵک ناردووە
ئەمە عادەتی چەرخی دەورانە
بەنی ئادەمی تێدا میوانە
دیارە دوو میوان لێکیان خۆش نایە
بەرچاوتەنگییە، کە شەڕی تیایە
ئەگەر خوا عەقڵی دایتێ چاوتێری
لەگەڵ خوێشانت کەوتیە چاودێری
بێ هەراو هوریا کەوتنە هەڵکرد
ئەوسا ئەبینی (گۆی هونەر)ت برد
ئەگینە هەتا ئەمری بەدبەختی
لەم جیهانەدا کزو سەرسەختی
ئەمانە زۆر جار پیشان دراوە
بە پەردەی تەماع نەبینراوە
بەڵام تۆ باشی لێک بدەرەوە
چاوبەست لە چاوی خۆت بکەرەوە
ئەوسا دەبینی چەند خۆشە جیهان
تێکەڵی و دۆستی لەگەڵ هەموان



هەندێ کە ئیشی نابەجا ئەکەن
بەوە ئەخورن کە حاشا ئەکەن
وا تێگەیشتوون کە کەس ناوێرێ
کردەوەکەیان لەسەر بژمێرێ
نازانن لەگەڵ پێیان ترازا
دۆستی سەرسفرە ئەیدا بەئەرزا
ئەڵێن: ماست نییە بە لێودا دیار بێ
یا دار نابڕن، دەنگی مشار بێ
بەم ڕەنگە خۆیان تەفرەی پێ ئەخۆن
(توور) و (سیر) دیارن بە قرقینەو بۆن
کەروێشک کە ئەنوێ چاوی ئەبینێ
کە (دیاردی)ت لێ کرد، چاو ئەقووچێنێ
لای وایە کە ئەو چاوی خۆی لێکنا
چاو قووچاخدنەکەی ئەبێ بە پەنا
خەڵک ئیشی پەنهان ئەدۆزنەوە
کاغەزی سپی ئەخوێننەوە
(جام) ئەڵێ: بشکێم، بەلام نەزرێم
چاکەو خراپە دێنەوە سەر ڕێم
خوا ڕێی ڕاستان لە کەس نەگۆڕێ
(بارام) بۆ گووری خۆی خستە گۆڕێ



کیسەی تەماع و مەعیدە هەردوو
کە هەرچیت دەسکەوت، تێت ئاخنی زوو
ئەویان ئەدڕی و ئەمیان ئەشێوێ
جێگا نامێنێ شەوێ بۆ شێوێ
چارە ئەوەتە کە بەرە بەرە
تەماع لابەرەو خواردن دەربەرە
ئەوسا دڵ و لەش بە پاکی و چاکی
ئەمێنێتەوەو لە خەم بێ باکی
هەر چیت لە خەڵک سەند بە ناڕەزایی
ترس و لەرزێکە بۆ ڕۆژی دوایی
زوڵم و زۆر لە بیر کەس ناچێتەوە
ئەبێ بە دووپشک ئەدا پێتەوە
تەماشای حاڵی خۆت کەو بڕوانە
چشتێکیان بردی چەند لات گرانە
تۆیش بە نابەدڵ چشتێ بستێنی
دڵ ئەمین مەبە کە دڵ ئەشکێنی
گوناه بە ئاوی تۆبە دەشۆرێ
بەڵام (حق الناس) خوایش لێی نابوورێ
هەی هاوار! لە پێش چاومانە ئەمرین
هێندە سەهەندەین گوێی لێ ناگرین
کاتێک ئەزانین کە عزرائیل هات
بە پەشیمانی نامێنێ نەجات



پێکەنین دوانە، یەکێ هی خۆشی
ئەوی تر ژاری خەفەت ئەنۆشی
یەکێکیان ناوی زەردەخەنەیە
ئەوی‌تر، ژاری‌خەند، وەک ژار قەندەیە
گریانیش هەروا لە دوو چشتا دێ
تەنگانەو، کاتێ شینت دێتەڕێ
دووەمیان شادی‌و وەسلی عەزیزان
خۆشی‌یەکی وایە ئەتخاتە گریان
ئەمانە هیچیان (بایەخ)یان نییە
کە زوو بەسەرچوون کەڵکیان چییە؟
بە خۆشی تا سەر دڵبەستە، بەستە
ڕێی ڕەزا بگرە، بڕۆ مەوەستە
ئەوسا کە کەوتیە ڕێی عەشقی مەولا
تاڵی‌و شیرینیت، یەکسانە لەلا
ئەگەر ئەویشت لە لا گرانە
دڵنەوایی دۆست بە هەل بزانە
دۆستی یەک دڵ‌و یەک زوبان چاکە
بەوە پیاو لە خووی بەدکار بێ باکە
دوو چشت لەگەڵ یەک هەڵکردیان نابێ
(تەماع) و (حورمەت) هەرچەند لای شا بێ
واتەی پیاوانی کۆنە،دوور لە ڕووت
ڕیشی تەماعکار بە ڕەشی نابووت



کــە ئــەڕوانیتــە ڕەنگـــی نــەوبــەهــار
ڕاویـشکەی گیـاو گـوڵ بـە لـەنجـاولار
وات دیتــە خــەیـاڵ، جیهــان تــا ســەرە
(بــاغی ئــیرەمــە)و بــێ کــەلــەبــەرە
نــازانی چــەرخـــی دەوران بـــەهـــارە
ئــەو ئــاوو ڕەنگـــە، بـــێ ئیعتیبـــارە
هــەتـاوی ڤـینی لـە گـەڵ خـستەکـار
نـە سـوزە دیـلێ، نـە شـەوقـی گولـزار
بــەهارو ســەیــران دڵـــی بــێ غــەمــە
کە دڵ غەمگین بێ، هەرچیت بێ کەمە
چـارەی دڵخوشـیش کـەم تـەماعیـە
بـێ تامـە لـە لات سـەیـرانو یـا پـراخ
ئـــازادی چـــرای ڕێـــی ڕووناکییـــە
زەوقـــی (قـــەلـــەنـــدەر) لـــە بـــێباکییـە
ڕوونــاکی دەرکــەوت تاریــک نامێنــێ
کــە هــەتــاو نــەبــێ، سـێبەر نانوێنــێ
ئــەم ڕۆژو شــەوە پــەنــدی یــەزدانــە
دوای تـــاریکی شـــەو ڕۆژی ڕەخـــشانە
ڕۆژیـــش ئێـــوارە لێهـــات ئاوایـــە
نـۆشو ئـیش لـەگـەڵ یـەک بـەردەوایـە



دووکەس کە دڵیان لە یەک زویر بێ
وایان لێ مەکە، کەسیان شێتگیر بێ
چونکو ئەوانە کە ئاشت بوونەوە
وا لە تۆ دەکەن بچنە کونەوە
چوار کەس بە چوار خوو پەستن و بێدەس
تەمەڵ و نەزان، ناکەس و بێ کەس
چوار خوویش هەیە پیاو پێی دەبێ بێباک
دڵو دەستی پاک، کردەو بردەی چاک
ئەوی بۆ دۆستی بێعەیب ئەگەڕێ
تا دەمرێ دۆستی وای نایەتەڕێ
ئەوی لە دۆستی بە بیانوو تۆڕ بوو
کاتێکی زانی دوژمنی زۆر بوو
کە دۆستت لەگەڵ دوژمنت هەڵسێ
بە دوو ڕێ نابێ تۆ قینت هەڵسێ
ئەگەر دۆست دۆست بێ بۆ ئاشتیانە
لێی گەڕێ مەڵێ لە لام گرانە
خۆ ئەگەر زانیت دۆستی ناپاکە
با بۆ دوژمن بێ، هەر بۆ ئەو چاکە
ئاوەڵ پیاڵە، ئەوالە خۆرە
بۆ کاسەو کیسەیش مەندەبوور زۆرە
کە سفرەو خوانت هاتەسەر (دۆکولیو)
کەس لە دەرگاکەت نایێتە ئەمدیو
بەلام کە (کەباب) بوو بە بابۆڵە
تێی ئەورووژێن، ڕۆڵە و بابۆڵە



دۆستت بە (جەفا) ئەبێ بە دوژمن
چاکە، خراپە دەردێنێ لە بن
ئێمە لە چوار شت دروست کراوین
لە خاک‌و بادو ئاگرو ئاوین
ئەو چوارە، لەگەڵ یەکدا هەڵناکەن
کێ دەڵێ ئینسان پەی جۆری چاکەن
شوکری خوا بکەی ڕۆژیت زیاد ئەبێ
(سپڵە) هەمیشە ڕەنج بە باد ئەبێ
چوار چشت بۆ چوار کەس ئەبێتە نامەردی
بۆ عالم، (کیبر)و بۆ ماڵدار (ڕژدی)
(رووهەڵماڵراوی)یـژنی بێ ئابڕوو
نادان کە (درۆی)لا بووە بە خوو
چوار ناویان بۆیە لە چوار کەس ناوە
لەبەر کردەوەی لێیان رووی‌داوە
(چرووک) کە خۆیشی لە ماڵی ناخوا
(بەخیل) کە هیچی لێ نادا بە خوا
(سەخی) کە ئەیخواو ئەیشیداتە خەڵک
بۆ خۆی‌و ناسیاو، بۆی ئەبێ بە کەڵک
(بەخشندە) هەمووی ئەبەشێتەوە
ئەوەی پێ ئەبڕێ، ئەمێنێتەوە
بەخشین ئیسرافی هەرگیز تیا نییە
بۆ دوژمنیش هەر سەخیەتییە



ئـەگـەر هـاتی خـۆڵ بکـەی بـەسـەردا
لـە ماڵـە گـەورەو خۆڵـی بـەردەرگـار
ئـەمـە بـۆ گـەورەی سـەخـی بێـژراوە
بـە سـەر چرووکـدا هـەر خـاک بێـژراوە
خزمەت بۆ مـەردو شـەفـەقـەت بـۆ وردان
هامـڕازیی دەروێـش، بێـدەنـگ بـۆ نـادان
تـەنیـا بـە عـیلمو ئـەخـلاق بنـازە
دەوڵـەت نـەگبـەتـە لـە خـوای مـەخـوازە
کـە زانیـت دۆسـتو خوێـشانت ئـەهلـە
هـەمـوو کارێـک ئـەوسـا بـۆ سـەهلـە
هەرچی دڵ خۆش کا ئەیخەنـە مـەیـدان
خاک بە سەر پارە، کە ئـەیکـەن پـەنهـان
نـەفـس و ژن بـە جـووت بـەسـەرتـا زاڵـە
ئـەویـان دووپـشکەو ئـەو زەردەواڵـە
(تیغ) ڕاسـت گۆییـەو (زرێ) قـەناعـەت
بەخشین (کەمەند)ەو (سکووت) سەلامـەت
کـە بـە ڕەنجـی شـان دەسـتت نـەکـەوێ
ڕۆژ خەرجی ئـەکـەی، نایخـەیتـە شـەوێ
بەڵام کە ڕەنجت لەگەڵ سـەرت ئێشابێ
نایبـەخـشی مـەگـەر سـەرت ئێـشابی
ئێـستیغناو توغیـان کـە دوا بـە دوایـە
بـاوەڕت بیـێ فـەرمـوودەی خوایـە



ئـەوەی کـە ئیـشی نابـەجـێ ئـەکـا
ڕەنگـە خـۆی ئـەوە بـە بـاش تـێ بگـا
ئەگـەر تێـت گـەیانـد کـە ناپـەسـەنـدە
ئـەشـێ لـە سـەری نـەڕوا ئـەوەنـدە
خۆ ئەگەر هـاتوو گـوێی لـێ نەگـرتی
تـۆ بیبـڕەوە ئیتـر بـە کـورتی
کـەسێ گلـەیـی دۆستی لای تـۆ کـرد
تـۆ بـاوەڕ مـەکـە هـەروا دەستوبرد
تـاکوو لـە جـوابی ئـەوی‌تـر ئـەگـەی
ئینجـا ئـەتـوانی حـوکمی خـۆت بـدەی
(سـەلـەم) فێـلیکە مـاڵ بـە دەغـل ئـەبـڕن
ئـەڵێن شـەرعیـیە، دەستی پـێ ئـەبـڕن
جـەردەیـی کـەوا بـە ئاشـکرا
هـیچ نـەبـێ غـەزوەی مـەردیـی تێدایـە
بـەڵام بـە نـاوی شـەرعـەوە (ربـا)
ئابـڕووی شـێوەی دیانـەت ئـەبـا
ئـەبـێ ڕۆژێکـی وامـان لـە بـیر بـێ
دەستمان لـە چـاکی پێغـەمـەر گـیر بـێ
ئـەو (چـاکـە) چاکـە بـۆت دێنێتـە گـیر
پـەنـدی پیـاوی پـیر پـەسـەنـدە لای ژیـر
جـاران ئـەگـەڕان بـۆ پیـاوی ڕیـشدار
ئێـستا وا پـرچو ڕیـش بـووە بـە عـار



پیاوی ناوەجاخ مەخەنە سەر کار
قۆچ ئەوەشێنێ دوایی وەک گای هار
لە پێشدا بە تاو تیژپەڕە وەک تیر
زوو دادەماڵێ وەک گۆلە بارگیر

خوا چزوو نەدا بە (زەردەزیرە)
هەتاو نەبینێ ماری کەسیرە
بە دەنکە جۆیی، گوێ درێژ ئەزەڕێ
لە خوشکی خۆیشیو خوێشی ئەپەڕێ

کەریدز، مەنێ جۆی بۆ بێوی
تۆپینی ئەوێ و زیانی خێوی
ئەبینم کە خوایش رووی لەمانایە
وابزانم مشتەی ناو هەمانەیە

من ئەڵێم بۆیە خوا ئەمە ئەکا
عاقل لە حیزبی زەمانە بگا
دیارە کە دەوران (ئەبلەه) پەرستە
وشیارو دانا رووی لە نوشوستە

کەواتە لە شوێن سەربەرزی مەمرە
دەست بە کلاوی خۆتەوە بگرە
(پادشا)و (گەدا) وەک یەک ئەچنە گۆڕ
گەدا بارسووکەو شا کەڵەکی زۆر

ئەوی نانەوێ بۆ تیکە نانێ
سەروژێری خاک بە یەک ئەزانی



ئــەوی ڕادەکــا زوو هــەڵــئەنگــوێ
ئــەوی لــەســـەرخــۆ بــڕوا ناکــەوێ
یــەکــێ تــا درەنــگ نــەئــەکــەوتــەڕێ
بە (گورگەلۆقە) ئەیویست پێشکەوێ
کــە تــۆ نــەتــوانی لــە (بــان) بازبــەری
خانــەوخــان چییــە کــەوتوویتــە ســەری
لــەزەتی نیعمــەت کــەســێ ئــەیزانــێ
کـــە دامـــاو بووبـــێ بـــۆ پاروونانـــێ
ئــەگینــە کــە هــات لــە بــادی هــەوا
بــە (قێــزو بێــز)ێ دەســتی بــۆ ئــەبــا
ژۆری پـــێ ئـــەوێ ماکینـــەی دەوران
کــە یــەکێکــی (قــاڵ) بێنێتــە مــەیــدان
بــە داری بــەرزا هــاتی ســەرکــەوی
دەستت تونــد بگــرە، نــە وەک بکــەوی
چێشتت گــەرم بێ، ڕاوەستە مــەیخــۆ
بــا نــەڵــێی دەمــم ســووتا باوکــەڕۆ
پاروی پــەلــەپــەل بــۆت قــووت نــادرێ
کــە لــە (بــین) گــیرا چــاری نــاکرێ
(نــان) لــەبــین گــیرا چــاری بــە ئــاوە
(ئــاو) لــەبــین گــیرا دەرمــانی جــاوە
هــەنــدێ خــواردنیش چــاوی لــە دوایــە
لــە قــورگ ئــەگــیرێ ئــەوە لــە خوایــە



چاکە زوو لە بیر خەڵک ئەچێتەوە
قینی خراپە، هەر نابڕێتەوە
تۆ قینەبەری خەڵقت گرتە دڵ
ئەو قینە بۆ جەرگ ئەبێ بە چقڵ
هەمیشە دڵت خەفەتبار ئەبێ
خواردنت لەلا ژەهری مار ئەبێ
وا چاکە کە قین لە دڵ دەراوی
ئەوسایە خۆیشت ئەزانی پیاوی
بە دڵێکی خۆش ئەنوویت و ئەخۆی
شەو بەدەردەوە ناناڵێنی بۆی
ئەگەر پادشای جەواهیرپۆش بێ
هەمووی بە فیدای دڵێکی خۆش بێ
دڵخۆشی بە راست هەر بە خودایە
خوا نەیدا، نابێ، رەنجی بە بایە
زۆر لەگەڵ حوکمی چارەنووس ناکرێ
بە بێخواستی خوا، هیچ سەرناگرێ
هەندێکیوا هەن خۆیان ناناسن
سەربەگێچەڵن، کەوتەو کەساسن
چۆلەکە کە نووست لە (لانەی) شەوا
هەردوو قاچی خۆی ئەکاتە هەوا
ئاسمان رووخا، ئەو ئەیگرێتەوە
کەچی بە بەردێ ئەبوورێتەوە



هەتای هاوین پیاو ئەبرژێنێ
هیوایش هەیە خۆی، تێناگەیێنێ
پیاو نەک بە هەتاو، بە ئیش ئەبرژێ
داوی خاو نابێ بە هەودای کرژێ
(ڕیس) کە دووباد بوو، بەرگە ئەگرێ
ڕایکێشی دەزووی بەغدا، ئەپچڕێ
لە هەموو شوێنێ ماکینە باوە
(گوریش کێشەکێ) هەر لێرە ماوە
خەڵک گەردوخولیە لە ڕووی ئەفلاکا
ئێرە خەریکە بە جەواڵ ڕاکا
بۆیە لە هاوڕێ ئەکەوینە پاش
وا (خەنجەر) ئەسوین بۆ (ئەوەن بە ئاش)
بامان دایەوە سەر (شەڕە گەڕەک)
ئینجا ئەبێ پیاو بچنە بەر (خەڕەک)
بەم دووخە خوارەو قینەبەرییە
کاتێک زانی (ڕیسمان خورییە)
ئەمانە هەمووی لە بێکارینە
ئەڵێن برسێتی ڕەگی هارییە
دەولەمەند نۆرە بە هەژار نادا
نانیکیش نادا لە ڕێی خودادا
ئەوەی کە قەدری نامووس ئەزانێ
خۆی (قەمتەر) ئەکا بە تیکە نانێ



گـوێ لـە دڵـسۆزیی شـێنەیـی مـەکـە
پایـــەی دیـــوانی بـــەردی مـــەحـــەکـــە
زۆر دۆسـتی بـێدەسـت گیـانی گیانییـە
کـــە دەســـتی ڕوویـــی نـــانی نایـــە
ئـــەوی ئـــادابی دۆســـــتی ڕاگـــــرێ
کـەڵـکی وەزیفـەی گـەورە نـاگرێ
چونکـو ئـەوانـەی کـە کۆنـەدۆسـتن
بـە هـۆی ئـەوەوە بـە هیـوای پۆسـتن
ناڵـێن: ئـەم پیـاوە ئـەمـەی پـێ نـاکرێ
هەر دەڵێن: کەڵکی ئاشنای خۆی ناگرێ
زیـانی دۆسـتو کـار دروسـتی خـۆت
ڕەوا مـــەبینـــە بـــا بیـــشلوێ بـــۆت
کە تۆ ئیشی خۆت لە دۆست سەرئەخەی
پیـشەی مـەنفـەعـەت جـۆیی دەرئـەخـەی
کـەوابـێ حـەقـی گلـەیـت نییـە
ئـەم بـڵتو بۆڵـەت ئیتـر لـە چییـە
ڕۆژێـک ئـەبیـنین پیـاوی تـەماعکـار
دوڵـەتـەکـەی خـۆی بـۆ نابێتـە کـار
لـە هـەمووڵاێـک بـە چـەپـۆک بـاران
بـۆی دادەبـارێ وەک تـەرزەو بـاران
ئـــەوســـا دەزانی کـــە دزیو گـــزی
لێـی بـووە بـە (خـۆرە) تـا ئێـسکی ڕزی



ئـەزانـن (واسـە) چۆلـەکـە ئـەگـرێ
بـە خـۆڕایی چـۆن بـەخێـو ئـەکـرێ
چیرۆکـەی (گیـسکی هـەیاس) کـە باوە
ئـەو دەسـتوورەیـە ئێـستایش لـە نـاوە
بناغـــەی جیهـــان وا دانـــراوە
کـەم دەم و دەست بێ، بـەشت خوراوە
بۆیـە ئـەم (ئێلـە) لـە نوشوسـتایە
هەرچی هـەڵـدەسێ بۆ خۆی کوێخایـە
دووبـــەرەکییـــە و تـــالعی ناســاز
ئەمیان ئـەڵـێ: سیر، ئـەویان ئـەڵـێ: پیاز
دەست لـە هـەویـرو دەم لـە تـەدبیرا
ئاو لـە (قـەڵـبیرا)، (خۆزێلک) لـە شیرا
خەسوو بـە خرکێ، بووکێ بـە بـرکێ
تێـک بـەربـن شـیریان چـۆن نابزرکـێ
باڵۆرەی بووک و خەسووی گوێ لێ بوو
بۆیـە کچـەکـەی نـەئـەدا بـە شـوو
کـەچی کـچ دەستی لـە دایکی بـەردا
(مەیموون) زۆر جوان بـوو، ئاوالـەشی دەردا
هێنـدە هـەڵپـەڕیم تـا کـەوشـم دڕا
شـایی شاباشـی شـایم پـێ نـەبـڕا
ئیتر (تۆبـە)م بـێ هـیچ تـەفرە نـەخـۆم
مـن و کـەبـاب و وێرانـەکـەی خـۆم



چەند خۆشە ئینسان خەیاڵ پەروەر بێ
بە چاولێکنانی، شای حەوت کیشوەر بێ
زنجیری (خیرەد) لەشان فڕێدا
لەگەڵ زانایان نەڕوا بەڕێدا
بێ (نعمان) تەرحی (خەورنەق) دانێ
پڕ لە (موبیلیا) و فەرش بێ بە ئانێ
لە سولەیمانی وەک سلیمانێ
(بەلقیس)ی بۆ بێ بە چاولێکنانێ
یا لەدواییشدا با بێو خەیاڵ بێ
کە چاو هەڵبڕێ بۆش و بەتاڵ بێ
ئەمەی خۆشترە لەو دەولەمەندە
کە دەولەتەکەی ئاوێکی مەندە
بە خەوو خەیاڵ لەبەری ناڕوا
هەناسەی خەڵکو داخی خۆی لە دوا
ئاو کە لە بەری نەڕوا ئەگەنێ
ماڵ نەیخوا، خەڵکی پێ پیدەکەنێ
ئەوە پێی ئەڵێن لغاوی شەیتان
مارەیی دایکی پاشای جنۆکان
(بزەن بەر سەفێ ڕەندان) مەپرسە
پیاوی (قەلەندەر) بێ هیواو ترسە
گریمان بوویتە (هیتلەر) بڕوانە
کەوتە بەر لەعنەت برای شەیتانە



هاوینــەو گــەرمــاو میــوە گــەنانــە
نیــوەی ئــەم شــارە لــە ســەربانــە
تــۆزی ڕەشــەبــاو چاویــەشــەو هــاوار
ســەربــانی ویــران پــڕ دووپــشکو مــار
لــە هــەمــوو لایــی گریانــەو قــوورە
کفــر ئــەکــا پیــاوی بێخــەوی تــوورە
شــەو لــە ســەربانــات کــە دەچنــە ســەراو
ڕۆژ هــەڵــدەقرچــێ بــە تــینی هــەتــاو
ئینجــا (ڕەشــەبــا) ئــەو تــۆزە دێنــێ
وەک (عەتر) و (عەنبەر) هەڵیەپرژێنێ
گــۆزەو دیــزەشمــان کــە پــڕن لــە ئــاو
ئــەو تــۆزەی تێچــوو ئــەبــێ بــە گــولاو
هێجگار چەند ماڵێک لە سەر یەک سەربان
چیغێکــی تــەنــک کــەوتۆتــە بــەینیــان
گوێیــان لــە مرقــەو پرخــەی یــەکتــرە
(تــەگــەو ســابرێنی) بــە ئــەدەبتــرە
زۆر جــار ڕەشــەبــا (دەرپــێ) ئــەفــڕێنێ
هیوایــشیان هــەیــە (دەرپێــی) نامێنــێ
بــەم حاڵــەیــشەوە هێنــد بــەرز ئــەفــڕین
خۆیــەخــۆ ســەری ســەران ئــەبــڕین
پیاو بێئیش بێ شەڕ هەڵدەگیرسێنێ
بێ (دەرپێ) مەندیل لە خەو ئەبینێ



خـوا کـە گیـانی پـاک ئـەبـەشـێتەوە
هەنـدێکیان دوای مـەرگ ئـەدرەوشـێتەوە
لـە بـارەگـای خـوا، لـە ڕووی زەمینـدا
لـــە ڕۆژهـــەلاتو لـــە خۆرنـــشیندا
ئـەڕواو ئـەگـەڕێو زۆرتـر لـە خـەوا
خـۆی نیـشانئـەدا لـە پـەردەی شـەوا
ئـەگاتـە فریـای کـەسو کـاری خـۆی
ئـەبێتـە چـرای ڕێـی ڕزگـاری بـۆی
هـەنـدێ گیـانیتـر پێیـان ئـەڵـێن، پـیس
ئـەکـەونـە لـەشـی بـەدکـاری نـەگـریس
بـە هـەر چـوارلادا ئـەکـەونـە (جووتـە)
کـردەیـان لـەگـەڵ شـەیتانـا جووتـە
(تیکـە) لـە دەمـی بـێ دەسـت دەفـڕێنن
هومـــای ئاســایش هـــەڵـــدەفـــڕێنن
تـا دەســتیان ئـەڕوا کۆئـەکـەنـەوە
لـە خـوداو بـەنـدە (کـۆ) ناکـەنـەوە
لــەپــڕ ئــەبــینی کــە بــەلادا هــات
هـیچ کـەس نازانـێ، پـارە چـێ لیهـات
لـە گـەڵـی ناچـێ بـۆ (گـۆڕ)و کـونی
ئـەبـڕێ بـە مێـردە تـازەکـەی ژنی
یـا ڕۆژێ ئـاهی جـەرگێکـی کـونکـون
پـەلی ئـەبـەسـتیو ئـەیاخنێتـە (کـون)



مریشک (ئەیخورا)، خۆی خستە ژێر (قاز)
بۆ ئەوەی (هێلکە)ی گەورە بدا ساز
کاتێکی زانی! هێلکەی (تیا جەڕا)
بە زۆر تەقەڵی (بن کلکی) پچڕا
(ناشی) بێهوودە کەوتۆتە دۆلاب
(نان بۆ نانەوا، گۆشتیش بۆ قەساب)
(ئێستر) داری بۆ مەنجەنیق کێشا
بە (وەجاخ کوێری) ناوجەرگی ئێشا
پێت مەخەرە (کۆت) بە پێلاوی تەنگ
کە (کەوش) پێی گرتی، (پێ)ی پێ ئەبێ لەنگ
میوەی کاڵ مەخۆ زگتی پێ دەێشێ
(شەکر) بە گەرما، زۆر ئاو ئەکێشێ
جاران نەخۆشی (شەکر)مان نەبوو
منی وا گرتووە، بەرمنادا زوو
من لە تەلاشی تورشی و تەلاشم
(ئازەچک ئاشم، سانجیسز، باشم)
بڵێم چی؟ ئەوسا گاڵەو هەڵدا بوو
گاڵی (کاڵ) خۆر بوو (گاڵ) بەرەڵدا بوو
وا لە پاش (خەمشێ) ڕێمان لێ ئەبڕن
گوایە بە ئایەت دەستمان ئەبڕن
کێ گوێ ئەداتە ئەو دەستبڕینە
هەر دەست بڕینە کام دەست بڕینە



پارووپە بخەرە دەم کە بۆت قووت بچێ
نەک بە ژان لچت پێکا بلچێ
ئەوی پەلەپەل پاروو ئەفرێنێ
بۆی قووت ناچێو خۆیە (تی) ئەفرێنێ
هەندێ ئەبینی (یابوو)ی خوراسان
وا ئەزانی بار ئەبا بە ئاسان
کاتێک زانی لەرێدا وەستا
کابرای قەتارچیش قینی لێی هەستا
بە قەمچی کەوتە سەرو گوێلاکی
وای لێ کرد سەگ، چاو ببڕێتە لاکی
ئیشە ئاوێنەی ئینسانی بەکار
هەموو کاتێ جێی کار ناگری گوفتار
ئاگری درۆزن ساتێ ئەگرێ
ئیش نەزان دوایی مووچەی ئەبرێ
تۆ گوێ مەدەرە ئەوانەی ئەمرۆ
خۆیان ئەژێنن بە هەرۆو مەرۆ
یەکێکی ڕاستڕەو، کە کەوتە ڕووی کار
ئەیانگلێنێ، ئەکەونە هاوار
ئەوسا پەشیمان شاخی لێ ئەڕوێ
(ڕێوی)ی قومارباز پێستی ئەگروێ



ئــەوە کێیــە وا کــەوا خــشەی دێ
مـام ڕەمـەزانـە، دیـارە مـشەی دێ!
وا بـە گـردە گـرد مـام ڕەمـەزان هـات
پـەیکـەری (پۆکـەر) بـرەوی داهـات
هەرچەند پۆکەرچیی کۆن زۆریان دەرچوون
تـازەپێگـەیـوان وا لـەڕست بـەربـوون
یـەکێکیـان تیایـە ئـاگری بـن کایـە
کـە شـێخو مـەلایـش دێنێتـە کایـە
دوومیـان قوتـەی مـل نێرکـە کـاردوو
سـەر مارمێلکـەو پـشت پـووچی ماردوو
کـەس نـەکـەوێتـە داوی ئـەوانـە
بێ (ڕێست) لە ڕەشی ئەکوژن ئەو دوانە
ئـەوانـەی بـە ڕاسـت ڕۆژوو ئـەگـرن
هـەڵـدەگـرێ بـڵێن: بـە بـاڵ ئـەفـڕن
قـەڕنێکـە گـەرمـای ڕۆژێوا نـەبـووە
گـەرمـا لـە وزەو تاقـەت دەرچـوو
پاداشـی ئـەمـە جـەژنێکـی وابـێ
بـۆ گـەل بـێو بـەشـی کوردیـشی تیابـێ
بـەشـێکی وامـان بـۆ بیرێتـەوە
کـە بـە یـارۆدا خـەرج نـەبێتـەوە



جیهان پڕ فتووح مانگ هێند موبارەک
تەنهل من ماوم بە بێ تەدارەک
شاربازێڕ چەمی سیوەیل و ئالەک
توتنەو تۆوی بڕاوە کالەک
وەک ژاری قەندە عەیشمان تال بوو
پیرەمێرد لە شوێن شووتی عەودال بوو
بەو عەودالییە چووە (عەودالان)
بووبوو بە شووتی کەللەی هندالان
تووکەی سمێلی دیت پیرەکەی (موغاغ)
کۆگای بانقەنۆت بۆی بوو بە وەتراغ
یاخوا ئەوانەی سەوزەیان لەناو برد
پارەی توتنیان بۆ (کەللەچی) برد
خوا هەر تالی بان باتێ وەک توتن
گیانی شیرینیان لێ بێ بە دوژمن
ئەوانەیش پەین ئەکەن بە مومتاز
جێیان پایین بێ نەبن سەرفراز
بەپەشیمانی شاخیان لێ بڕوێ
شاربەدەریان کەن بۆ گردەگڕوێ
ئەوانەیش هیوا ئەکا بە لوجنە
گیری گێرە بێ وەکوو گای بنە
وا بە لێوی وشک کەوتووینە هاوار
فریامان کەوە گەورەی ئینحیسار



زۆر شاعیر لەگەڵ ڕۆژوو دواون
لە ناو برسیەتی سەر لێ شیواون
ئەڵێن: ڕەمەزان ڕووبکەیتە ماڵم
تۆ دەخۆم هێندە برسیو کەم حاڵم
قەلبی (ڕەمەزان) کە (مەرەزانە)
ڕۆژ، لات، شەو، ئاوبەند نەخۆشی دوانە
بۆ تووڕەی ڕۆژوو ئەمە بێژراوە
ڕەمەزان بەجەنگ سەفەر بەدناوە
ئەزانی ئەسڵی شەڕ لە کوێوەیە
برسیەتی ڕەگی هاری پێوەیە
لە برسیەتیە ئەم گرو گاڵە
تەبەقی پڕە ئاشتیی ماڵە
کە گورچووت پڕ بوو دڵت بە گوڕە
نابوود تێریش بێ، هەمیشە وڕە
خوا شیرینییەکی وای داوە بە زەڕ
زەڕ بڵێی کەریش دێتە زەڕەزەڕ
عالەم بۆ پارە ئاخ هەڵدەکێشێ
ئەویش مێشێکە لە تەرس دەنیشێ
ناوەستێ بە لای مەردی ژیرەوە
وەک ئاو بکەیتە ناو قەڵبیرەوە
ئەمەش من داخی دڵمە وا ئەڵێم
من ئەیپەرستم ئەو توراوە لێم



ڕۆژوو بەسەرچوو سبەینێ جەژنە
ئینجا تەقەلـلا بۆ بالاو بەژنە
بۆ دەستدارەکان قوماشی مومتاز
ئەکرێ بە (کۆستۆم) ئەپۆشن بە ناز
وای پێوە ئەڕۆن دەقی ناشکێنن
لە پێش چاوی خەڵک خۆیان ئەنوێنن
خۆزگە تیژیی چاو (ڕۆنتکن) بوایە
ئەیبینی ژێر جل چەند لەکەی تیایە
هونەر ئەوەتە ژێر بەرگت پاک بێ
سەر بەرگ چاو بەستە، کردەوەت چاک بێ
تانوپۆی بەرگت کە جەورو زۆر بێ
ئەیکا بە دەردێک ئالۆشی زۆر بێ
درۆیێکیان کرد پاش شەڕی جیهان
عالەم ئەسرەوێ ئەمین و ئەمان
کەچی بۆمبایێک پەیدا بوو لە پڕ
لە بۆمبای خەسفی قاروون بەگوڕتر
چەند هاوارمان کرد کە ڕۆژی جەژنان
ماتەم دامەنێن بە شین و گریان
گۆیتان نەدایە خوایش وا بە دڵ خواست
ئێوەی خستۆتە شیوەنی بە ڕاست
ئینجا گۆڕتان بێ بە شینی گۆڕان
بلاوێننەوەو بچنە گۆڕستان



ئـــەوی ئـــازاری نـــەبـــێ ئـــۆف ناکـــا
ئەویـش بێـزار بـێ لـە هـیچ خـۆف ناکـا
کـە دڵـم خـۆش بـێ بـۆت هـەڵـدەپـەڕم
دڵـــم بـــشکێنی بـــە شـــەڕو گـــەڕم
لـــەم زەمانـــەدا بـــەشـــەڕ بـــەشـــەڕە
تـــۆ شـــەڕت نـــەوێ بـــەخێـــر تێپـــەڕە
خـوا کـە گیـانو نـان ئـەدا بـەم خـەڵـکە
هێنـدەمـان ئـەوێ هـەتـا بـەکـەڵـکە
کـە حاڵـمان هاتـە سـەرکـەمو کـوورێ
ئـەکـەوینـە سـەر کـوفرو ناشـکوری
بـەڵام ئـەو نانمـان نابـڕێ یـەکجـاری
ئـــەمانژێنـــێ بـــۆ بـــوردەبـــاری
چەقو تیژ بوو گۆشت ماشەڵڵای دەوێ
کە گەیە سەر ئێسک پەکی ئەکەوێ
چاکـــە نـــاوی خـــۆی بـــەخۆیـــەوەیـــە
خـــۆش رابـــورادن بـــە ئـــاشمۆووەیـــە
(سـەعـدی) فـەرمـوویـە کـە زەڕەخرِیـد
نـــەتلاوانـــدەوە بـــۆت بـــە تـــەریـــدە
ئـــەگـــەر رووخۆشـــی بێگانـــە دۆســـتە
ئـــەم راو ریویـــە بـــۆ کـــەوڵو پۆســـتە
بـــەڵام دنیایـــە بـــێ گـــەردش نابـــێ
هـــەروا رۆییـــوەو هـــەر ئـــەبـــێ وابـــێ



خوا جەهەنەمی خستە قورگی مار
بۆ ئەوەی ئەگەر تێکەڵ کا بە ژار
مار ساڵی جارێ پشوویێک ئەدات
بەو پشووە ساردو گەرن ئەبێ ولات
هەناسەی کێشا ساردی زستانە
پشوویدا گەرمی تینی نیرانە
هاوین ئەوگڕە دێت بەرەو پیرمان
هێشتا جەهەنەم نابێتە بیرمان
وا لێرە بەفر ئەکەین بە بەفراو
خۆ لەوێ ئاومان حەمیمەو زووخاو
وا لە جەهەنەم لێرە خەم ساردین
چی دەکەین کە خوا بۆ ئەوێی ناردین
ئێستا چارەمان پەشیمانییە
تۆبەیە ڕێگای موسوڵمانییە
خوا هەموو حەقی خوایی دەبەخشێ
بەڵام حەقی خەڵک ناڕواو نالەخشێ
ئەو زۆرداریەی تۆ ئەمڕۆ هەتە
سبەینێ بە شەرع ملت لە پەتە
لە مەڕ ئە یسێنی ئەیدەی بە گورگان
بە دەستی خاڵی ئەچیە بەر دیوان
خۆ لەوێ نیتە کە بیدەیتەوە
چۆنە ئەو ڕۆژەت بیرئەچێتەوە



بـــرا! مـــن و تـــۆ تـــۆوی خـــاكێكن
چـەكـەرەی تـازەی ژێـر خاشـاكێكین
هێـــشتا هـــەوایـــی نـــەش و نمـــایی
نـەكـەوتۆتـە كـار بۆمـان لـە لایـی
بـەرگـەی بایـەكـی موخـالیف نـاگرین
كـەچـی بـۆ حالـی یـەكتـری نـاگرین
ئـەوەی دیـواری خـۆی بـن كـەنـد دەكـا
پـەردەی نامێنـێ خـۆی بـە پـەنـد دەكـا
هەر قینـت هـەڵسێ و دەسـت بدەیتـە دار
بـەنـدی جـەرگیـشت لێـت ئـەبـێ بێـزار
خـــەلیفـــە قـــادر فـــەرموویـــە یابـــە
لـــەگـــەڵ زەمانـــا بـــەمـــودارا بـــە
پـــەنـــدی پێـــشینان بـــە دڵـــسۆزییە
خێـــر خـــواهیینكی گـــەل و هۆزییـــە
كـە، تـۆ نـەتـوانی ڕەگـم دەركێـشی
بـــە بـــاوكی ئـــەبـــێ نـــازم بكێـــشی
دوو شووشـــە بـێنی بیـدەی بـە یـەكـا
كاتێكـــت زانی هـــەردووكیـــان شـــكا
كـەواتـە شووشـەی عـەیشت مـەشكێنە
بـا دڵ تـەنـگ نـەبی دڵ مـەڕەنجێنـە



ئەگەر زوبانت بێو فێری سەر بێ
نوقتەیەکی زیاد ئەخاتە سەر (بێ)

هێند بە (زیانە) بڕینی زوبان
سارێشی نابێ بە داوو دەرمان

کە قینت هەڵساو دەستێکت وەشاند
شووشەی ئارامو خۆشی خۆت شکاند

پیاوی قین لە زگ سیسەمەڕۆیە
گریشی نیە (سوتەمەرۆ)یە

هەرچی سەر ڕەقو دەم بەهەرا بێ
ئاردی بەڕووە پەیینکەی نابێ

کە دووبەرەکی کەوتە ناو قەومێ
ئاردی ناو دڕک لەوان ئەقەومێ

ئەمانە هەمووی وا لە پێش چاوە
بەدبەخت نایبینێ بۆ خوا پێداوە

ئەوکەسەی کە زۆر لە خۆی بایی بێ
گوڕ وایە (گولی) دوور ئاوایی بێ

چەند خۆشە قەومێ هەموو یەک دڵ بن
لە ڕووی جیهاندا وەک دەسکەگوڵ بن

ئەوانەی کەوا یەک دڵو دینن
پێکەوە خۆشی جیهان ئەبینن

ئەوانەی لەگەڵ یاران لە دەشتان
لەم دنیایەدا لە ناو بەهەشتان



جاران بۆ خواردن چەتاڵمان نەبوو
بە (دان) گۆشتمان ئەپچڕیو ئەجوو
لاقە مریشکمان ئەگرتو بە گاز
ئەمان کردەوە وەک چەکوشی بیراز
پەل پێنج پەلیە چەتاڵ چوار لقە
پەنجە تونددوتۆڵ ئەو ڕەقەو لەقە
چەتاڵ توند نەبێ لە چشت وەک گازێ
بۆت هەڵناگیرێ لە پڕ تەترازێ
خۆ لە چشتی ڕەق دەم تێناژەنێ
کە کەوتە خوارێ خەڵک پێ دەکەنێ
ئایینی ئیسلام دەستی داناوە
وا ئێستا چەتاڵ لە ناوا باوە
چەند خۆشە پەنجەت بلێسیتەوە
دووبارە دۆخت بڕێسیتەوە
ئەوکەسەی کەوا بە کێرد نان ئەبڕێ
تەحقیری زادە بەوە نان ئەبڕێ
ئێستا گرانی نانی بڕیوە
گوایە خاوەند شار نرخی بڕیوە
وا توتنیشمان لێ کەوتە گاڵە
عەیشی ئەم خەڵکە بە (توتن) تاڵە
بەلام وا (توتن) حەلوای شیرین کرد
حەلوای شیرین هات تاڵیی لە ناو برد



تــەنهــا بــە تــەنهــا پــڕ لــە بــەڵایــە
(اقبال) (لابقـا)، (تخـت) (تخـت)ی تیایـە
سـەر دار زۆر سـەردار سـەر دایـر ئـەکـا
نـاخی زەوی (خـان) نـاخن بـڕ ئـەکـا
مایـەی هـەناسـەی ژیـان کـە (بـا) بـێ
بـا بۆڵـە نـەکـا، دام بـە کـەبابـێ
پیـاوی گـوێ ئـاگر جـەرگـی بـێکونـە
تفـەنـگ ئـاگر دەی هـەولـی بـۆ کونـە
دۆ و دۆشـاو بـە نـاو هـەردوو شـیرینن
کـافرو کـەشـیش هـەردوو بـێ دینن
لە سەر ڕێی (کفری) یەکێ کفری کرد
لای خـوداو بـەنـدە ئـەجری خێری بـرد
ڕەمـەزان (سـەفـەر)ی بـە سفر دەرکـرد
بۆیـە جومعـەیـان لـە شـەممـەدا کـرد
سـا، وەرە، بـرنج بـڕەنجـە ئـەمسـاڵ
شـامەو نۆکی کـون گاڵـە ئـەکـا، گـاڵ
مـن لـە سـلێمانی بردوومـەتـە سـەر
ژاراوی مـەرگـە، ئـەم خـەنـە (پـشدەر)
بـە شـەکـر دەمیـان شـیرین کـراوە
چـاو لێـک نانـە دان ژانی نـەمـاوە
ئـەزانی کـە چـۆن خێـرت دێتـەڕێ
نوقتـەی (خ)ی لابـە بێخـەرە سـەر (ڕێ)



پارەی بەخشندەو ئاوی ناو بێژنگ
وەک پشکۆیەکە بکرێتە ناو چنگ
چرووکیش دانو گیانی بکێشن
نەک دیناریکی لە دەست دەرکێشن
ئەم دوانە هەردووک خوایێک دایڕشتوون
لە مەبەستی خوا تێ نەگەیشتوون
ئەگینە ئەوەی ئەیبەشێتەوە
زۆر جار بە برسی سەر ئەنێتەوە
ئەوەیش کەوا خوا پیشەی ڕژد ئەکا
لە ئێمە زیاتر حەز لە چێشت ئەکا
بەلام لغاوی شەیتان کراوە
بۆ نەوسی خۆیشی بەشی بڕاوە
خۆیشی نایزانێ کە بە کێ ئەبڕێ
تا ئەمرێ و کفنی بەقەد ئەبڕێ
لووتی لە بەردی ئەلحەد بکەوێ
ئەوسا ئەزانێ بەر کێ ئەکەوێ
ئەگەر بە خەوی شەو بیزانیایە
کە ئەم چروکیە ئەوەی لە دوایە
هیچ نەبوایە خۆی تێری لێ نەخوارد
بە مێردی تازەی ژنی لێ نەخوارد
بەلام بە من بێ ئەو چی لە دەس دێ
(نحن قسمنا)ی هێناوتە جێ



(پەلە) بۆ خاوەند تووتوون وەک پەلە
با وجود ئەمساڵ کەوتوونە تەڵە
پار، پارەی زۆریان لە تووتوون دەست کەوت
ئەمساڵ باوکی پار مردو ناوکی کەوت
زەربەی ئینحیسار خستووینیە هاوار
سلفەی زەراعیش بووە بە سەربار
هەر گوڵێ خارێو هەر نۆشێ نێشێ
تەنها من جەرگم گم بۆ ئەوان دێشێ
نامەی زووڕاع وا کزبینم
لە عەداڵەتی دیوان ئەمینم
ئەڵێن: هەر عەقڵێ لە خەسارێ دێ
ئەبێ ڕاوەستن تا بەهاری دێ
هەندێ کە لەگەڵ تووتن خەریک بوون
نەجووولانەوە وا تیا خەریک بوون
ئەرکی زستانیش وا هات بە سەرما
سەرم سڕماوە لە ترسی سەرما
زستانی عەرەب لای فورس ئاگرە
ئێمەیش کەوتووینە یاری ئاگرە
وایان هەڵداوین لە یەک هەڵ ئەدەین
بە پیمان تەزیوە ئەگەر کەوتە بەین
هەڵماندەکێشن لە ڕیشەو لە ڕەگ
ئەبین بە کوتەک بۆ شەڕە گەڕەک



سەرماو گرانی کە پێکەوە هات
لاتیو نەهاتی ڕووی کردە ولات
سالانی پێشوو بۆ ساردی زستان
کورسی و لێفە بوو لە سەر ئاگردان
ئێستا هیچ ماڵێ لیفەی نەماوە
بە ڕاستی بەرگی هەتیو دڕاوە
تەفرەیان دەدایـن شەڕ بڕایەوە
تازە گرانی دێتە کایەوە
هەموو چشتێکمان وەک بەرد گرانە
بۆ قوڕبەسەری هەر قوڕ هەرزانە
دارچیو خەڵووزچی ئەمەیان بەش بێ
داریان تێبڕیو ڕوویشیان ڕەش بێ
تۆوێک بوو پێرار کابرایەک چاندی
هەرچی بۆی ڕێکەوت بۆ خۆی فڕاندی
کورتانی دەججاڵ وا هەڵوەشاوە
جێگای تەقەڵی وەیسکەی نەماوە
بە (محمد)ی مەهدیش چاک نابین
خوا وای خەڵق کردوین ئەبێ هەروا بین
کە ترس‌و پرسی خوامان نەمێنێ
(احتکار) زیاتر پەرە ئەسێنێ
قوڕ بە سەر عەقلی ئەوەی وادەکا
کە خۆی شەرمەندەی لای خوا دەکا



مـەبـەرە حـەلقـەی دوای کـاری دیـوان
دیوانـــەیـــەو پـــەیـــڕەوی دیـــوان
با کـەس‌داریـش بیءو کـاکیش لـە تـەکا
کـە کـەوتیـە تکـا، ئابـــڕووت تکـا
نـویژ لـە پـشت مـەلاو پـلاو لای شـێخان
کە شەڕ کەوتـە نـاو بچۆرە سـەر شاخان
دەستی دۆست ماچ‌کەو لـە زیڕی بگـرە
دەســتی دوژمنـــیش مــاری پــێ بگـــرە
دزو، درۆزن بـــــەدن ئـــــەم دوانـــــە
سەگ لە سـەگ بـەردەو لـە دوور بڕوانـە
ئـەوەی بـەڕاســتءو درۆ سـوێند ئـەخـوا
پێـی بـاوەڕ مـەکـە بـا بشـڵێ بـەخـوا
ئاگــاداریی مـــاڵ بـــە خـــوا مـــەســپێرە
ئـەو دەربـەسـت نیـە بـەرچـاوی تێـرە
ئـەم نـەسیحەتـە بگـرە گـوێ بـەسـتە
ئـەڵێن (خـەربـەستە) خـاوەنـدی ڕەستە
پیـاوی هونـەرمـەنـد کـەساسـە لێـرە
بـــەدو زگ برســـیءو بـــە زگـــێ تێـــرە
لـە بـاران ڕای کـرد بـۆ ژێـر حـەساریێ
کـە چـی بـەسـەریـا ڕووخایـە خـواریێ
ئامۆشـۆی هـەنـدێ بـە سـەرزاریـە
مـــۆخ و ئێـــسقانی پـــڕ مرداریـــە



کە دووبەرەکی کەوتە ناو خێڵێ
خۆشی خۆشی ئەو خێڵە جێ یێڵێ
کە لە گێرەدا گایێک مان بگرێ
گێرەشێوێنە ئەبێ سەربڕێ
کە خوێنێکی پیس کەوتەوە گوپەی
ئەبێ بە نەشتەر ئەو خوێنە دەرکەی
کە پشیلەی ڕاوکەر لە ماڵا نەما
مشک ئەکەوێتە تیلیلیو سەما
کاتێ ستەمکار عەزڵ بوو لێ کەوت
خۆی ئەکوتێتە هەیوانی مزگەوت
کە زانی دیسان ئاشی ئەگەڕێ
بۆ مزەئاشی زۆرتر ئەگەڕێ
قەلادەزەمان ئێستا قەزایە
خەڵک ئەڵێن ئەسما (من السما)یە
باوەڕی پیاوە کۆنەکانمانە
ئەڵێن: (قەندە) ڕووی لە ئاسمانە
هەرکەسە لە سەر ئایینێ ئەڕوا
یەکێ دڵپاکە، یەکێ بێبڕوا
هونەرو ئەرووەت دادی خوایە
هیچ کەسێ نەڵێ بە خۆڕایە
لەو خوارەیش ئەڵێن ئەم چەتوونییە
دوو بەشی لەبەر بێ (تووتوونی)یە



کە ناوی زۆر کەس بە خراپە بەری
ئەوسا پێت ئەڵێن لە عالەم بەری
نەخوازەڵلا بۆ قەوم قیلەی خۆت
ئەبێتە تفی بەرەو بایی بۆت
هەرچی نەتوانی بیلێی رووبەڕوو
مەیلێ، نامەردیت لێ ئەبێ بە خوو
ئەوەی پاش ملە جوێن بە خەڵک ئەدا
پێی ئەڵێن ژنە لە ژێر پەچەدا
خوا بۆیە پیاوی داناوە نێر بێ
دووڕوو، دوودەکە هەرچەندە شێر بێ
کۆلارە ساڵێ نێرەو ساڵێ مێ
بۆیە حورمەتی نییە هیچ دەمێ
هەر شێرە هەڵمەت رووبەڕوو ئەبا
بڕوانە عالەم ناوی چۆن ئەبا
بچۆرە ژێر بارێ کە پێت هەڵگیرێ
پارووی زل مەکە لە بین ئەگیرێ
ئەندازەی هێزی قورگت نەناسی
ڕۆژێ ئەخنکێی بە درکی ماسی
ئێستر کە تۆڕ بوو کەوتە لەقەو گاز
باری قورس ئەکەن لە دەمەو هەوراز
ولاخ بارکێش بێ‌و رێی لێ نەشێوێ
خاوەندی مەنێ جۆی بۆ دەپێوێ



جاران ئەیانگوت عەشرەت هاوارە!
خۆیان گورج ئەکرد پیادەو سوارە
روویان ئەکردە مەڵبەند بە سەر رەو
وەستانیان نەبوو چ رۆژو چ شەو
تێیان هەڵ ئەکرد وەک بچنە شایی
ناویان دەرچووبوو کورد بە ئازایی
ئێستە دەوڵەمەند کەڵکی نەماوە
دەستی بە دەستەی دینار بەستراوە
پیاو دەڵەمەند بوو پەکی ئەکەوێ
پارەدار گیانی خۆی زۆر خۆش دەوێ
زۆریان کەوتوونە دەوڵەت پارێزی
ئەو ئازاییە بووە بە حیزی
نازانن سەلەم لە لێ قەومانا
یەک بە هەزارە لە لای قەومانا
لە تەنگانەدا، بۆ گەل دیناری
زیوو ئاڵتونی لە شوێن ئەباری
درەم وەرگێری بۆت ئەبێ بە مەرد
دینار کە زۆر بو لێت ئەبێ بە دەرد
ئەمرۆ بۆ باران فەرەنجیم بەیتێ
سبەینێ بۆ تۆ ئەبێ بە بەیتێ
ئەوسا نەتدامێو کەوتیە نکەنک
بۆ چیمە لە دوای باران کەپەنەک



خــوا، بــۆ بنیــادی دنیــای بــێ بنیــاد
چوار گـەوهـەری کـرد بـە مایەی ئیجاد

ئـەم چـوارە لـەگـەڵ یـەکتـر نـاگونجێن
خوا خستوونیە یـەک لـە سروشتا جوێن

ئــاگرو هــەوا بــاوکی لای ســەروون
خاک‌و ئـاو پـەستن دایکـی بـێ دەروون

شــەیتــان لــە ئاگردروســت کرابــوو
بۆیــە پیــشەی ئــەو شــەڕو هــەرا بــوو

ئـادەم لـە خـاک بـوو لـە قـینی شـەیتـان
خوا فریـشتەی نـارد بـۆ کـڕنووش کێـشان

شــەیتــان وتی مــن قــەدری نــاگرم
ئــەو قــوڕە ڕەشــەو مــن لــە ئــاگرم

چونکــو بــایی بــوو تفــی لــێ کــرا
لــەو شــوێنە بــەرزە بــە شــەق دەرکــرا

ئـەمـە دەرسـێکە بـۆ نـەوعـی بـە شـەر
پیاو کـە بـەرز فـڕێ بۆی ئـەبـێ بـە شـەڕ

سـەرەتـات خاکـەو دوارۆژیـست خـاک
کـەواتـە خـاک بـە، بـە دڵـێکی پـاک

خاک بە، کە دەنکێ جۆیان تێ چـەنـدی
بیانــــدەرەوە بــــە دە ئــــەوەنــــدی

وەک ئـاگر مـەبـە هـەرچیـت هاتـە پێش
وای بــــسووتێنی بێتــــە خۆڵــــەمــــێش



شەیتان لای ڕاستو نەفسیش لە لای چەپ
بۆ مەشکە ژەنێ بوون بە لورە لەپ
بە گوژمەی مەشکە بژەن نەژایە
ها بڕۆ بۆ بابەو ها بڕۆ بۆ دایە
ئەو ڕای دەکێشێو ئەم ڕای ئەکێشێ
تا دوایی مەشکە هەڵدەتلیشێ
بە جارێ هەرچی تیایە دەڕژێ
پڕیشکی بە سەر خەڵکا ئەپڕژێ
بەم ڕەنگە بە دەست نەوسو هەواوە
ئەشەکێنەوە بەم لاو بەولاوە
یا خود هەروەک مێش شەیدای هەنگوینە
پێی تێ ئەگیرێو هەر لای شیرینە
خۆ ئێستا شکور پێی پیاو ناگرێ
(بایع) بە کوردی گوردی لێ ئەگرێ
(بایع) لە (بیع)ەو بەیع وەرگیراوە
پەردە بە دەورەی (عیب)دا گیراوە
شەوگەردی لە توێی ڕۆژی ڕووناکا
کوردی دز نەدیو پف لە دز ناکا
ئەیان گوت خەیات پارچەی دزیوە
بووە بە بەیداخ لە خەوی دیوە
خەیاتو بایع وا بە یاللی
هەم حاجی بابا هەم ترەللی



ولاخـــی ڕەســـەن نـــاو قـــەد باریکـــە
تەنگە ئەستوور بوو بیگرەو باری کە

ســەر بــە ولاخــی ڕەســەن ئـەســپێرن
بــەلام بــە گولــە بــارگیر نــاوێژن

پیاو گیا لە بەهەشت بۆ بارگیر بێنێ
ئەو دەبێ جووتەی خۆی بوەشێنێ

بەدخوو بە چاکەی چاکان چاک نابێ
خــوا وای کــردووە هــەردەبــێ وابــێ

لــە ولاخــی بــەرزە ئــەگــەر بیــشگلێی
جێ‌یێکت دەشکێ بێگومان جارێ

ناکـــەس تـــەربیـــەشـــی بدرێتـــەوە
چـــیتی بـــەقـــەمـــە زوو ئـــەچێتـــەوە

چاک هەر ئەوەیە خۆتیان لێ لادەی
نەک ڕەنجی خۆتیان لەگەڵ بە بادەی

لــە چاوی پیسیش پــەنامان بـە خــوا
چاوی بــە هــەرچــی هــەڵێنا ئــەڕوا

هەر پاشای بابان لە حەقیان ئەهات
بەوانەی ئەگوت دەرچن لە ولات

بهاتنایـــەوە لـــە بـــەر گلۆڵـــی
ئـەوسایە چاویان زوو هـەڵـدەکۆڵـی



وا دیسان خومی جولەکە شێوا
درۆ باڵ ئەگریۆ ئەفڕێ بە کێوا
ئەڵێن خوا باڵی داوە بە حوشتر
کۆشک و سەرای کەس نامێنێ ئیتر
دڵخۆشییەکە بۆ بێ خانومان
ئەڵێن: ئۆخەی گشت بە بێ خانوومان
خواستی خواییە ئەوی بەدکارە
زۆریان لە لاوە دێتە ئەم شارە
هەندێ لە پێستی مەڕا وەک گورگە
هەندێکی تریش سپلی لاورگە
هەندێ وەک مووی لوت لێت نابێتەوە
هەندێ سنگ هەڵکیش نابەسرێتەوە
بۆیە سەرچاوەی (تانجەرۆ) لێڵە
هەرچی خۆی تیا شنت کولک و کەمێلە
خۆزگە وەک جاران گازرکەر ئەبوو
بە (شیاکە) و بە لیس پیسی دەرئەچوو
ئێستا (بانقنوت) کەوای شیرداخە
بۆ هەموو لەشی (گول) بە پەرداخە
بە کوردی ئەولا (ڕیژو) خەڵووزە
موعامماییکە ئازای وەیدۆزە
نامەوێ بڵێن کورد بە هیچ نابێ
ڕۆڵەی ئازادە ئەوی ئازا بێ



زســتان زەیــستان چلــەی لــە بــارچوو
ســەریــان دەرهێنــا کــەنگــرو کــاردوو
خـــاتو زەمهـــەریـــر ئـــەیلاوانـــدهوە
پـرچو ئـەگریجـەی خـۆی ڕووتانـدەوە
وا بـە تـەقـەتـەق لـەقلـەق هاتـەوە
مـــاری مـــەرەزە پـــاک ئـــەکاتـــەوە
بـــە ئـــەســـاتیری کـــۆنی یۆنـــانی
(ژوپیتـــەر)ێ بـــوو خـــوای ئاسمـــانی
(وینۆس) ئالیهەی حوسنو جەماڵ بوو
بـەلام (ژوبیتـەر) زۆر بـەدفـەساڵ بـوو
بۆقی گویی جۆگە وەڕست بوون لە دار
وتیـان گیانـدارمان بـۆ بکـە بـە سـەردار
ئـەویش لـەقلەقی نارد وای ئـەخوری
هـەرچـی ئـەیقیرانـد قیـرەی ئـەبـڕی
ئـەترسم ئێمـەیش بە حـەلـەق مـەلـەق
بکـــەوینـــە بـــەر دەنـــدۆکی لـــەقلـــەق
بـــەلام ناترســـم خواســـتی خـــوا وابـــوو
ئـەمـساڵ دوو لـەقلـەی باڵـیان شـکابوو
لــەبــەر ســەرادا ئــەگــەڕان کــز کــز
تەمێ خـواردو بـوون لـە دەنـدوکـو گـز



زستانمان ڕۆیی نۆرەی سێ شەشە
لە بەهاریشدا چەرخ بەگەردشە
شەش ڕۆژبارانو شەشی تر بایە
گوایە شەش ڕۆژی خۆشی تێدایە
نموونەی چەرخی دەوران بەهارە
هەمیشە بەهار زۆرە لەم شارە
ئێمە بەهارمان بۆیە خۆش ئەوێ
ڕەنگی یەکڕەنگیی تیا دەرناکەوێ
ئەگەر بزانین پشتی یەک ئەگرین
بۆچ تێمان ڕۆدێن، ئێمەیش بۆچ ئەگرین
ئەمە نەریتی دەرەبەگییە
ماڵمان لە باخی پورە بەگییە
ئێستایش پەیجۆری شەڕەگەڕەکم
پێم خۆشە خۆشەی دارو کوتەکم
لەشم بە کوتەک وا ڕاهاتووە
دیاری بەهەشتە بۆ من هاتووە
نالی (ولی)یە ڕاست بەم وتنە
کە دەڵێ تووتن خەرجی سووتنە
لە پاش هەشتا ساڵ ئەوا هاتە دی
پار خێل بووین خۆمان بەدوانە ئەدی
لە دوای شیرینی تاڵی زۆر تاڵە
مەترسن ئاخری خێرە ئەم حاڵە



لە پرێ کە خۆی بە کوڕێ زانی
تێگەیشت هۆشی چۆتە میوانی
خۆ خوا ئەیتوانی بە (کن فیکون)
بیخاتە سەر یەک بارەگای گەردوون
بۆ چاولێ‌کەری هەفتەی پێ خایاند
ئەمە پەندێکە بە ئێمەی نواند
عەقلی تەجرەبە ڕاستە سەرناکا
بێ بەراوردە کە سەر دەرناکا
هەرچی کە هەڵساو کەوتە سیاسەت
تەماشا دەکەی بوو بە سیاسەت
جووجەڵە سەری لە هێلکە جووقا
تویکڵ کون دەکا لە ژێر دەندووکا
خوا ویستی جیهان بڕژێ بەیەکدا
لە پێش‌دا سەلم و تووری تێک بەردا
غیرەتی میللی ئەمەندە پاکە
پیاو لە کوشتن و بڕین بێ باکە
کەسم نەدیوە وەک کورد ئازا بێ
لە ڕێی مەشرووعا هێند بێ‌پەروا بێ
بەڵام ئەوانەی ئەبنە پێشەوا
قوماشی گیانیان ئەکەن بە کەوا
ئەگەر ڕاست ئەکەن خۆیان تێ هەڵچن
نەک ئەوان تووش‌کەن سووکێ بۆی دەرچن



ئـەو کـەسـەی ژیـنی کـوردیم ناناسـێ
قـورگی ئـەگوشـم هـەتـا ئـەتاشـێ

تـەنـافی ئـەسـتۆم تونـدتر ڕاکێـشە
هـەتـا دەپچـڕێ بـەگێـەو کێـشە

گوریـسی هێنـد تونـد ڕاکێـشا پچـڕا
کـەوتو تـەتـەڵـەی سمـتی وەرگـەڕا

بـەڵان ئـەو سمـتی بـە شـەق خـاراوە
پێـستی ئـەسـتوورە ڕەش هـەڵـگەڕاوە

نـازانم بـەخـتی کـورد بـۆچ وا ڕەشـە
لـە مووچـەی ڕەش‌و سـپی بـێ بـەشـە

لیـسی کوێریمـان لـێ کـەوتۆتـە نـاو
کـەس ناپـارێزێ، ئـەشـکێ سـەرو چـاو

ناچـارین ئێمـەیـش لـە ڕاسـتی کـوێران
بـۆ پارێزگـاری دەسـت بـەینـە گۆچـان

چاومـان لـەوەبـو کـە کوێخـای خێـڵێ
سـەگ دەرکـاو نـووزەی نـازی نـەیـڵێ

کە چی وا حۆل بوو زەق زەق ئەیرِاوانی
لـە چـەنـدو چـوونی ئێمـەی نـەزانی

خوا یـار بێ ئێمـە ئـەحمـەدی سوارەیـن
خـاوەن (قـەدارە) و سـاحیب نـەقـارەیـن

سـا، مـێم بـۆ بێـنن بـڕوانن نێـرم
ئـەو نێـرە پـیرەم بـە مێچکـە فێـرم



گـوێم شـل کردبـوو چـاوم ئـەیـڕوانی
بـــۆ دەنـــگو باســـی ڕازی دیـــوانی
هـەر کـەس بـە ڕەنگـێ لـە جیهـان ئـەدرا
ئەیانگوت ڕێکێو ئاشتی دوای شەڕ کـوا
ئـەڵـەمـان چـاوی لـە بـەشـی زۆر بـوو
بـە زۆر بـوو، بۆیـە بـە شـەڕو شـۆڕ بـوو
سوێندخواران هـاتن بـەرهـەڵستیان کـرد
بـە هـەر ڕەنگـێ بـوو وا لـە ناویـان بـرد
هەموو بەرودوا ئەیانگوت بەیـن بـەیـن
بـۆ ئاسایـشی جیهـان شـەڕ دەکـەیـن
واتـەیێکـی جـوان کـەوتبـوە سـەردەم
چەنـد هیـوادار بـووین بۆ سیلمی عالـەم
منیش جـار بـە جـار پێـی پیدەکـەنیم
ئـەمگـوت درۆیـە بـەو هیوایـە نـیم
چونکـو ئـەوڕۆژەی خـوا دنیـای دانـا
ئـەم ناکۆکییـەی دانـا لـە بـەینـا
خوا کە ئادەمی لە بەهەشت دەرکـرد
فـەرمـووی دوژمـن بـن بـە درشـتو ورد
قابیـل و هابیـل لـە سـەرەتـاوە
ئـەم کوشـتنەیـان خـستە دنیـاوە
هـەروا ڕۆییـوە هـەروەخـاش ئـەڕوا
بـە سـیلمی عالـەم چـۆن بکـەم بـڕوا



خــوا دوازدە کــەلــووی خــستە ئاسمــان
کــە ڕۆژ بــەوێدا بــڕوا بــە ئاســان
ئــەم دوازدە کــەلــوە حیــسابی ساڵــە
بــەو حیــسابەیــە وا ڕۆژ عــەوداڵــە!
ئــەم (بــاوەخولــێ)و بازبازێنــێ ئــەو
چــاو شــارکێی ڕۆژوو خۆنوانــدنی شــەو
یاریــەکــی چــەرخــە (بــایی، بــایی)یــە
(عــــدد الـــسنین و الحـــساب)ی یـــە
ســـوورەی یوســـنە ئایـــەی پێنجـــەمـــین
(لتعلمــــــون بـــــــلاغ مـــــــبین)
سەری ساڵ جێگەی ڕۆژ کەلووی بەرخە
ئــەگــەر ئــەتــوانی ڕۆژێکــی بــەر خــە
هــەروەک دوانــزە مانــگ ساڵــێکی نــاوە
بــەدوازدە ساڵـــیش دەوێــک تـــەواوە
بــە حیــسابی تــورکی ســاڵ نــاو نــراوە
بــۆ ئــەم ســاڵ نــاوی ســەگ دانــراوە
گەردشــی ئەم ساڵ لــە خــووی سەگایــە
بـــڕوانین کێمـــان بـــۆ دێتـــە کایـــە
پــێلاو وەرگێــڕن نامــەرد ســەگ لــوورە
هــەوری ســورەو ڕووی لــە شــارەزوورە
ڕاستە، خــوا، شــەڕی بــۆ ســەگ دانــاوە
ئــەم نــاوە، گــەری، دوور بــێ لــەم نــاوە



زولفی پەریشان بۆ یار پەسندە
داوی دلانەو بۆ مل کەمەندە
پەریشانییەکەی بەختی کوردانە
کەس ڕاناکێشێ‌و خۆی سەرگەردانە
مووی زەنگی یەکن لە بتیاتەوە
شانەیش ناتوانێ لێکیان کاتەوە
خۆزگە وەک تووکی قولەڕەش ئەبووین
دەئالاینە یەک هیچ تێک نەدەچوون
شۆخ‌و شەنگیی یار بە دەمی تەنگە
دەمی فراوان بۆ جەمال نەنگە
بەش‌و نسیبی کورد دەمی یارە
ئەمەندە تەنگە دەم بە هاوارە
ئاسمان ملی دانەواندووە
کورد دانانەوێ بۆیە ماندووە
لێی گەڕێ توخوا با هەر سەربەرز بێ
نەنگە بۆ گیانی بە ترس‌و لەرز بێ
لە ڕێی میللەتدا مردن مەردییە
مردن مردنە لینگەفڕێ چییە
ئازادە سەری کەوتە کلێشە
بێستوونی ستەم ئەبڕین بە تێشە
بەلام داخەکەم ئێمە فەرهادین
بە تەقرەی شیرین وا ڕەنج بە بادین



بێتــو بــۆ کــاری جیهــان تێکۆشــی
ئــەبــێ بچیــە ســەر ڕێــی فــەرامۆشــی
ئــەگینــە مــردن وا لــە پــێش چــاوە
ژیــانی بــە تــرس تــامی نــەمــاوە
ئــەگــەر خــوا نیــسیان نــەدا بــە ئینــسان
کــێ تێــدەکۆشــێ بــۆ چــوار ڕۆژ ژیــان
بــەلام کــێ هــەروا مــەرگــی لــە بــیرە
ئــەم دونیــای دوونــە بــەوە ڕاگــیرە
هــەیــە موحتــاجو پــیرو نــەخۆشــە
بــەو ڕەنگــەیــش هێــشتا مــانی لا خۆشــە
هــەتــا لێــوی گــۆڕ دنیامــان ئــەوێ
پێغەمبەر فــەرمووی کــەس تیــا ناسرەوێ
لــەگــەڵ یــەکێــکــدا ئــەمرۆ دووبــەدوون
چاوتان لە یــەکــە لــەگــەڵ یــەک ئــەدوون
کــە لــە یــەک بــڕان خــەوە یــا خــەیــاڵ
لــە پــڕ ئاشــەوان ئــەڵــێ ئــاش بــە تــاڵ
ئــەمانــە لــە بــیر خــۆت ئــەبــەیتــەوە
بــە خــەیــاڵ عــومرت نــوێ ئــەکــەیتــەوە
هــەتــا پــیر ئــەبی زۆرتــر شــێت گــیری
بــە دەســت نــەفــسەوە دیــلو ئــەسیری
بــە دەســت تــۆ نیــە سروشــتت وایــە
بــۆ بــەقــای جیهــان مــەبــەستی خوایــە



یـــاران هـــاوارە دز ئـــەمفرۆشـــێ
خـۆم ئـەڵـێم نێـرم ئـەو هـەر ئـەمدۆشـێ
کـەوتووینـە دەورێ دزیـی هێنـد بـاوە
کـەسـێ پێـی بـڵێی ڕاسـتە نـەمـاوە
مێـــویکم هـــەیـــە تریـــی پـــایزە
کـە خـۆم ناشـتوومەو لـە لام ئـازیزە
هـەرچـی ئـاو بـەرە سـەری تـێ دەکـا
بـە بـەرسـیلەیـی کۆشـی پـڕ دەکـا
وا وتمـان ئاوبـەر (بێـزوو)ی پـێ دەکـا
پیـاوی مالـی بـۆچ پـەلـەی لـێ دەکـا؟
هـــەرچـــی دێتـــە لام فێـــری دزییـــە
تـــا ســـەر بـــاوەڕی مانـــەوەی نییـــە
ئـــەڵـــێ: نـــامێتم ئـــەو بـــێ بـــە تـــرێ
دوای من ئەوی دێت گوردی لێ ئەگرێ
بـــەو خـــەیاڵـــەوە ناترســـێ لـــە خـــوا
نـاوەسـتێ حـەڵـوای بـەرسـیلە بخـوا
دەورێکـە ئـەمڕۆ هـەرچـی کـەوتـە کـار
دەســـتەو دائـــیرەی ئـــەخاتـــە بـــازاڕ
لـەگـەڵ ئـەو گـۆڕا گـشتیان بـە جـارێ
وەک هەرمێی کرمێ ئەکەونە خوارێ
هیـــوای وەزیفـــە لای کـــەس نـــەمـــاوە
بۆیـــە پێـــشدەســـتی ئـــەمـــەنـــدە بـــاوە



بیستوومەو ڕاستە شەخسێکی گەورە
کە یەکە پیاوە ئەمڕۆ لەم دەورە
بە تایبەتی چەپەوانەیە
بۆ کونی بەرتیل تۆپەوانەیە
بە چەپ ئەنووسێ‌و مەرج ئەباتەوە
خەریکە چەرخی چەپ ڕاست کاتەوە
دەستی چەپ هێزی لە ڕاست زۆرترە
چشتێکی تری لا پێویستترە
ئەڵێن: کاتێ مار چووە کونەوە
کە کلکی دیار بوو ئەیدۆزنەوە
کە بە دەستی چەپ کلکی ڕاکیشی
لە دووی دەستت دێ بە نەرمی و خۆشی
خۆ بە دەستی ڕاست تەکانت دایە
کلکی ئەپچڕێ‌و سەلکی دەرنایە
ماری وای تیایە پارتی ئەم دەورە
بێ ئیجازهیە بە پێچ‌و دەورە
بە ڕاست بە چەپ کلکی ناگیرێ
بە هێزی کلکی (ئێسک) تێی ناگیرێ
وا کورە شێخێک کەوتە ئەوناوە
باوکی لە مارو هار نەترساوە
هیوامان بەوە غیرەت بکێشێ
کەلکی گەل بگرێ‌و زەرگێک ڕاکێشێ



میــوەگــەنانــە چاوێــشە لــە نــاو
خۆت زۆر مەخەرە بەر تیشکی هەتاوە

هـەتـاو کـە زسـتان نـاوی خۆشـییە
هـاوین (سـەبـوونی) بـۆ نـەخۆشییە

بۆ کور ئەچوونە سەر بابەگوڕ گوڕ
گڕ گڕ وەرگەڕا لێمان بوو بە گڕ

ئـەمـساڵ لافـاوی ئـاو شـاری ئـەبـرد
ئـاوی زینـدەگـیی ئێمـە وەشـکی کـرد

پیـشەی گـەردشـی ئاسمـانی شـینە
لـە لایـێ شـایی لـە شـوێنێ شـینە

دنیـا لـە خولـقی پـشیلەدایـە
بـە مێچکـە مێچکـە لـە بـاوەشـتایە

کە ویستت نەختێ بۆت پێ بکەنێ
لە پڕ بە چڕنووک دەست ئەڕنێ

سـەگ لـە پـشیلە بـەوەفـاترە
پـشیلە دەرکـەو گـەمـاڵ ڕاگـرە

گەنم گران بوو لەبەر کەم نانی
زۆر کەس دەستی کرد بە ورچەوانی

دونیـا وەک ڕێـوی بـە فڕوفێـلە
هەرکەسە لە دووی کاری خۆی وێڵە

ئێمەیش وەک کەروێشک ڕۆژ نووستوو و کاسین
تا دیاردی نەکەن لە خەو هەڵناسین



بـــو دەســـتەڵاتی ئـــەم بنیـــادەمـــە
هـەرچـی بـۆ دانێـت هێشتا هـەر کـەمـە
بـە ئـاگر سـەهـۆڵ دێنێتـە مـەیـدان
برووسکەی کـردوە بـە پـەیکی جیهـان
لـەوپـەڕی دنیـا واتـەیێـک ئـەکـرێ
لەمپەڕی دنیا خەڵک گوێی لێ دەگرێ
گـــاە ســـلێمانن لـــە ڕوی هـــەوادا
گاهـــێ یۆنـــسن لـــە نـــاو دەریـــادا
تـا زیـاتر عـیلمو فـەن بـێ بـە ئاکـار
بـۆ قـەڵا چـۆی یـەک ئـەیهێننـە کـار
قونبولـــەی زەڕییـــە مـــاوە دەرکـــەوێ
کـەی بـێ شـارێکیتـری بـەرکـەوێ
هێـشتا تێـر نـەبـوون لـە یـەکترکوشـتن
تـازە دۆسـت لـە یـەک ئـەبن بـە دوژمـن
بـــا بـــڵێن ئـــەوان وا دەوڵـــەتـــێکن
خاوهنـــدی ســـوپاو بـــە ســـەروتـــێکن
نـــازانین ئێـــرە چـــی لـــێ قـــەومـــاوە
هیچ کەسێ لـە سـەر ڕێـی خـۆی نـەماوە
لاپایتـــەختـــا ئـــەحزابـــەو ئیـــزراب
لایـــی ئۆپـــەراو لـــە لایـــی ڕوبـــاب
هـــەر ئیعـــتیرازەو تـــەنقیـــدەو تـــوانج
نـاوەسـتن نانـێ بـرژێ لـە سـەر سـاج

ئەیانگوت جاران بۆ ماران گەستووە
تریاک لە عێرایق بۆ شاران ئەچوو
ئێستا ئەمەندەی مار تێ خزاوە
تریاکی ماران تۆوی بڕاوە
بەلام تریاکی کێشان بێ کێشان
کە بە دوکەڵی زۆر کەڵی پیشان
زۆر کەس سەرمەستی بەنگە دەبەنگە
فەقیرو هەژار تیاچوو بەم ڕەنگە
بەلام بۆ ئێمە دەور گۆڕاوە
ناوی سووکیمان لە سەر نەماوە
خورمایێکیان بوو وشکی مشک مژە
کە پێیان ئەگوت: خورمای کوردەکوژە
ئێستا کوردکوژە بووە بە زوهدی
برایەتیەکمان بۆ هاتۆتە دی
بەلام کورد هێندە خورمای خۆش ئەوێ
لە هەر شوێنی بێ شوێنی ئەکەوێ
تەرسی کەرەکەی جەجاڵ خورمایە
بۆیە ئەمەندە کوردی لە دوایە
گەزۆ بە قەومی مووسا دراوە
ئێستا لەم خاکە بۆ ئێمە ماوە
گەزۆو دۆشاوو خورمامان هەیە
نالەی دەم تالی ئیتر تا کەیە



زانایـــان ئـــەڵـــێن کـــە ئـــەم جیهانـــە
شـــوێنی یـــەک کوشـــتنی زینـــدەوەرانـــە
هـــەروا بڕوانـــە هـــەرچـــی گیانـــدارە
بـــەســـەر خـــوار خۆیـــا زاڵـــەو زۆردارە
پشیلەی بۆ مشک تانجی بۆ کەروێشک
گورگ بۆ بزنو مەڕ بۆ کەری بێ مێشک
جگـــە لـــە مانـــەیـــش لـــە نـــاو خۆیانـــا
ســـەگو بـــەرانو بـــارگیر شـــەڕیانـــە
بـــەڵام هـــیچ کامیـــان وەک ئـــادەمیـــزاد
خـــەرمـــانی گیـــانی یـــەک نـــادەن بـــە بـــاد
جـــاران بـــە شـــیرو تـــیر کـــەم ئـــەکـــوژرا
ئێـــستا بـــە بۆمبـــا لـــەش کـــەوتـــە ســـەحـــرا
بـــە گونـــاهی خـــۆی ئـــادەم دەرکـــرا
مـــیراتی شـــەڕی بـــە ئێمـــە بـــڕا
لایێـــک خـــوا فـــەرمـــووی (ولا تـــذروا)
لایێکـــیش (بعـــض لـــبعض عـــدو)
هـــەمـــوو تـــیرەیێـــک بوونـــە بـــرای یـــەک
لـــە نـــاو ئێمـــەدا مـــاوە شـــەڕەســـەگ
دەســـتی سیاســـەت تێکمـــان بـــەرئـــەدا
وەک پـــەڵ ئـــەمانـــدا بـــە کـــەڵلەی یـــەکدا
خوایـــە کۆنـــەکـــان ئـــەگـــەر بکـــوژی
ئـــەوســـا ئـــەتـــوانم بـــڵێم کـــورد ئـــەژی



سێ کوچکەی کوانووی دەولەت‌و نەرمی
ئەشێ یەکسان بێ بۆ بەرزو نزمی
کە پێچکەیێکی کورت بێ ئەمووستێ
مەنجەڵ لە سەری ڕاست ڕاناوەستێ
بەهەر لایێکدا چەوت بێ ئەڕژێ
چێشتەکەی بە سەر زەویا ئەپرژێ
دامەزراندنی دەوڵەتیش وایە
تێکڕا موساوات ئەیخاتە کایە
ئەمەوێ بڵێم نابێ کورد کورت بێ
ئەبێ بۆ خزمەت پێشکەوتوو و گورد بێ
ئەبێ پێک بیرێن نەوەک لێک بیرێن
چونکوو بۆ غایەی ژین لە سەر یەک ڕێن
ئەگەر بێ‌و پاشقول لەیەکتر بنێین
لە ڕێگەی ڕاستا هەردوو هەڵئەنگوێین
چەند خۆشە دوو دەست بەهێز تێکۆشێ
گوزەرانی خۆی بەزۆر ڕاکێشێ
لە نەبوونیە ئەم گروگاڵە
ئەڵێن تەبەقی پڕ ئاشتیماڵە
ئەوی هەیەتی بەرچاوی تێرە
لە ئازایی‌دا نموونەی شێرە
لوی بە دراو وەک (بابەعەلی)
ئیشی وا ئەکا پێی ئەڵێن: وەلی



کە خوا بیەوێ یەکێ بکا بە پیاو
ڕێکەوتی ئەوتۆی بۆ ئەخاتە ناو
زۆر بە ئاسانی پێی سەردەکەوێ
بەختی دوژمنی لە ڕاست ئەخەوێ
دوو زۆردار ئەچن بەگژ یەکترا
لە هەردوو لاوە ئەبێ بە هەرا
یەکێ لاولاوە کە تێدەفکرێ
ئەوەیان چاکە لای ئەو دەگرێ
خوایش دیارە پشتی چاکان بەرنادا
بەدکار دەخنکێ زوو دێ بە لادا
کە بەدکار کەوت‌و پیاوی چاک سەرکەوت
یاریدەدەری پاداشی بەرکەوت
ئەڵێ کاکە تۆ کە یاریدەت دام
ئیتر چاودێری تۆ فەرزە لە لام
کەواتە ئیتر سەربەست ڕابوێرە
بۆ بێگاری کەس مەچوورە گیرە
باری بێگاری جدەوی کردی
دارو فەلاقە لە ناوی بردی
بە دیموقراتی ڕو بکەرە هاتی
خزمەتت زۆر بێ بۆ خۆولاتی
بیرت بێ زولمت چەند پێ گران بوو
قەومت بە ستەم چەند ناتەوان بوو



گەورە ئاوی ڕشت بچووک پێی لێ خست
بە بیانوو پەتیان بۆ بچووک هەڵخست
دەستەی هەمەوەند ئەچوون بۆ تالان
شوێنیان ئەکەوتن خوێڕی و منداڵان
ئەوان دەردەچوون تالانیان ئەبرد
دوای ئەوان ژن و منداڵیان ئەگرت
بانق هاوار ئەکا پارە لای منە
بۆچ ئەگەڕێن لەم کون و قوژبە
تانەی هاوچەشمی لە سەر چاواتانە
پێی نابینن ئەم کوشک و هەیوانە
دزی ملیۆنەر پێی سەرئەفرازە
بۆ ئانە دزە ئەم شەق و گازە
هەندێ لەوانەی کە پاس ئەدێرن
بە کەر ناوێرن بە کورتان شێرن
دەردی گرانمان (پارتیزانی)یە
ئەم دووبەرەکییە لە نەزانییە
غەرەزی شەخسی بێ ئینسافییە
ڕەش هەر ڕەش پیشەی کۆنی جافییە
تا بۆ وەزیفە پیاو هەڵئەبژێری
دڵنیاییشی باش پێ نەسپێری
کەس لە وەزیفەی خۆی ئەمین نابێ
ئێستانیش ئەبێ هەر بەڕەڵدا بێ



جەژنێکمان ڕۆیی جەژنێکمان ماوە
هەر لای خوا ماوە ماوەی بێ ماوە
هیوامان هەیە هیوای بە خوایە
(من یتوکل، حسبی)ی لە دوایە
ئەرکی گرانیو گەرمای ڕەمەزان
ئەمانخاتە ناو فێنکی ناوجەژنان
چەند خۆشە لە پاش تاڵی شیرینی
لە شوێن ترسی شەڕ موژدەی ئەمینی
دەولەت پارێزی تا لە بەینا بێ
باوەڕم کردوەە ئیتر شەڕ نابێ
لە ڕووی زەمیندا (موالید) سیانە
دەوڵەتیش سیانە هەر سێ سێیانە
ئەوی بیەوێ سەری نەیێشێ
بەشێ هەڵگرێو دوانی ببەخشێ
پارووی زل گەرووی تەنگ ئەدڕێنێ
زۆریشی لێ بکەی پیاو ئەخنکێنێ
تەماع کەمیش بێ زیانی زۆرە
دەستووری ئاشە باراش بە نۆرە
لە زوو ئێمەوە باراشیان لێ کرد
ئاشیان ئەگەڕێ لە سەر خۆ ورد ورد
ئەو هیوایەمان خوا لێ ئەسێنێ
بۆنی خەپلەیان ئێمەیش ئەژێنێ



ئـەم بـەنیـادەمـە هێنـد دەمدەمییـە
ئـاوی زینـدەگـی لـە نـاو دەمییـە
کاتێ کە کەوتە سەر کورسیی مەسنەد
ئـەڵـێ وا چـەسـپیم هـەتـاکو ئـەبـەد
خـۆی بـەڕەنگێکـی‌وا، لـێ ئـەگـۆڕێ
لای وایـە، هـەرگیـز ناچێتـە گـۆڕێ
بـەو هـەوایـەوە تـا لـەو بانـەیـە
دەبـەنگـی بـەنگـی بـانووی بانـەیـە
گونـای کـەس نیـە لای خـودا خواستـە
(ان الانـسان لیطغـی) ڕاستـە
ئاگـای لـە چـەرخـی کـەچڕەفتـار نیـە
نازانـێ دنیـا پایـەدار نیـە
لـە پـڕ ئـەبینـێ لـە پێنجوینـەوە
بومـەلـەرزەیـی هـات بـەقینـەوە
بـانیژەی خولیـای رووخانـد بـە جـارێ
لـەو بانـە بـەرزە زرم کـەوتـە خـوارێ
شـیری حوشـتری سالـحی ڕژا
پریـشکی میـزی میـزی لـێ پـڕژا
هـەزار جـار واتـەی وا بێـژراوە
دەردی خـەرۆیـی وا چێـژراوە
نیـسیانی ئینـسان ئـەمـەنـدە زاڵـە
لـە ڕاستـی تـەمـاع زۆر کـەس منداڵـە



ئەیلوول هات گوڵزار ناوی لوولو مەلـوول
گــەڵارێزانــەو تــۆزو گــەردەڵــوول

داخــم ئــەو داخــە درەخــتی بــێبــەر
گــەڵای نــاوەڕێو وا ئــەیباتــە ســەر

ئــەوانــەی کــەوا بــەرمــان بـۆ ئـەگـرن
زسـتانیان لـێ هـات لـە سـەرما ئـەمـرن

ئای وەیشوومەی شووم چەنـد بێ بـاکی
گیاو گـوڵ ئەمرێنـێو پێـی فـەرەحنـاکی

لایێــک فــەرتــەنــەی هــەوایــی هــەوا
لایـێ سـەر زەمـین وا پیـاو، پیـاو ئـەخـوا

جاران هەر زەنگیـی باربـار پیـاوخۆر بـوو
ئێـستا مـەدەنـیش فێربـوون، وا زۆر بـوو

ئـەوان زۆردارن بـا بـڵێن گـەڕ ئـەکـەن
بـۆ موسـتەعمـەرەی زۆرتـر شـەر ئـەکـەن

ئـەی ئێمـە بـۆچی وا تێـک هـەڵـەچـین
بە بێ شیر، وەک شێر لـە پڕ هـەڵـەچین

لـەبـاتی ئـەوەی دەسـتی یـەک بگـرین
لـە بارەگـای خـوا تێـر بـۆ یـەک بگـرین

جامیعــەیێــک بــین تێکــڕا عیراقــی
قــەومێکــی ڕاقــی نــەوەک فیراقــی

بــەڵــکوو پێکــەوە بــە خۆشــی بــژین
بــە دووبــەرەکـی بـۆچ بکــەوینـە قـین



جاران تەناف‌باز لە ئێران ئەهات
بە سەر تەنافا ئەکەوتە تەرات
لە ژێردا پیاوێ بوو کوڵەبنە
ئەو ئەیگوت: هونەر هونەری منە
ناویان لێ نابوو (فس فس پاڵەوان)
یەکی نەدەکەوت بەدەم و زوبان
(فس فس پاڵەوان) تەنیا یەکێ بوو
ئێستا لە شوێن ئەو سێو چوارێ دەرچوو
بە فەندو فێلی فەننی وا فێرن
بە شوێنی بەرزا «جۆ» هەڵدەگێرن
زەمانی عیساو پێغەمبەری جوو
درۆیان ئەکرد روویان ڕەش ئەبوو
ئەم زەمانە ڕاست رووی پیاو ڕەش ئەکا
پیاوەتی پیاوی پیاو بێ بەش ئەکا
بەدکردەوەیی ئەوەندە باوە
خۆمیشی تیابم ڕاستگۆ نەماوە
زۆریشمان ماوە بۆ دەوری مەهدی
ئاواتی پیاوی ڕاستگۆ بێتەدی
کە (محمد) هیچ بەمانە ناکا
مەهدی ئەمانە چۆن ئیسلاح ئەکا
خواستی خوایە ئەم دەروو دووکانە
ئەفراسیاو خراپ کاوس بەهانە



ئێمە کـردەوەی بـاوو باپیرمـان
شـیروەشـێنیەو ئـازایی‌و مـەیـدان
ئـەڵـێن شـیری دا لـە تـەوقـی سـەری
دایـدڕی هـەتـا بـەنـدی کـەمـەری
بـە پاڵـەوانی ناویـان دەردەکـرد
هـەرچـی ئـەیبینی سوجدەی بـۆ دەبـرد
کوشـتن ئـازایی‌و ڕاوو ڕووت هونـەر
بـەم ڕەنگـە زۆری بـۆ دەچـووەسـەر
جـەردەیـی غـەزوە، جـەریمـە حـەلاڵ
تێکـڕا هاوبەش بـوون دزو خـاوەنـد مـاڵ
سـەرمایـەو سـەروەت ڕم‌و ئـەسپێ بـوو
لـە چـڵکا لـەشیان پـڕ لـە ئـەسپێ بـوو
خزمـەتکاریـان بـە فـەخـر ئـەزانی
تاڵانیـان بـۆ لای ئاغـا ئـەهـانی
ئاغـایش لـە هیچـە ئابـڕووی ئـەبـردن
لـە تـەویلـەدا حـەپـسی ئـەکـردن
ئـەپاڕانـەوە لای خـوا بـە شـکات
ئەیانگوت خوایە چیمان بەسەر هات
دەنگی غەیب ئەیگوت هەی وا لێ کراوە
خۆتـان یاریـدەی زۆردارتـان داوە
هـەرچـی کـە پشتی زۆرداری ئـەگـرێ
خـوا زۆری ئـەوی بـەسـەرا ئـەبـڕێ



دنیـــا هـــەر ڕۆژە لـــە ســـەر ڕەنگێکـــە
بـــۆ بـــووکو زاوا بـــە ئاهـــەنگێکـــە
بـــەنی ئیـــسرائیل ئـــەدا بـــە مووســـا
موســـا لـــە پێـــشا لـــە فیرعـــەون ترســـا
دوایـی خـوا وای کـرد بـەنیئیـسرائیل
کەوتنە شـوێنیو فیرعـەون کـەوتـە نیـل
عیـسایش بـەو هـەمـوو مـوعجیزەیـەوە
دامـابوو بـە دەسـت قـەومـەکـەیـەوە
گا، گوێرەکە خواو، گا خوای هەیکەلان
خـوا بـۆ کـەیفـی خـۆی هێنانیـە مـەیـدان
دوای هەموان هیتلەر پێش ئەڵەمان کەوت
بەختی یـار نـەبوو بە (الامـات) کـەوت
ئینجـا بـزانین بـەر کـێ ئـەکـەوێ
ئاوتـەخـوازی دنیـاین بـۆ شـەوێ
تـارای بانقـەنـۆت ئـەدا بـەسـەردا
بـە لارو لـەنجـە کـە هـات لـە دەردا
سـەرمـەشـقانەکـەی دیـنو ئیمانـە
ئینجـا دوژمـنی بـراو خزمانـە
ئێمـە لـە سـەر ئـەو کـە تێک بـەردەبین
ئـەو بـەوە دێتـە کـەیـفو پێکـەنـین
سـەد هـەزار ملیـۆن مێـردی مـردووە
بـۆ هیچیـان تـەعزیـی دانـەگرتـووە



هەرچی پێی دەژین لە خۆراکی خۆش
لە دوای عەودالین بە هەولو پەرۆش
هەر ئەمەندەیە هەتا تێر ئەخۆین
لە دوای تێرخواردن دەستی لێ ئەشۆین
کە زیادەخۆری لە حەد سەرکەوێ
حەبی ڕەوانیو حوقنەمان ئەوێ
دوای ئەوە ئیتر هێندە زۆر ناخوا
تەمێ خواردوە بە پارێز ئەڕوا
بەڵام دەوڵەتو پارە هەتایی
هەر دەڵێ کەمە بۆم تێکە با بێ
موبتەلای پارە (امتلاء) ناکا
تا بە گۆڕەوشار ئەدرێ لە خاکا
پارە بۆ پیاوی خواپێداو چاکە
کە لێی ئەبەخشێ بە خێرو چاکە
دەوڵەت ئەوەیە کە وا لە دوا خۆی
ناوێکی چاکە بە جێی دێڵێ بۆی
جاران دەیانگوت: پیرە لغاوە
لێرە ئەفسوونی بانقەنەوت باوە
لێفەی بانقەنۆت عەیب داناپۆشێ
دانا بۆ لەشی پاک تێ ئەکۆشێ
ئەمانە پەندی ڕێی ئینسانیە
چی بکەین مەیلی خەلق بە شەیتانیە



ئـەڵـماس و ئاڵـتوون چونكـە نایـابن
هێنـد خۆشـەویـستن وەک داک و بـابن
هـەرچیش کـە زۆر بـوو قـەدری نامێنـێ
بـا ئاوێنـەیـشبێ کـە پیـاو ئـەنوێنـێ
بەردی بەرزنجەیش وەک ئەڵماس وایە
ئـەو چونکـو زۆرە کـاری لـە دوایـە
تـەنهـا چـشتێکە کـە وا زۆر کـەمـە
کـەسیش نایـەوێ ئـەڵـێ خـۆم هـەمـە
ناحـەقیـان نییـە کـە نایانـەوێ
هـەرچی بـووی نـانی پـێ دەس ناکـەوێ
جـاران کـە گـەزۆ کـەبـوو شـەکـر زۆر
حەڵوای ساغ نـەبـوو سـا مـەگـەر بـە زۆر
ئێـستا کـە شـەکـر لـە نـاوا نـەمـا
حـەڵـوا بـوەتـە دۆشـاوی خورمـا
پـارەی فـرۆفێڵ کـەوتـە ئـەم نـاوە
دراوی حـەڵاڵ لای کـەم کـەس مـاوە
هـەر بـەو پـارەیـە ئـەچـن بـۆ مـەککـە
ئـەڵـێن: بـۆ حـەجـە تـۆ بـاوەڕ مـەکـە
بـۆ سـۆبندە بـڵێن: بـە قولـنجی کابـە
یـا، لابـەیـە، حـەج لـە نـاوا لابـە
هـەرچـی بتـەوێ بیكـڕی گرانـە
لافی وەتـەن و شـەرەف هـەرزانـە



هاونـــشینی بـــەد تـــەفـــرەی ئیبلیـــسە
لـە ڕەکو پـەیـداوەک خـــوێتی پیـــسە
قامیـــــشەلانی وشـــکە دلـــــی پـــیر
زوو، ئاگر ئـەگرێ بـە نالـەی شـەوگـیر
کە دووکەڵ دەرکەوت ئاگری لـە شـوێنە
خـــۆت بپـــارێزە دڵ مـــــەڕەنجێنـــــە
گــوڵ بـــە فرمێــسکی چـــاو ئـــاودراوە
بـــۆ یـــەخـــەی زۆردار هـــەڵـــبژێرراوە
کاتێکـــت زانی هـــەڵـــچەقـــی لـــە دڵ
ئەو گوڵـەی گـەلێ (کەڵ) ئەنێتە گڵ
جاران ئەسپێکیان ئەدا بە سـوار چـاک
ئەیانگوت سوار بەو لێی خورە بێباک
ئێستا بەوشـەرتە ئـەسپ ئـەدەن بە پیاو
نابـێ لێـی خـوڕێ بـە غـارو بـە تـاو
دیێـک هـەریـەکـە پیـاوی پیـاوێ بـێ
موختـــار بـلێ چـــی دز لــە نـــاوی بـــێ
(پـارتیزانی)یـەو ڕوژ ڕۆژی دەســـتدار
هەرکـەسە دەستەی خۆی ئـەخاتە کـار
جـاران ئـەیـانگوت ئـەهـل بـۆ ئیـشە
کـەچـی ئـیش بـۆ پیـاو بـووە بـە پیـشە
هیوامـــان وایـــە دەســـتەی ئـــەمجـــارە
تـــەرتیبێکـــی بـــاش بـــدەن بـــەم کـــارە



زۆر کەسم دیوە حەز لە گۆشت ناکا
هەیشە دوژمنە لەگەڵ جێی پاکا
هەندێک ناوێرن مریشک سەربڕن
هەیشە بە زۆری کوشتن ئەخوڕن
... ئەیگوت بۆیە ئەقچێنم زەلام
لنگە فرتێکەی زۆر خۆشە لە لام
دەڵەتیار ئەیگوت کە شەڕ کەوتە ناو
پەرێزت پاک بێ لە دروێتەی پیاو
ئەمانە مۆدەی دیموقراتی بوو
بۆیە وا ڕوومان لە نەهاتی بوو
ئێستاکە کوشتن باوی نەماوە
تالانو بڕۆو قرپو چرپ باوە
هەرچی دەستی بوو کۆئەکاتەوە
گەلێ کەس لە خۆ کۆ ئەکاتەوە
ئەڵێن (مەهدی) دێت لەو وڵاتەوە
گورگ لەگەڵ مەڕا ئاو ئەخواتەوە
مەپوندار بەمە کەس دڵنیا بێ
ئەم سەرزەمینە ئەمەی تیا نابێ
بەڵام هی جەجاڵ ڕاستە هەڵساوە
کەوتووینە شوێن کەر بەهوێ خورماوە
بەرایی دەرکەوت برا (دوبرا)یە
برا بەزەیی بە برادا نایە



خــوا بۆیــە ئێمــەی نــاردە ســەر زەمــین
دوژمــنی یــەک بــین بــە شــەڕو بــە قــین

نابــێ ئــادەمیــزاد بــە شــەڕ نــەبــێ
بێ شەڕ بێ، ئەبێ هەر بە شەر نەبێ

ئەوانەی ئەڵێن: حەز لە شەڕ ناکەین
دیمــوکراتینو مائیــل بــە چاکــەیــن

هەموو سەرکردەی شەڕی ڕابووردوون
لە ژێر پاڵتۆوە تیغ لە یەک ئەسوون

ئەو ئەمریکایەی ئەیگوت (مون زەتۆ)
دونیای شڵەقاند هەر وەک (مەشکەی دۆ)

ئــەویتریــشیان وا ســەر بــەرد ئــەگــرێ
ســەد خاڵــۆ خاڵــۆ کــەڵــکێ نــاگرێ

ئــــەمــــی تریــــشیان لێمــــان تــــۆراوە
لابــــەلا بــــە قــــین لــــەولا وەســــتاوە

ئێمــە واچاکــە کــە ببینــە ســەیرکــەر
لە سەر گردێ بین لە لەشکر بەدەر

لای [illegible] شـــــیرینی بخـــــۆین
بــۆ نــوێژ دوای نــەوەی عــەلی بکــەویــن

بــەڵام شــیرینی شــەکــری تیــا نــەبــێ
وا چاکە (چا)کەیش نیوەی (گیا) نەبێ

هــەی هــوو ئــەمانــە خــەیــاڵ پــڵاوە
ئێمــە و خۆشــبەخــتی ڕەتمــان بــڵاوە



ئـەگـەر دانایـتو هۆشـت بـەگـیرە
لـە نـاو مـەلاندا کـام مـەل بـەشـیرە
مـەڵـێن مـەبعووسـی بـە ڕاو تـەدبـیرە
قـرەقـرەی قـەل هـەر بـۆ هـەنجـیرە
فرکـەفـرکی مـەل بـە شـوێن دانـەیـە
هـەرچـەنـد قیـسمەتـیش ئـاوو دانـەیـە
چـی بکـەن هـەی هـاوار نـەفس زاڵـمە
مـن نـەفـسم تـۆڕاوە ئـەمـە حاڵـمە
ئـەوی هـەڵـکردی بـە ئـەنـدازەیـە
گـوزەرانیـشی بـە شـیرازەیـە
مـەڵـێن: ئـەم خـەڵـکە وا تـەماعکـارە
داوود پێغـەمبـەر کـەوتـە ئـەم کـارە
دوایـی پێغـەمبـەر ڕێـی تـەمـاعی بـەسـت
پـشتێنی لـە سـەر گۆشـتەوە ئـەبـەسـت
تـورک وتوویـەتی (بـەتـەر قارداشـم)
(ازە جـک اشـم اغریـسز باشـم)
هەیشە کـە چـاوی بـە بانقـەنۆت کـەوت
بـە غـار بـۆی ئـەچـێ نـەوەکـا بـە ڕەوت
بـۆ دەڵـەمـەنـدی (ڕەشـت)ە ئـەم بووکـە
تا بـاری قـورس بـێ ئـەو ئـەڵـێ: سـووکە
بگـرەو بـەردە بـۆ لێفـەی مـەلایـە
کـێ دەڵـێ دووگـی چـەور بـە بـەلایـە



زستان هات هەژار خەمباری دارە
لای دەوڵەتیش تەڕی بەهارە
هەندێ خۆشحاڵن (قابینە) گۆڕا
بەڵام گرانی قاپی نەگۆڕا
ئاسایش بۆ لات مەگەر لە گۆڕا
پیاوی بە هەڵات هەروا لە گۆڕا
کە مەبعووسی بێ خەیاڵی شەوت
ڕاکشێ و بنوو با بێتە خەوت
خۆشی بۆ ئەوەی کە خەیاڵباز بێ
نەک بە ئەفسانە چاوەڕێی باز بێ
تاریکایی شەو ئێوارە دیارە
کوا میراتی کەر بۆ کەمتیارە
یاریی جارنمان بابی بابی بوو
سوار بوون بە پرسی ناحیسابی بوو
ئێستا فوتبۆڵە حیساب بە گۆڵە
تەنها بابیعی بە (ڕۆڵ)ە ڕۆڵە
فوتبۆڵ ویرگولی بکەویتە نێو
بە شێوەی جڵفە ئەبێ بە جنێو
ئەڵێن: بێ ئەرخە ناکەویە کایە
بە مێردێ نییە ئەویش بە خودایە
پارەی دەوڵەمەند دەست شل دەکا
بەخیلی زۆر جار تەوق لە مل دەکا



منــداڵ بــە ئــاگر دەســتی بــسووتێ
پێــی ئــەڵــێ بـڤە کــە دیــی بزووتــێ
ماران گاز لە خشەی مێروو ئەترسێ
کــورد بــە ئــازایی لــە هــیچ ناپرســێ
ئــەڵــێن: ئــازایی‌و نــەزانی بــران
خۆزگــە ئــەم دوانــە لــە یــەک ئــەبڕان
جوبرائیــل دەســتی موســای ڕاکێــشا
ئاگری پێ هەڵگرت کە سووتا ئێشا
هــەرچەنــد ئــەو ئاگرە زوبانی سووتاند
بــە زوبــانی «پــس» فیرعــەونی پــساند
ئێمــە ئــەمــەنــدە ســەرمــان ســووتاوە
وەک کەچەڵ تووکی سەرمان نەماوە
بــەردیکــین لــە تــویی قوچــەقــانی‌دا
گــەڕایــن بــە دەوری ســەری خــانی‌دا
هاویــــشتینیانە گـــوێلاکی خۆمـــان
بەم سەرگەردیيە بووینە سەرگەردان
لــە کــاو ئــالیکی گــازر گــەر تــۆراین
بــە فێــڵی ڕێــوی بــۆ ... ئــەبــراین
ئــەمانــە هــەمــووی لــە دڵســافیە
(مــن یتوکــل) (حــسبە)، کافیــە
هێنــــدەم زانیــــوە ناپڕێتـــــەوە
لەشمان سووک ئەبێ کە ئەبڕینەوە



لـە نـاو كارخانـەی چـەرخـی ئـەفلاكـا
هـیچ بـەنیـادەمـێ لـەوی‌تـر ناكـا
هـەیـە درێـژە وەک عـووچی عـەنـەق
هـەر لـە خۆیـەوە دێتـە محـەللەق
تـاكوو (نـەڕنـاییش) هـەوسـاری ئـەكـا
دائیـەمركێنـێ، نایـەڵـێ ڕاكـا
(كوڵـەوەیبـاب)ی وایـشمان دێتـە نـاو
سـیفەت‌و قافیـەی وەک یـەكـە تـەواو
هـەنـدێكی‌تـریش هـەیـە جانمـە
هـەرچـی لێـی‌پرسـی هـەر نازانمـە
دوو فریـشتەی بەرز هـارووت‌و مـارووت
خستمانە چاڵی بابل بـە جـووت جـووت
بـۆن كـە ئـەمـانگوت بـە فـەڕەنگـی بـۆن
بـەو بۆنـەیـەوە نـە ڕەنـگ بـوو نـە بـۆن
هیوایـشمان هـەبـوو دەسـی ئـەوەشـاند
لـە سـەر سـەرقاپـێ دڵـی ئـەڕەنجانـد
ئـەمانـە كامیـان وەكـوو یـەكتـرین
تـا بێنـە نائیـب لـە بـەریـان مـرین
دەست لـە كـاری خـوا نـەدەین چاكترە
هەر بڵێن بەر بـووک لـە بـووک جـوانترە
ئـای بـۆ ئـەو چـاوەی كـاڵ دەبێتـەوە
بـە گریـان بـەرەو مـاڵ ئـەبێتـەوە



ئەڵێن: گیا لە سەر بنجی خۆی ئەڕوێ
بۆ بنیادەم خەڵک وەکوو تر ئەدوێ
بەڵێ بۆ وڵاخ ڕەسەن زۆر باشە
وا گوڵە بارگیر دیارە لە پاشە
زۆر جار ئەبینین کە دایک و باوک
کە چی منداڵیان هیچ لەوانە ناچێ
دیسان حوکمێکی قەتعی نادرێ
وەجاخزادەکان شەرم ئەیانگرێ
بە حەج و شەراب ئەڵێن وەک یەکتر
چاک چاکتر ئەکەن خراپ خراپتر
هەندێ پیشەمان هێشتا هەر ماوە
تەپڵ و بەیداخی حاجی یان باوە
هەر دەڵێن قوماش کەمەو گرانە
ڕیزە بەیداخی حاجی بڕوانە
خۆزگە مەبعووسیش بەیداخی ئەبوو
بە تەپڵ و بەیداخ بۆ مەجلیس ئەچوو
ئەوسایە دەنگیان دەڵێرتر ئەبوو
لە ناو کۆمەڵدا ناویان دەردەچوو
ئێمە هەر لە سەر ئەو فیکرەین کە بووین
هەر لە ڕاوییە زۆر چاکی بۆ چووین



مـەرد لـە واتـەی خـۆی ناگـەڕێتـەوە
ئـەو تفـەی ڕۆی کـرد نایلێـسێتەوە
هـەوالـی مـەردیو شـەرەف ئـەپرسـی
ناویـان لـێ نـاوە کـوردە نامووسـی
چـەنـدێکیش تـەفـرە سیاسـەتـێ بـوو
(دیـدەم نـەدیـدەم) کیاسـەتـێ بـوو
هەندێ قورئانیان بۆ سوێند مۆر ئەکرد
پیاویـان ئـەبـردو گۆڕبـەگـۆڕ ئـەکـرد
بۆیـە وا لێیـان کـەوتوونـە تـەقـە
(شـەوقـی) هـەمیشە بەشـی هـەر شـەقـە
ئێمـە بـاوەڕمـان هـەیـە ئـەم جـارە
هـەڵـبژاردنمان بـێ شـەق و دارە
وەرن بـا ورد ورد بیخوێنینـەوە
مـادەی (قبـاقچی) نـەژێنینـەوە
فرسـتادەمـان (ئینـە مـەوانـۆ)
(پـادار بگێـروون بـێ پـا مـەمـانۆ)
مەشهوورە کە کورد مەردی مەیدانە
ئـەمجـارە هونـەر بـە گـۆو گۆچانـە
گاڵـۆکێکی وام هـەیـە گرانـە
یـا بـۆ دەسـتیانە یـا بـۆ سـەریانـە
بـەخـوا ئـەم قـەومـە دەسـتە وەسـتانە
خوا بکا سەرو دەست نەشکێ بەسمانە



ئەگەر قابینە جار جار نەگۆڕێ
سەودای وەزیری ئەبەینە گۆڕێ

سەری بێ‌سەودا تۆپی فوتبۆڵە
ماڵی بێ (پۆکەر) کولانەی چۆڵە

سیاسەتی ڕاست هەرۆ مەڕۆیە
ترسنۆک بەشی هەر باوکەڕۆیە

وادەی ئینتیخاب کەوتە بەهارێ
چاوەڕێیین جلمان بۆ بێ لە شارێ

جاران بە فەرمان ئەهاتنە کایە
پێمان ئەوتن ئاشوور ئاغایە

ئێستا بە ڕەئی هەڵیاندەبژێرن
لە دەنگی دەهۆڵ ناترسن، شێرن

نادان بە نووسین هەڵگیرێتەوە
دیسان هەر لەفزی خۆی ئەگرێتەوە

مێشەسەگانە کە سەگ مەگەسە
هەڵپیشیگێری هەروا ناکەسە

زریی زانینت کە کردەبەرت
تاجی ئەدەبیش بێنرە سەرت

شۆرەت ئافەتەو شەهوەت فەرەنگی
زۆربوێژ نەگبەت، عیززەت بێ دەنگی

تێ هەڵچوو دائیم سەر بە بەلایە
گۆشەگیر هەرگیز کشی بەرنایە



لــە دیجلــەم پرســی شــەتی ئاخرشــەڕ
بۆچ لەگەڵبەغدا وا کەوتوویتە شەڕ
ناوجەرگی خۆیان کردوە بە مەعبەر
بــۆ ئــەمــەی بــۆ تــۆ بێتــە ڕاگــوزەر
ئەم بەرو بەریان بۆ کردووی بە باغ
ئــەلــەکتــریکیش دوورِی شــەوچــراغ
ئــەو ڕەنگــە لێــڵەت بــە تۆفــانی نــوور
ئەکا بە جیلوەی تەجەللای کۆی توور
کەچی تۆ لەگەڵ گەیشتیە بەهار
بە جۆش و خرۆش لێی ئەبێ بە (هار)
کەف دەچەرێنی و دێت بە گوڕ وەک شێت
بۆیە زنجیری (جسر) ئەخەنە پێت
جــوابی دامــەوە بــە زوبــانی حــاڵ
وتی ئــەی پــیری ژیــری کۆنــە ســاڵ
لــەو ڕۆژەوە خــوا دنیــای دانــاوە
بــۆ ئــاوەدانی کــەوتمــە ئــەم نــاوە
خزمــەتی شــارو شــاو گــەدام کــردن
بە چاکی لەگەڵ هەمووم دەربردن
بــەلام ئــەمانــەی دەوری ئــاخری
کەوتوونە نیفاق لەگەڵ یەکتری
گــــۆڕ وایــــە منــــیش بیــــا نخنکێنم
وەتــەن پــەرەســتیان بــۆ پــێ بگــەیــەنم



دوو چشت هەن کەوا بە ڕەنگ و بە تام
چـۆنی لـێ بکـرێ دێتـە سـەر مـەرام
ئـاو کـە تـۆ هێنـات کردتـە هـەر قاپـێ
ڕەنگـی ئـەو ئـەگـرێ، تـەغـییری نابـێ
نمـوودی هــەیـە هــیچ ڕەنگــی نییــە
کــەســیش نازانــێ حیکمــەتی چییــە
مایــەی حــەیاتــە گیــاندار ئــەژیێنــێ
بـەلام کـە زۆر بـوو پیـاو ئـەخنکێنـێ
(مـۆز)یـش لـە تامـا هـەر وەکـوو ئـاوە
بــە هــەرنییــەتــێ بیخــۆی تــەواوە
مـەبعووسیش حـەفتاو دوو بـەری هـەیـە
بۆیـە ئـەمـەنـدە خـەڵـک بـۆی توشـنەیـە
لای هـەنـدێ لێـرە هـەر بـۆ مـەعـاش بـوو
بێ سـەرمایـەو ڕەنـج پـارەی بـەلاش بـوو
هەندێکیش ئەیویست دەستەی خۆی زۆر کا
بە دەستە بێ دەست بەیدەسـت کـاو زۆر
هەندێ بۆ شـۆرەت هـەنـدێ بـۆ کورسـی
کـە جـاران هـیچ کـەس لێـی نـەدەپرسـی
نــازانم چۆنــە وا ئــەمــساڵ چواریــان
ماڵــدارو نــاودار هاتوونــە مــەیــدان
ئــەمانــە نــەفعــی شــەخــسیان نــاوێ
خــوا بکــا نــەبێتــە جــارێ لــە ڕاوێ



خــوا دوو ســیفەتی داوە بــە بــەشــەر
ئــەیانخاتــە كــاربۆ خێــرو بــۆ شــەڕ
یــەكــێ لای‌ئــەدا یــەكــێ ئــەیكێـشێ
مەنفیو موسبەتیان تێک هەڵدەكێشێ
هـەریـەكـە هـەرچـی بـۆ دەنێـرێ خـوا
ئـەیـەوێ بیـدا بـە خـزمو دۆسـت خـوا
كــردو كۆشــیەتی رۆژ بــۆ ئێــواران
كــۆدەبنــەوە بــۆ یــاریی یــاران
بـە دڵـێكی روون بـە گاڵـتەو سـوحبەت
گەلێ بێ‌خەمتر لە پاشای سەر تەخت
هـەیـشە لغـاوی شـەیتـان لـە دەمـا
بۆ سەر یەک خستن لە رەنجو خەما
ژن، نانێـک بـەرێ دەسـتی ئـەشـكێنێ
كـوڕ روانییـە چێـشتی چـاوی دەردێنـێ
ئــەوێ لێــی دەردێ وشــكیە كاتــەوە
كــە بیخــوا بــە میــز تــەڕەیــەكاتــەوە
خەپلەو رۆن لێک دوور، وان لە سەر سفرە
ئــەڵــێ ئــەم نانــە بــەو رۆنــە چــەورە
خـەیاڵ پلاویش ناكا نەک راست بێ
ئێسترو بارگیری ئەبێ هەر خواست بێ
نازانــێ دەوڵــەت بــۆ ئــەو باریكــە
بــــۆ مێـــــردی ژنی كریكاریكـــــە



بۆ فەیزو ڕەحمەت شەرت ئیستیعدادە
قابیلیەتیش بەهرەی خوادادە
گەزۆ بە پەلکی بیەوە تالە
لە سەر دار مازوو هەنگوینی قالە
بارانی نیسان لە دەریا باری
لەناو سەدەفدا بوو بە مرواری
کەچی لە دەشتا گوژالک ئەڕوێ
لافاو پیاو ئەبا لە پردی کەلوێ
بەم ڕەنگە هەرچی سروشتی بەد
بۆ زیانکاری سەدی نەوەدە
تەجرەبە زۆری تاقی کردەوە
بەدخوو دەستی بوو کەوتە کردەوە
«ان الانسان لیطغی» وایە
ئەووەڵ سوورەیە فەرموودەی خوایە
ئێمە بۆ بێگار بە ئیستیعدادین
چونکە پەروەردەی جەورو بێدادین
فیرعەونێکی‌واین مووساما‌ن بۆ هات
نەیتوانی بەند بێ سووکێ بۆی هەڵات
هەروەک (پاپاغان) قورئان ئەخوێنن
لە پێستی گورگا وەک مەڕ ئەنوێنن
یاری‌یەک داهاتوە بۆ دەستەی سەرکار
پێ لە جەواڵا ڕاکەن بۆ سەر شار



فەرەنگ لە ڕۆژی یەکی نیسانا
درویێک ئەکەن لەگەڵ ئینسانا

تەفرەی کەسێکیاندا، دا هاتی بەختە
(پواسون داوریل) شانسێکی جەختە

تەنیا ڕۆژێکە درۆکەی ئەوان
هی ئێمە ئەڕوا بە ڕۆژو شەوان

لە دەوری تورکا تەفرە زۆر باو بوو
پیاوێ بوو (عەجەم عیززەتی) ناو بوو

بە درۆزنیو بە زۆری چەنە
بوو بوو بە پاشاو والی ئەدرنە

هەرچی ئەچوە لای بەڵینی ئەدا
ڕاستیشی نەبوو یەکێ لە سەدا

کە ئەو ئەڕۆیی وای ئەگوت لە دوای
(هەریفی شوبلە قاند دک قولای)

تەفرەی ئینتیخاب هێند بوە بە باو
عیززەت پاشامان وا کەوتوتە ناو

هەرچی هەڵدەسێ پارە دائەنێ
خۆی تەرشیح ئەکا لای قازیبەنێ

کورسیان شەشەو دوازدە بەپێوە
هێشتا ئەوەندەی ترمان بەڕێوە

هی ئێمە باشن خەڵک ئەیانناسێ
خۆ هەڵناکێشن پڕ بە کراسێ



پیاومان لە زۆر شوێن مەردی ئەنوێنێ
بەدخوا خەریکە وا ئەو ئەنوێنێ

بە (بێهۆش داروو) تریاک ئەبێژن
خۆڵی مردوومان بەسرا ئەبێژن

بۆ (مانیاتیزمە) هیچکەس نەماوە
ئەمانوێنن هەروا بێ ماوە

کاری خۆماڵی بێگانەی ناوێ
ئەم ناوە پیاون بە هەموو ناوێ

لەلاوە بێتە ئەم ئاوەدانیە
وا دەگەیەنێ پیاوی تیا نیە

هەر ژن ئەخوازن بۆ پیاو لەولایە
پیاوت خواست ئەڵێن بۆ «کەڵەگا»یە؟!

ئەوانەی بۆ ماڵ مل کەچن دەمرن
دەک ملیان شکێ بێ (ئونور) ئەمرن

ئەتوانم حەقی خۆم بدەم بە تۆ
حەقی گەل نادەم بە مشکەیێی دۆ

ئەگەر دەستبەری بۆ دۆی ئێلەکەم
بەم پیرییە مەشکەژەنێت پێ ئەکەم

خۆ (ژین) بە بەدناو ئەتدا بە تاریخ
ئەیخاتە پێش چاو ڕیخۆڵەت تا ڕیخ

ئەوەش ئەزانم ئێلەکەم مەردە
هیچ باکی نیە لە بگرەو بەردە



بچیــە ســەر لقــیو لــە بــندا بیبــڕی
دیـارە مـلشـکان بـۆ خـۆت ئـەکـڕی

دیتــەوە دیمــان کــە لــەوســەرەوە
وەک ڕێبـوار، زرکـی کـاڵ مـەکـەرەوە

کـە تـۆ ئـەتـەوێ لـەگـەڵـمان بژیـت
نابــێ نــارەوا پیاومــان بکوژیــت

بـۆ مـەعـاش حـەقـی میللـەت ئـەفرۆشـی
لـێکـەوتی لامـان ناژیـت بـە خۆشـی

باوکت لە بەهەشت دەرچوو بۆ گەنم
تـۆ شـلە ئـەخـۆی ئـەچیـە جـەهـەنم

کە گەل بۆ ئیشی خۆی تۆی هەڵبژارد
تـۆزاوی مـەبـە بـۆ تۆزکـانی ئـارد

چونکـوو چـاو بـە چـاو ئـەکـەویتـەوە
نــاوی بــەدناویــت لــێ نابیتــەوە

کـە دینـە مـەیـدان خـۆ هـەڵدەکێـشین
لـە هـەمـوو قـەومـێ زیـاتر بـەکێـشین

کـەچـی بـەهیچـە هـەمـوو مـلکـەچـین
بۆ سـواغی قـەسری ئاغـا وەک گـەچـین

جاران (بایع) بوو (عەیب) قەلبی (بیع)بوو
ئێستا حـەفـسەمـان لـە فـەحـس دەرچـوو

ئـەمانـە هـەمـووی بـۆ وەزنی شـیعرە
واتـەی پـڕوپووچ لـە شـاعیرە مـەگـرە



دوو، لە بە حەقی خۆیان بوون ڕازی
ئیش ناکەویتە لای حاکم و قازی
ئەوسا (مەواشیر) ئاش بە تاڵ ئەکا
یا خەرمان لۆغەی هەرزنو گاڵ ئەکا
مەگەر ئیعلامی ژن هێنان دەرکەن
کڵاوی سووری سپی لە سەر کەن
خۆزگە ئەو پیاوەی ژنو ماڵداره
نەدەبوو کە ژن بێنێ دووباره
ئەم دووبەرەکیە لە دوو بەرەیە
باوەژن ئاگری شەڕ خۆش کەرەیە
دوو برا ئەگەر لە دایکێ نەبن
ڕەگی یەکتری دەردێنن لە بن
با، بیشڵێین دایک دایکی خۆمانە
ئێستا، سیاسەت باوەژنمانە
باوەژنێکی جادوومان هەیە
هیچ کەس تێ ناگا کە چەند بەوەیە
باوکمان لێ بووە بە باوەپیاره
دادمانە لە دەست کوێخای بێ کاره
کاتێکمان زانی خەمشەمان برا
شەڕە دەندووکە لە «کولانە شڕا»
(کەیفی) شاعیرمان ئەمەندە حوڕە
تێرمان لە جاوی گازری پڕە



شانس کە بە کوردی (تالعی) ناوە
لە تەبیعەتی چێرگدا خولقاوە
پیاوێ پیاوی دی گورج هەڵدەفڕێ
کەچی لە دەوری کەرێ ئەگەڕێ
زۆریوا هەیە کەر لەو چاکترە
بە مستە جۆیی بارەبەرترە
ئەو باریش ناباو لەقەیش لێئەدا
رەخنە ناگیرێ لە کاری خودا
دنیا کە ناوی یایەی گەورەیە
سیاسەتەکەی هەموو تەفرەیە
لە هیچە یەکێ بەرزئەکاتەوە
ئەیباتە ئەوجی ژوور ولاتەوە
نازانێ کە وا ئەم سەرخستنە
لەو بەرزییەوە لە پرخستنە
هەتا لە بەرزتر بکەوێتە خوارێ
دیارە کە ئەستۆی ئەشکێ بە جارێ
هەندێ چشت هەیە چاکە لە لامان
دوایی لە دەستی دینە ئەلئەمان
زۆز چشت لە پێشدا خراپ دیارە
کەچی لە پاشا بۆ دیار، یارە
بزانین ئەمجار چۆن ئەبێ بۆمان
ئەوە گۆڕ ئەوەیش مەیدانێکی پان



عیلمـی حوقووقمـان کـە سـەردەفتـەرە
بـۆ وەزیفـەی بـەرز یـەکـە ڕەهبـەرە
لکێکـی زۆری لـێ ئـەبـووەوە
مـن خوێنـدم بـەلام بـیرم چـووەوە
حوقـووقی دووەل قـورس تـر بـوو باسـی
چونکـوو پێویـست بـوو بـۆ دیپلۆماسـی
ئێـستا ئـەو دەرسـە بـاوی نـەمـاوە
کە زۆر کـەوتـەو ناو ئـەو کـەوتـە لارە
عیلمی فیقهیـشمان وای لـێ بـەسەر هات
مـۆدێنکی‌وا لـە نـاوا داهـات
حـەرام حـەلالـی وەهـا ڕاونـاوە
حـەلال سـەربـڕا نـوتقی نـەمـاوە
عەرزو مالی خەلـک شەرعـەن حـەرامە
نەوەک مـال عـەرزیـش بـۆ زۆردار ڕامـە
هـەرای حورییـەت کـەوتـە نـاوەوە
لـە پـڕ هـەر دوو پێـی کـەوتـە داوەوە
ئێـستا بـە بـێ قـۆرت ئیـستیبداد حـورە
وەک کـوردە دەلـێ چـرا هـەلـبڕە
ئەوەیش کە ئەمڕۆ کەوتوەتە هاوار
هەر بۆ ئەوەیە خۆی بێتە ڕووی کار
ئـەمانـە ئێمـە زوو تێگـەیـشتین
نووسـیمان جـڕتیان بـۆ ڕادەهێـشتین



دوو عـادەت هـەیـە وەک مـەتـەڵ وایـە
یــەکێکیــان ترســەو یــەکــێ هیوایــە
تـرس بـۆ ئـەوەیـە کـە لـەسـەر کـارە
عـەکسی ئـەو مـەفـسوول کـە هیـوادارە
حـەق وابـوو ئـەوەی کـەوا مـەئمـوورە
بـەو بـڵێن لـە سـەر کـارەو مـەسـروورە
کە چی ئەوانـەی بـە ئیش سـەربـەرزن
لـە ترسـی فـەسـڵی (فـەسـڵ) ئـەلـەرزن
کــەوابــێ مــەعــزوول ئاســوودەتــرە
هیــوای تــەعیــینی ئــاتی لــەبــەرە
ئـەمـەنـدەیـان ڕسـت هـەی دیمـوقراتی
ئــەم عالــەمــەیــان خــستە نــەهــاتی
وەک ڕەشــانەوەو مــەرگــی موفاجـات
زەیــلو فــەســلیان خــستە نــاو وڵات
مــەتـەڵــەکــەیتــر ڕاســتەقینـەیــە
بۆیــە هــەمیــشە خــەرجــی پینـەیــە
بزنیــان ســواری گــامێش کــردووە
تـۆیش سـواری ئـەبی کـە چـی مـردوە
لـە بـەرەوژوورە،کـە هـەمـوو ئـەسـپێ
قوشـقونی شـلەو بـەرەی ئـەچـەسـپێ
ئـەو بـەعـەکسەوە دێتـە گـەردو خـول
لـە شـاخ قوشـقونی تونـدەو بـەرەی شـل



پیاوی ئەم دەورە وەک ڕەنگی بەهار
بێ ئیعتیبارەو بێ شەرتو قەرار
هەندێ جار لە خەو هەڵسای بەیانیان
سایەقەی ساماڵ ئاسۆی شینو جوان
کاکلە هەورێکی پێوە نابینی
ئەچی بۆ سەیران بە بێ تێبینی
لە پڕ ئەیکاتە شەستە ڕەهێڵە
دە، ڕاکەو کەسو کار بە جێبێڵە
ئەڵێن: بارانی نیسان شیفایە
بەلام هەندێجار تەرزەی لە دوایە
ڕەزەی هەزارێک خۆی کە بەر ناگرێ
تەرزە ئەیکوتێ ئەویش بەر ناگرێ
بۆ دەوڵەمەندیش تۆ، لە خوا گەڕێ
باران ئاش، وشکان جووتی ئەگەڕێ
زۆردارو زەروو ناویان خوێنمژە
زەرو پاکژە زۆردار پیاو کوژە
کەرو ئێسترت ئەگەر بەر کەوێ
بە کەر ڕەزا ئێسترت نەوێ
کەر بارەبەرە بێدەنگ و سەدا
ئێستری چەمووش جووتەت لێ ئەدا
ئێستر دوورەگە بڕوای پێ ناکەم
هیوایشمان هەیە گوێی ناباتە چەرم



بـەهـار بۆیـە پیـاو لـەبـەر خـەو گێـژە
چونکـە شـەو کورتـەو ڕۆژگـار درێـژە
خـوا پێـداو بـە ڕۆژ سـەرخـەو ئـەشـکێنێ
بـۆ پاسـەوان شـەو خـەو سـەر ئـەشـکێنێ
خۆزگـە کـە ئـەڵێن خـەوی پێنجـەی تـار
خەوی هێجگاریی ئـەخـست لـە بـەدکـار
هــەمیــشه فیتنــه بــا لــه خــەوا بــێ
هەرچی هەڵیساند حـەواڵـەی خـوا بـێ
(النــوم اخــو المــوت)یــان وتــووه
فیتنــه بــه بــرای خــەویــش زینــدووه
وانێکـە کـوێر بـوو مـارتینی لـە مـشت
هـەر بـەخـۆڕایی کـە پیـاوی ئـەکوشـت
ڕووتی نـەئـەکـرد هیچـی نـەئـەبـرد
حـەزی لـە لینگـە فرتێکـەی ئـەکـرد
لــێ پرســینەوە نــەبــوو ئــەوســایە
بــا وجــود ئێــستاش لــەوســەرە وایــە
بــەڵام ئــەمجــارە نــاویکی تــرە
ســەر ئازادییــە گــوێی لــێ ڕاگــرە
براکــەم! ڕاســتی تــۆ لــە مــن بییــە
شکــــلی ئیــــدارە نــــازانن چیــــە
ئێمــە بــە دارو فــەلاقــە فێــرین
لـە دەر وەک ڕێـوین، لـە مـالا شـێرین



«ژۆڵ وەرەن» هەڵسا دنیا بگۆڕێ
بەو سەودایەوە گوێی نایە گۆڕێ
بە خەیاڵ تۆپی هێنایە مەیدان
گوللەی بگاتە چەرخی ئاسمان
زەمین هاتە ڕاست خەتی ئیستیوا
بەو گوللە تۆپە بیگێڕیتە دوا
تۆپی خۆی هاویشت کردی بە هەرا
چەرخی فەلەکی پێ تێک نەدرا
نە دەور گۆڕا نە جەوری زۆردار
بۆمباو قۆنبولە زۆرتر کەوتنە کار
بە کەس چاک نابێ (دەنی) ناو ناوە
خوا ئەم جیهانەی وا سروشت داوە
بۆیە لە بەهەشت دەریپەڕاندین
تۆوی دوژمنی لە ناوا چاندین
ئێستا حیزبەکان هاتوونە مەیدان
بە گوێچکە پچوڕکێ کەوتوونە تەکان
گوریس کێشەکێ هاتووتە پێشێ
هەر کەسە بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ
هەندێ ئەحرارن هەندێ وەتەنی
دیموقراتیەکان پێیان پێکەنی
دڕ دەن وا هاتن تیپی دیموقرات
عەدلو موساوات ئەخەنە ولات



منـدالآن لـە سـەر شـەقـامی قیرتـاو
خـەتـێ ئـەکێشن پێـی ئـەنێتـە نـاو
بـازی تیـا ئـەدەن بـە هـەنگـلەشـەلـێ
ئـەمێنێتـەوە ئـەوە بـۆ گـەلـێ
دەسـتەیـەکـێ تـر کـە هاتنـە کایـە
هـەر ئـەو یاریـەیـە نـەریتیـان وایـە
لـە بـەرەوژوورەیـش کـەرێ ئـەمیـزێ
دوای ئەو هەرچیەکیان کە هات لە ڕیزێ
ئـەبینیئـەویـش بـۆ میـز وەسـتاوە
ئـەمـە بـە کـوردی خـەرمیـزی نـاوە
چاولـێ کـەریـەو کـردەوەی کـەری
خـووێکی بـەدەو ئـەڕۆن لـە سـەری
وەنـەبـێ زەرەر هـەر بـۆ خۆیـان بـێ
هـەڵـەوەڕە، دز دێتێـە سـەر دێ
لـە گاگـەڵێـکـدا گـوێرەکـەیـەکیـان
کـەوتـە شـێتایی‌و خـواردی بـەریـان
هـەمـوو گاگـەلی تێـوە ئـەگلێنـێ
میریـی جـەزاکـەی لـە شـوان ئـەستێنێ
دەسـت بـە کـلاوی خۆتـەوە بگـرە
ڕەشـەبـاێکی سـەختـە لـەم دەورە
بـا وجـوود ئێـستا سـەرڕووتی بـاوە
بۆیـە بـە ئـەدەب وا بـێ کـلاوە



وڵاخـــی نـــەگـــریس کـــە وا بـــار نابـــا
هـــــەریارنــــەبـــــەرە بـــــشچێتە کابــــە
زۆر کـــەر لـــە پیـــاوی کـــەر وریـــاترە
بـــە وۆش ئـــەوەســـتێ گـــوێ ڕاپێـــلترە
گـــوێ ڕادێـــر لـــە لای خێـــوی نـــازدارە
بارنــــەبــــەر بـــــەشــــی نــــەقیــــزەو دارە
بـــەنی‌ئـــادەمـــیش دیـــسان هـــەروایـــە
پیـــاوی بـــەکـــارو بـــەدکاریـــان تیایـــە
بەلام ئینسان‌و حەیوان وەک یەک نین
زۆری‌وا هـەیـە کـە بـا شـانس ئـەژیـن
بـــەربوونـــە عالـــەم بـــە گـــازو لـــەقـــە
هـــەژار بـــێ‌زارەو جێگـــای پـــێ لـــەقـــە
کـــەچـــی ئـــەبـــینی ئـــەوان لـــە پێـــشن
تێکـــڕا ئـــەم خـــەلقـــە باریـــان ئـــەکێـــشن
مـــن ئـــەڵـــێم هـــەوای ئـــەم شـــارە وایـــە
قـــەدری زۆرداریـــان زۆرتـــر لـــە لایـــە
هەرچی بۆی هەلکەوت خۆی لە خۆی گۆڕێ
بـــێ‌دەســـــتەلاتی،وا حـــــەلال خـــــۆری
گورگانـــــەشـــــەوێ لای لایـــــەمانـــــە
پیـــاوخۆرەکـــە ش وا لـــە بـــەردەرگانـــە
لــــە منداڵــــیەوە بــــەچــــەترســــێنین
بۆ شوێن گورگ کەوتن پەت ئەپسێنین



بــێ دەنگــە ئــەوەی کــە کاربــەدەســتە
هــەرچی کــە لــێ کــەوت وەتــەن پــەرستە
پــەتایــەک هــەیــە شــەمــەکــەی نــاوە
کــە جاربــەجــارێ کــەوتــە ئــەم نــاوە
هــەرچــی ئــەبــینی پــژمو هــوورەییــە
دووزەلــەی لــووتی تــوورەتــوورەییــە
ئێــــستا .... ئــــەو پــــەتایــــەیــــە
دەمــاغ گــەرمــی ئــەو نیمچــە تایــەیــە
مــاڵ ویرانیــەکــەی هــەر بــە کــورد بــڕا
بــە دڵــپاکی خــۆی پێــی چــوو بــە قــوڕا
بــە چــاوی خۆمــان دیمــان تــەفــرە بــوو
بــە ئاشــکرا دای بــە گورگــان خــواردو
ئێــستاش نــە بامــان دیــوەو نــە بــاران
ئــەو ســەودایــەیــەو کۆمــەڵــی یــاران
هەنــدێ لــە بەدیــی خۆیــان دەرئــەکــرێن
ئــەبنــە ئــاگرو لــە کــۆز هــەڵ ئــەکــرێن
درەبەســتی کــەسو کــار نیــن لــەبــەر قیــن
ئــەڵــێن بــسووتێو ئێمــەیــشی تیــا بــین
کــە کــەوتیــشەوە ســەر ئیــش بــێ دەنگــە
چۆن سەرئەکەوێ قــەومێــک بــەم ڕەنگــە
بــۆ نیبابــەتــیش زۆر کــەس لــە پێــشا
ئــەهاتــە مــەیــدان خــۆی هــەڵــئەکێــشا



جاران خوا قینی ئەگرت لە شارێ
بە ناخی زەویا ئەیبردنە خوارێ
یاخۆ قەومێکی بەوە ئەترساند
لە ئاسمانەوە بەردی ئەباراند
کە پێغەمبەری ئێمە پەیدا بوو
لەبەر خاتری ئەو ئەمانە لاچوو
ئێستا لە ڕێگای دین لامانداوە
خواو پێغەمبەرمان هێند لێ ڕەنجاوە
وا، وردە وردە ئەمانترسێنێ
لە شوێن بەرد جارێ خۆڵ ئەبارێنێ
ئەم خۆڵبارانە لە جێی ئینزارە
هەر وا بین نۆرەی بەردە ئەمجارە
هەرچی ئەبینی کەوتوەتە گزی
جۆی گیانلەبەریان وەک کوتاڵ دزی
ئەمە کردەوەی خۆیان هاتە ڕێ
ئەگینە ئێرەو فەلەستیم لە کوێ
سوپاسی ئێمە با بەجێ بێنن
وا لێرە تۆڵەی ئەوان ئەسێنن
خۆزگە بایعی کوتاڵو قوماش
بە جووت ئەکەوتنە ناو دۆزەخی ئاش
دەستەملان ئەبوون بە جووت وەک یۆڵداش
ئەترنجاتە بەینی دوو بەرداش



ئەم چەندەی کەوا تەنیا بووم بۆ خۆم
منیش خەریک بووم باینجان بخۆم
دوایی دیم ئەوی باینجان خۆرە
هێند سەودای زۆرە لێی بوە بە خۆرە
شەوی لێ ڕۆژە ڕۆژی لێ شەوە
بۆ منداڵی خۆی بووە بە شەوە
ئەگەر بە کەسێ بڵێی قوماربـاز
گۆشتت ئەپچڕێ بە دەندووک وەک باز
کەچی قوماری هێند لە لا خۆشە
بە بیرەی جۆکەر بێ مەی سەرخۆشە
بلۆفی پۆکەر بۆ ئەم دەورەیە
بە دەورە پیشەی پیاوی گەورەیە
موحتەسیب کە خۆی خواردیەوە دیارە
لەگەڵ سەرخۆشا هاو پیاڵەو یارە
لە کوێی بێخەوە ڕەمەزان پاشا
«محان» جاڕ بداو بانگ کا لە پاشا
ئەوی ڕەمەزان کە ڕۆژوو نەگرێ
بە ئەمری پاشا ول وای لێ دەکرێ
وا ڕەمەزانیش وەختە بێتەوە
لە هەموو ماڵێ ڕۆژ ئەکرێتەوە
بە لۆقەو بە ڕەوت بە دڵو نابەدل
هەموومان تێکڕا ئەگەینە مەنزڵ



ئەم کوردە هیوای تیا هەڵکەوتووە
کە بۆ گەل هیوای تیا هەڵکەوتووە
لەگەل، لەگەڵ گەل بەچاکیان زانی
لەگەڵ مەرگ ئەچنە بەربەرەکانی
ڕشتەی ژیانیان ئەکەن بە گوریس
گوریس کێشەکێ ئەکەن بۆ نەگریس
هەر بۆ ئەوەیە کە بڵێن: ئازان
ئەگینە پێیان ناڵێن: خانەزان
ئەوەی بۆ دایک شەفەقەت نەنوێنێ
باوەژن لە تویی خاکا ئەینوێنێ
کە تو کەوتیتە بەربەرەکانی
نایێڵن گۆزەت پڕ کەی لە کانی
ئەمڕۆ ڕۆژێکە سیاسەت باوە
لە زۆرەملێ چیت داوە، باوە
کە تۆ بێ دەستیو دەرفەتت کەمە
مەڵێ ئازایی پیشەی باوکمە
بە (ولا تلقوا بایدیکم) خوا
ئامۆژگاری تۆی فەرموو بەرودوا
بەلام تۆ ئەڵێی مەردی ئەنوێنم
ئەرم و گەلی پێ ئەژێنم
کێ تۆی لە بیرە لەدیواخان
تەنها قوڕ ئەکەی بەسەر لاوانا



لایــــێکم ئـــاگر لایـــێکم ئـــاوە
خــاکم تــۆز ئــەکـا بــە ڕەشــەبـاوە
خۆزگــە چــارێکی ڕەشــەبـا ئــەکـرا
یـا هـیچ نـەبوایـە فیـشاڵ دوای ئـەبـڕا
پڕۆپاگانـــــدە فیــــشاڵی نـــاوە
دەمێکـــە لـــە نـــاو ئێمـــەدا بـــاوە
ئێستا دەست، دەستی دەست بەکێردییە
بۆیــە هــەرەشــە نیــوەی مێردییــە
بـە کێـردەکولـە هـاروون لـە نـاوچوو
وەک تـڕی بـن گـۆم دەنگێکـی نـەبـوو
پـــارەداری ڕژد ئـــەزانی چۆنـــە؟
تــڕی بــێدەنگــەو تــسی بــێبۆنــە
خۆزگـە ئـەمـزانی ئـەوانـەی نـایخۆن
بــۆ مێــردی ژنی جــێ دێــڵن ئــەڕۆن
لـە قـەبـرەکـەوە ئـەیـدی بـەچـاوان
بـە پـارەکـەی ئـەو ئاهـەنگـی لاوان
ئەوەیش کە لە ڕێی خوادا ئەیبەخشێ
بـە هـەمـوو هێـزی دەوران نالـەخـشێ
چرووکیو بەخشین بە خواستی خوایە
هــەرچۆنــێ قیــسمەت داینابــێ وایــە
کــە ماڵــی خۆیــان نــاخورێ بۆیــان
قـەمتـەر کـراون لـە لغـاوی شـەیتـان

خوێنـدن تـەئـسیرێ ناکاتـە سـەرخـوو
نەگریس بە چاکو خراپ ئەڵـێ خوو
(بـێعیـار) کـە (ی)ی لاچـوو (بـێعـار)ە
هـەرچـی عـەیـاری گـۆڕی عـەیـارە
ئـەو ئێـسرەی کـەوا مـەخسوسی جووتـە
گـوێی بـەچـەرمـەوە نابـا بـۆ جووتـە
زۆریوایـش هـەیـە چـڵکنو گـەڕە
کـە ئاشـی گـەڕا ئـەوسـا بـەگـەڕە
شـەیتـان زۆر پیاوچـاک ئـەگێڕێتـەوە
کتێـب بـۆ ئـاخریی ئـەگیرێتـەوە
بـەرسیـسای عابیـد لـە (وەلی) ئـەچـوو
بە تەفرەی شەیتان لە ڕێی دین دەرچوو
دوو بـرام دیـوە ئـەولیـا زادەن
بـۆ هـەمـوو ئـەمـری شـەیتـان ئامـادەن
بـەوەدا ئـەڵـێم: نـەتـەوەی وەلی
زۆر مـل ئـەشـکێنن بـە زۆرە ملـی
دنیـا هـەنگوینـەو بنیـادەم مێـشە
قـاچی تـێچـەقـی ئـازای ڕایکێـشە
هیچ کەس ناناسرێ بە بێ لێ قـەومان
بـوار، سـپیو ڕەش دەردەخـا بۆمـان
نوقتـەی عائیلـە بـوو بـە غائیلـە
بۆیـە بـۆ دونیـا خـەڵـک هێنـدە مائیلـە



شەیتان پیاڵەیێک هەنگوین ئەگێڕێ
پیاوچاکی لە دین پێ وەردەگێڕێ
کە ئەمووستێکی لە دەمی هەڵسوو
ئەبێتە پیاوی ئەکەوێتە دوو
لە جیاتی شەیتان ئەوان ئەگەڕێن
(شیاطین الانس) بەوانە ئەڵێن
ئەمانە دەستەی لەخوا نەترسن
لە خزمو کەس کاریان ناپرسن
هیوایشمان هەیە هێند بێ‌ناموسە
بەوە ئەخورێ کەوا جاسووسە
ئەم دەردە پیسەی کە ئەخلاقیە
لە بڕەودایە هەروا باقیە
تا هەموو لایەک ئەمە نەزانین
نابین بە هیچو بێ پشتیوانین
خۆ ئەگەر خوای کرد لەمە گەیشتین
پشتمان دایە یەک ئەوسا بەپشتین
پشتو قووەتمان کە لە خۆمان بێ
پیاوین هەرچۆنێ ئارەزوومان بێ
ئێستە کە کەڵکی خۆمانمان نیە
ئیتر بێگانە ئێمەی بۆچیە
چار هەر ئەمەیە بە تەفرەی شەیتان
نەدەین لە سەرو گوێلاکی خۆمان



وا، بە خلەخل مام ڕەمەزان هات
ڕەمەزان بۆ ژنان مەرگی موفاجات
کەس مانگی نەدی تۆپ ئاگر درا
نەمزانی چۆن بوو ئەم حوکمە درا؟
کەیفی خۆیانە کە من نەیگرم
چیمە لە خەڵکی لە بەریان مرم
ڕەمەزان ناویان ناوە (مرضان)
دو نەخۆشییە برسیو ئاوبەندان
برسیەتی ڕاستە هەژار بێ نامە
ئاوبەندیش نییە کە ئاوبەندانە
کەبابخانە کەم دەرکی داخرا
بێ کەبابیی هات بەسەرا، سەرا
بەلام ئەوانەی خوایان خۆش ئەوێ
بە بارقورسیی نەوس شانیان نانەوێ
کە هێوای دایە فیکرو یادی خوا
هەرچی کە ویستی لە بەهەشت ئەخوا
پیاو باری خەمی کە هات بەسەرا
ئەبینی چەند ڕۆژ ئیشتیهای بەسرا
دیارە بە خۆشیو زەوقی ڕۆحانی
زۆر گوێ ناداتە خواردنی نەفسانی
بەلام شەیتانمان ئەمەندە زاڵە
ئەم پەندە لامان وەک گڕوگاڵە



کە تۆ خۆت ناسی خوایشت ئەناسی
ئەوسا کەس نالێ: کاسیو کەساسی
خواناس لە بەندی بەندەگی دوورە
لە بەندە دوورە وا ڕەنگی سوورە
ستەمە لەگەڵ ئەبنای زەمانا
هەڵکەی لە شێوەی ئەمنو ئەمانا
هی ئەوتۆ هەیە کە زۆر لێت پرسی
ئەو وائەزانێ کە لێی ئەترسی
زۆر کەسمان دیوە کاتی کەم دەستی
ڕوویەکی خۆشو دۆستی پەرستی
لەگەڵ بەرێکەوت کە کەوتە کارێ
خۆی بەرز گرتووە هێندەی چنارێ
کاتێ لینگەو قووچ کەوتوەتە خوارێ
سەرو گوێلاکی ورد بووە بە جارێ
ئەوی لە پێشا بایەزیدێ بوو
بای ڕێکەوتو (با)ی بایەزید لاچوو
هەموو ئایەتێک لە سوورەی قورئان
فەرموویە خۆتان لادەن لە شەیتان
بەلام ئەو هێندە فریوی زۆرە
زۆر کەس لەخشتە ئەبا بە نۆرە
خوا وای داناوە ئەبێ هەر وا بین
ئێمە لە ئادەم عاقڵتر نابین



هەر بارگیرێکی بە سەرسم فێر بێ
پێی ئەڵێن یاخوا ناڵبەندت کوێر بێ

تەربییە لە سەر باوکو دایک فەرزە
کە تەربییە بوو کردەوە بەرزە

خووی چاک لە خوێندن گەلێ پێشترە
بەدخووی عالم زۆر بە ئێسترە

ئەو خراپەیەی خوێندەوار ئەیکا
ئوممی نایزانێ دەرکی پێ ناکا

ئەوەیش باوکی چاک تەربییەی دابێ
هیچ باوەڕ مەکە سەردەرهەوا بێ

نازی ڕۆڵەی چاک لە سەر باوکە
تیشکی تەربییە وەک چراوکە

زۆریوایش هەیە کەوا ئەسیلە
کەچی لە ڕاستی شەیتان زەلیلە

شەیتان هەر لە دووی چاکان دەگەڕێ
ئەیەوێ پیاوچاک لە دین وەر گەڕێ

ئەگینە بۆ بەد ئەو هەوڵ نادا
هەیە کە دەرسی ئیبلیس دائەدا

جلی ڕەشو بۆر کە چلک هەڵئەگرێ
لەککەیی لە سەر سپی ئەبینرێ

کەمترە تاڵیی ترۆزیو خەیار
هەنگوینو کاڵەک ئەبنە ژاری مار



ڕەمەزان ناوی وەسمان سێ لاقە
هەر دە ڕۆژ لاقی ئەشکێ سێ تاقە
بیستەم تێپەڕی دوو پێی شکاوە
لاقی سێهەمی سەختە شکاوە
هەرچەند ڕۆژووەوان هێزی بڕاوە
قەدرو ئەوایی کەوتۆتە دواوە
جاران کە ئەبوو بە بەرەجەژنان
منداڵ بە گاڵە ئەکەوتنە مەیدان
بە ئاڵووالاو بەرگی زەردو سوور
گۆرانییان ئەگوت بە سازو سەمتوور
ئێستا گرانی وای بە سەر هێنان
منداڵمان بێجل کەوتوونە گریان
ساڵێکە ئەڵێن: کووتاڵ ئەدرێ
جلو بەرگ دڕا درۆ دوای بڕێ
ئەوی کە بەشی خۆی پێ بڕاوە
ئەو باکی چییە منداڵ گریاوە
بەزمی ئەزمرو سەرچنار باوە
قوڕ بەسەریی بۆ مەعاش خۆر ماوە
نرخی خواردنمان یەک بە پەنجایە
قوماندەی مەعاش (برەندە سایە)
کەسیش ناوێرێ بڵێ بۆچ وایە
ئەڵێن: قیسمەتەو کاری خودایە



شاخ لە پەشیمان ئەگەر بروایە
ئەبوو بێشاخمان زۆر کەم بمایە
دەستلاتدار بیو لە خەلک ببووری
پەشیمان مەبە لای خوا مەئجووری
چونکوو لێبووردن شێوەی خودایە
تۆڵە هەمیشە ترسی لە دوایە
بەلام وەزیفە مەتلەب ئەگۆڕێ
حاکم بۆی نییە لەکەس ببوڕێ
بەدی لەگەڵ چاک چەند ناسزایە
چاکەیش دەربارەی پیاو خراپ وایە
ئەو تفەی ڕۆتکرد مەیلێسەرەوە
ڕیسێ هەلّت کرد مەیڕیسەرەوە
بە وشکە ئیکرام میوان تێر نابێ
باز چەشە نەبێ بە ڕاو فێر نابێ
بێمنەت بژی بە گیاو بە گەپلە
نان بدە بە سەگ مەیدە بە سپلە
دز کە جارێکت تاقی کردەوە
مەیخەرەوە سەر کارو کردەوە
لەبەر چرادا دزی ناکرێ
کەوتووینە دەورێ چرا ئەدزرێ
ئاگری گرانی ئەمانسووتێنێ
ئاویشمان نییە تا دایمرکێنێ



تـازە هـەنـدێ فیـل سـەری هـەڵـداوە
شـەقـی لـە تـۆینی جانبـاز هـەڵـداوە
هیچ ئاگـات لـە خـۆت نییـە ئـەتفرۆشـێ
سەدجار نێریش بی ئـەو هـەر ئـەتدۆشـێ
ئـەینێرنـە حـەج ئـەڵـێن: حاجییـە
پـڕ بـن باخـەڵـی خاچـەو خاچییـە
وەجـاخزادەیـی بـاوی نـەمـاوە
هـەر جـاخی تـووتن بـرەوی بـاوە
هـەڵـبەزو دابـەز وا لـە پێـشەوە
گـورزی خـۆت بگـرە تـۆ لـە پێشەوە
ئـەگینـە کـە بـۆی دەرچـووی لـە ناکـا
لە مالـی خۆیـشتا کـەس ڕووت تـێ ناکـا
قـسوورت نـەبـێ (قـسور)ت نابـێ
چـل سـوورت نـەبێ جـل سـەوزت نابـێ
دینـارت نـەبـێ کـارت دەرهـەمـە
لێـرە، هـەر لـیرە لابـەری هـەمـە
قـەڕنی قـران بـوو قـڕانی هـانی
چـەنـد خـۆش‌بـوو دەورەی ساحێبقرانی
هـەتـاکوو خۆزگـە بخـوازی بـۆ پـارە
ئۆخـەی بـۆ ناکـەی خۆزگـە بـە پـارە
هـەر مـەیلـی خوایـە کـە وا دیـن‌ئـارە
پـشت لـە قیبلـەیـەو ڕوو لـە دینـارە



ئــەو سیاســـییەی ئــەڵـــێن: دڵ ئاگـــا
لـــە فڕۆفێـــڵی ئـــەم چـــەرخـــە ناگـــا
زۆر جـــار دیومانـــە ئـــەوەی زۆرداره
بـووه بـە خـاوەنـد کـۆت و قـەنـاره
بـسمارک پـەڕەنـسی قـەومـی ئاڵـەمـان
کـە پێیـان ئـەگـوت: سیاسـیی جهـان
فکـــری (الحکـــم لمـــن غلـــب) بـــوو
لـە ڕیـزەی قـەولی پێغـەمبـەر دەرچـوو
فـەرمـووی پێغـەمبـەر (صـلی الله علیـه)
«الحـــق یعلـــو و لا یعلـــی علیـــه»
ئـەبـینی ئـەڵـمان تـا بـڵێی ئـازان
به فەن و سەنعەت پێشکەوتووی دنیان
تـۆوی غروورپـان لـە دڵـیانا چانـد
بـــە زۆرەملـــی زۆر ملیـــان شـــکاند
ئـاگرێکی وایـان بـەردایـە جیهـان
چـەڕەدووکـەڵـی گـەییـە ئاسمـان
سەیریان کـەنـدوایی خۆیـان تیا سووتان
زۆری نـــەمـــاوه بمـــرن لـــە برســـان
دیموقراتییـەکـان کـە بـۆ سـەهێـۆنی
عـەرەبی نـەجیـب بخـەنـە زەبـوونی
هـیچ فـەرقیـان نابـێ لـەگـەڵ ئـەڵـەمـان
گۆێمـان لـێ ئـەیێ بـڵێن: ئـەڵئـەمـان



بـێ دەرەتانـێ کـە مـەعـاش خـۆرە
لەگەڵ کاسبدا فەرقیان چەند زۆرە
مـەئمـور کـە چاوی لـە مـەعاشـیەتی
بـۆ تێپـەڕینی ڕۆژ تـەلاشـیەتی
ئـەیـەوێ عـومری لـێ کـەم بێتـەوە
تـا سـەری مـانگی زوو بـۆ بێتـەوە
هـیچ دەربـەسـت نییـە یـاخۆ نایزانـێ
کـە عـومری ئـەڕوا بـۆ تیکـە نانـێ
تیجـاریش ڕۆژی دوو ڕۆژەی ئـەوێ
فریـای فـرۆختنی مالـی‌تـر کـەوێ
بـەلام دەولـەمـەند خـاوەنـد سـەرمایـە
ڕۆژوو شەولە لای ئەو وەک یـەک وایـە
خـەریکـی بـەزمو کـەیفـی خۆیـەتی
چ پـەروایـدەردی مـنو تۆیـەتی
ئـەم هـەراو هۆریـاو شـەڕی جیهانـە
لێکـی‌بـەیتـەوە هـەمـووی بـۆ نانـە
سیاسـەتی چـەرخ مـەکـری ژنانـە
خـۆی دوون پـەروەرەو نـان لای دوونانـە
بۆیـە جوولـەکـە دووی شـەڕ ئـەکـەوێ
ئـەڵـێ سیاسـەت مـنی پـێ ئـەوێ
پـەنـدی پێشینان لـە مـن وەرگـرە
ئـەوی جـووی بـوێ لـە جـۆ کـەمتـرە



وا تێگــەیــشتم کــە ئــەم دنیایــە
بــە چــی ڕاگــیرەو ســڕی چــی تیایــە
مریشکێکمان بــوو کــە هێلکــەی ئــەکرد
هــەر لــە خۆیــەوە کــەوتــە قرتــەقــرت
وتیــان مــرە کــوڵ وا کڕکــەوتــووە
خۆیشی ئەم چەنــدە هێلکــەی کــردووە
عــەلی بنێــرە پێــنج هێلکــە بێنــێ
بیخــەینــە ژێــری‌و جووچــک هــەڵــێنێ
نــاردن پێــنج هێلکــەی‌تریــان بــۆ هێنــا
خــستیانە ژێــری‌و جــووچکی هــەڵــێنا
پاسێکی ئــەکــرد ئــەتگــوت بــەڵایــە
کــەس نــەی‌ئــەوێــرا بچــێ بــە لایــا
تا گــەورەی کــردن بــوون بــە کــەڵــەشێر
لــە دایکیــان ئــەداو ئــەیانتایــە ژێــر
کــە چــی ئــەو دایکــە هــەم دیــسانەوە
قرتــەقــرتی بــوو لــە بــۆ نانــەوە
ئینجــا تــێ گــەیــیم کــە خــوا بــەزەوی
خــستوەتــە دڵــی خــەڵــکی ســەرزەوی
ئــەم کــوێرەوەریــەو ڕەنجــە ئــەکێشێ
ئــەمــەنــد بــۆ منــداڵ جــەرگی ئــەیێشێ
خــوا خــۆی بــە دوژمــن نــاوی بــردوە
دنیــای بــە ئــەولاد ڕاگــیر کــردووە



مــارو دووپــشک و زەردەوالــەو مــێش
هـاوین دەسـت ئـەکـەن بـە ئـازارو ئـێش
زســـتانان زۆریـــان ئـــەچنـــە کونـــەوە
چـەنـدێ لـە یـەخـەی عالـەم ئـەبنـەوە
مــاری پێــداو دووپـــشکی مـــەلعـــوون
لە هـەر چـوار فـەسلا وا پێمـان فێربـوون
لــە پــڕ چــزەمــان لــێ هــەڵــدەســێنن
بـــە ژانی ژاریـــان دڵـــمان یێـــشێنن
بــا وجــوود ئێمــە بــەوانــە فێــرین
بـە خۆشـی خۆشـی هـەڵـیانئـەبژێـرین
حکوومەت وەک شوان گورگ ئەتەرێنێ
مەڕ دووی ئـەکـەوێ خـۆی واز ناهێنـێ
وتمـــان خوێنـــدەوار پارێزگـــارترە
ئـــەوی خوێندوویــە بــارەی خۆشـــترە
بـە حوشـتریان وت خـوا کـوڕی دایتـێ
وتی بــە مــن چـی بـێبـار نـیم سـاتێ
لـەگـەڵ ئـەم دەردەیـش ڕوانیمـە دنیـا
وەنـــەبـــێ ئێمـــە وابـــین بـــە تـــەنیـــا
دنیــا بــە جـارێ وەهــا تێــکچــووە
شـێواوە ئـەڵـێی خومخانـەی جـووە
ئێمــە لــە گــەلــێ جێگــا چــاکترین
قـەلـەباچکـەیـن بـۆ شـەیتـان شـاترین



چۆلـەکـە ئـەنـوێ شـەو لـە کولانـە
هـــەمیـــشە ڕووی پێـــی لـــەئاسمانـــە
ئاسمــــــان ڕووخـــــا بیگرێتــــــەوە
کـــــە دەستیـــــشی شـــــکا بیگرێتـــــەوە
هـەنـدێکیش دەڵـێن نووکـە بـەردووخـێ
لە ئاسمان گیرکەین سووکێ ئەڕووخێ
منـیش دەسـت ئـەگـرم بـە کلاومـەوە
لـــــەدووی بـــــابردوو زۆر خولامــــەوە
نـــەغمـــەی وەتـــەنمـــان پاپاغانییـــە
هـــەر بـــەزوبانـــە لـــە دڵدانییـــە
هـەیـە قـازانجی هـەر بـۆ خـۆی ئـەوێ
ئـەگـەر بـێو جـارێ بـۆی ڕێنـەکـەوێ
ئـــەڵـــێ ویرانبـــێ منیـــشی تیـــا بم
کـە خـۆم لێـی نـەخـۆم بـۆچ بـە هیـوا بم
هیوایـشمان هـەیـە خـۆی بـە برسـیەتی
هـەڵـدەکـاو تـەنهـا هـەولـی گـەلیـەتی
هـەڵـدەسـتێ ڕێـی چـاک بدۆزێتـەوە
ئێـــل لـــەبـــەر بـــاران بگوێزێتـــەوە
بـە پـەڵ بـەرئـەبنـە سـەرو گـوێلاکی
خراپـەی ئـەڵـێن لـە بـریتی چـاکی
چـــاری ئـــەم دەردە خوێنـــدەوارییـــە
ئـــەگینـــە نـــەزان دەردی کارییـــە



سەرکەوتن بۆ جێی بەرز چەند گرانە
هاتنە خوارەوە هێندە ئاسانە

کە بەرزبوویتەوە هەوادار ئەبی
لە پەستیدا بێ هیوادار ئەبی

هەوا کەوتە سەر پێی بایی ئەبێ
بایی بی لای خوا پوولبایی ئەبی

دە ساڵ ڕەنج ئەدەی دۆستێ ئەگری
بە ساتێ وای لێ ئەکەس ئەگری

بە تکەتکە گۆزە پڕ ئەبێ
کە بە قلپ ڕژا کوتوپڕ ئەبێ

کە بە ڕەنجی شان چشتێ پەیدا کەی
هەڵناگرێ شەنو کەوی تێداکەی

ئەوی دەست کەوێ بە بادی هەوا
بایەخی نیە بە فیڕو ئەڕوا

دوو کەلیمەیە دەوی هایوهوو
ئەوی بە هوو هات بەهای لەدەست چوو

ئەمانە واتەی گوێ ئاگردانە
ئێستا دەور دەوری تۆپ ئاگردانە

ئەبینن دەوڵەت ڕووی کردە کەسێ
عەقڵ و حیکمەتی تیا دەحەبەسێ

هەیشە بە زۆری شەقی ئەخورێ
بەو شەقە حەقی بێدەست ئەخورێ



پایزمـان بـۆ هـات بـۆ گێیـە خـواردن
هـەنـدێکیش پـارووی یـەکتـر ژمـاردن

دوای گێپـە کـەشـکەک نـەریـتی کۆنـە
کە بـەفـریش بـاری دۆکـەشـک‌و ڕۆنـە

ئــەم دوو خۆرایــە خــۆڕایی نیــە
کـەم دەسـت ئـەیزانـێ مـەسرەفی چیـە

ئیمـام بـاییـلدی هێنـدەی تـێنـەچـوو
لـە تـاوا ئیمـام لـە سـەر خـۆی ئـەچـوو

کەشکەکیش ترێ ڕەشکەی پێ ئەوەێ
ئـەمانـە بـۆ مـن چـۆن ڕێـکئـەکـەوێ

کەشکەک و گێپە بۆ دەورێ خۆش بـوو
کەس‌و کار بۆ یەک دڵ بە پەرۆش بـوو

ئێـــستا برایــــی بــــڕاوەتــــەوە
چــــرای دڵڕوونی کــــوژاوەتــــەوە

ئـەیـشخواو پێـت ئـەڵـێ لـە بـاتی چاکـە
مــوێی لــە بــەراز بێتــەوە چاکــە

هـەرچـی ئـەیبـینی هـەتـا حـەیوانـات
بیلاوێنیــــەوە ڕووئــــەکاتــــە لات

ئــەم بنیــادەمــە هیومــان تیایــە
خزمـەتی ئـەکـەی ڕەنجـت بـەبایـە

ئــەگــەر ئــایینی ئیــسلام بگــرین
وەک بـراین ڕەخنـە لـەیـەکتـر نـاگرین



ئەم چەرخە زۆر جار چەرخی ئەگۆڕێ
بــە قومارـبــازی مــەردی ئــەدۆڕێ
بــە جــارێ زۆردارئــەخاتــە مــەیــدان
پیـاوی بـە نـامووس ئـەکـەنـە گریـان
پــاروو لــە دەمــی هــەژار ئــەفــڕێنن
مالـی زۆر کـەسـی بێدەسـت ئەڕمێنن
هــەرچــیش کــە لــەوان کۆئــەبێتــەوە
سـەرو گـوێلاکی خـەلـک ئـەکوتێتـەوە
ئەوان زولـم ئەکـەن خوا فەقیر ئـەگرێ
بــە زولــمی ئــەوان نــانو دۆ ئــەبــڕێ
نانمــان ئــەبێتــە خــەپلــەی داروجــان
نانــەوا ئــەبنــە شــیبری بــێ ئامــان
ئـاگری تـەنـدووریان وا لـە پێش چـاوە
جـەهـەنمیـان هـیچ لـەبـیر نـەمـاوە
نانێ کـە هـەژار بێ (پێخۆر) ئـەیخوارد
پڕیـە لـە کـەپـەک، هـەویرێکـی سـارد
بـەلـەدیـە هـات بـە ئـەهـەمیـەت
فــڕنی دانــاو کــەوتۆتــە هیمــەت
لــەگــەڵ چاوێکیــان لــێ غــافڵ کــرا
بــە کونــەبانــا گــاجووت ســەخــرا
بەم ڕەنگە پاشقول لەیەکتر ئەگرین
دیــسان لــە گــەلــێ ولات چــاکترین



چەند خۆشە مەردوم ئینسانی ناو بێ
بە تەنها ماڵە گلێنەی چاو بێ
یوسف لە کاری خوادا ئاڵابوو
هەر هێندەی خۆش بوو کە لە چاڵا بوو
من ڕۆژی حەشرم بۆیە لا شەوە
کە دیسان تێکەڵ بە خەڵک ئەبمەوە
ئەلەکتریکمان کەوتۆتە نۆرە
بۆیە ئەمەندە تالبی زۆرە
بەری دوو برابەربوونە هەرا
ئێستا دوو برا بوون بە دۆ برا
تاعوونو وەبا پێکەوە هاتوون
هەردووکیان لە دەست ... هەڵاتوون
ئەوان بە جووتە بەرییان ئەکەن
بۆسەر ئەوانەی سەرپێچی ئەکەن
کەوابێ ئێمە لێیان ناترسین
برسیش بین دیسان هەر بە ڕاو پرسین
ئەو جووتە هەرچەند جووتەوەشێنن
چوارەی لای ئێمە ئەوان ئەشکێنن
قسە هەزارە و دوانی بە کارە
(وەبا) بێو با بێ مەرگ بۆ هەژارە
خواستی خوا وایە پیاوی دەوڵەمەند
قەزای ئاسمانیش پێی ناخاتە بەند



چـاوو نـاوو ئـاو، ئـەم سـێ ئـەشـيايە
وا دەرکـــەوتــووە تــەســيريان تيايـــە
چاوەی پيس لەگـەڵ بـە کـەسـێ هـەڵات
دەس بە جێ خۆشیو ساغيی لـە هـەڵات
ناويش لە ڕێوبان (الياس)ت تووشهـات
ئيتــر بزانــە کــەوتيــە ڕيــی نــەهــات
ئــەورەحمــان پاشــای حــاکمی بابــان
بــۆ بــەغــدا ئــەچــوو بچێتــە ديــوان
(ئەلياس) ناوێکی لـە ڕێ تـوش بووبـوو
لــە قــاپيی بــەغــدا هاتــەوە نــەچــوو
دوايــی زانيــووی ئــەگــەر بچوايـــە
قـــەرار درابـــوو کـــە بگيرايـــە
ئاوی هـەنـدێ جێيش ئـەوەی ئـەينۆشێ
تــەبيــاتی تونــدە گێچــەڵ ئــەفرۆشــێ
ئــاوی شــەقــلاوەو ئێــرەو حــەمــامۆک
لــە نــاو خۆيانــا ئــەبــن بــە نــاکۆک
بـــۆ لاوە، لاون زۆر بـــە پيـــاوەتـــين
تـەنهـا لـەگـەڵ يـەک دوژمـن بـەقـين
جگــە لـــەم ســيانە هيومـــان تيايـــە
هــەر دەرمـاڵـێ چـوون فيتنـەو هـەرايـە
مــەشــهووره ئــەڵــێن: لێــرە ئــەتــڕن
نـانو دۆی خزمـی کـەرکـووک ئـەبـڕن



هەڵدەگرێ بیمە منەت باری «جوو»
کە ئەم وەحدەتەی پێ خستینەڕوو
عەرەب و کوردو تورک کە یەکخرا
هەروا بڕوانە «جوو» تێی هەڵدرا
نیفاق بەربوویوە سەرو گوێلاکمان
جوولەکەیش چاوی بڕیبوە لاکمان
ئێستا لاواتمان وەک شێری ژیان
بە دەنگی دلێر هاتوونە مەیدان
ئەم قەومەی کە خوا دەربارەی ئەوان
فەرمووی یەک بە (دە)» بۆ ڕۆژی مەیدان
چۆن لە ڕاستی (جوو) ڕوو وەرئەگێڕن
لە خەیبەرەوە بەوانە فێرن
ئێمەیش نەتەوەی (سەلاحەدین)ین
خۆمان بەو ناوە لایق ئەبینین
جیهان «قودس» پەیڕەویمانە
فیداکاریمان شەرتی ئیمانە
ئای لە عێراق و جۆش و خرۆشی
وا بۆ سەرشایی ئەچین بە خۆشی
هێجگار کچانمان هاتوونە غیرەت
ئەڵێن: جیهادی دەوری سەعادت
قەسیدەخوان و پێش لەشکر کچ بوون
عائیلەی (نەبی)یش لە لەگەڵیان ئە چوون



جووی گەڕی گەڕۆک لێمان کەوتە گەڕ
هەرا ئەخاتە ناو بەشەر بە شەڕ
نازانن ئەوەی کە پێی دەنازن
کەسیان خۆش ناوێ سیاسەت بازن
ئەمڕۆ جوولەکە ڕاست ئەکەنەوە
هەر بۆ ئەوەیە گرەو بەرنەوە
ئەگینە کێ بێ هیوای بە «جوو» بێ
ئابدەستخانەمان ئەبێ بۆ (....) بێ
هەموو دەولەتێک بە خوو و کردەوە
قەومی جوولەکەی تاقی کردەوە
خاسیەتێکی ڕاستی تیا نەدین
دەریان پەڕاندن لێیان کەوتنە قین
ئێمە ئەمەمان کە دێ بەسەردا
خوا ئەیکا دەستمان لە دینمان بەردا
ئێستاش ئەگەر بێ و ڕووبکەینەوە خوا
هەر لە پێشەوەین ناکەوینە دوا
ئەگەر لە سەر دین هەڵسین بۆ جیهان
(سەلاحەدین)ی کورد بێنینە یاد
بەگیان تێکۆشین بۆ دین وەک دوێنێ
گەرو تەشقەڵە وازمان لێ دێنێ
لە شەڕی پێشوو هێندە کوژراوە
هیچ کامیان هێزی شەڕیان نەماوە



دنیــا هــەر ڕۆژە ڕەنگــێ ئــەنوێنــێ
هیچیــشی لــە ســەر بــارێ نامێنــێ
ڕۆژێ هـــاوارە بـــاران نابـــارێ
کە باریش ئەڵێن غەرق بووین بە جارێ
هـەرکـەسـە لـە سـەر هـەوای خۆیـەتی
تــەنهــا هــەزارە باوکــەڕۆیــەتی
دەوڵەمەند وا ڕێی خۆی گرتوەتە پێش
هەندێکیش بوونە یابووی سنگ هەڵکێش
لـەگـەڵ هـەوسـاریان لـەسـەر دامـالا
لـەگـەڵ جـەردەدا ئـەکـەن بـە مـالا
گـۆزەو دیزەمـان تێکـڕا ئـەشـکێنن
ئاشـنـاو دۆسـتمان لــێ ئــەڕەجێــنن
هـەی بـڕێ کـابرای لـەخـشتەی بـردین
نـەوجوانـانی لـە دەسـت دەرکـردین
مـەنفـەعـەتێکـی خـۆی لـە نـاوا بـوو
بـۆ ئـەوە داینـی بـە گورگـان خـواردوو
ئـەولاوانـەی وا لـەکـیس ئێمـە چـوو
ڕۆسـتەمـی زاڵـیش وا ئـازا نـەبـوو
ئـەڵێن مارانگاز گوێچکـەی شل دەکـا
لـە خـشەی مـارو مێـروو سـڵ دەکـا
ئێمـە دوای ئـەوەی مـار پێـوەی داویـن
ئـەنجـا بـۆ دووپـشک زۆرتـر بـە تـاوین



گـەردشـی جیهـان ڕوو لـە چـەوتییـە
ڕۆڵەی ڕوو لە ڕاست هەڵس و کەوتییە

هـەرچـی دێتـە نـاو بـە گـەڕو گـوڕە
وەک قـەمـەی عـەجـەم بـە دوو لا بـڕە

ئەوانەی چەوت و خوێنڕێژن وەک شێر
ئـەیانبەستنە پـشت بـە جـوانو بـە پـیر

هـەڵیان ئـەکێشن دەمیان ماچ ئـەکەن
مەرەزەی عـومری پـێ سـەرپاچ ئـەکەن

هەر ئەو شێرەیشە کە دەست دوژمن کەوت
دای لە خاوەندی پێشووی سەری کەوت

هـەزار بـار ئـەڵـێن: شـێر بـێوەفایـە
کـە چـی، هـەر کـەچـی لـە بـرەودایـە

ئـەم کـەچڕەوییـەی ئـەم کـەچبینانـە
ئـەڵـێن: نیـشانەی ئـاخر زەمانـە

ئـەیـانگوت ئیتـر نـۆرەی جـەجاڵـە
بـە فیـشاڵ دەرچـوو ئـەم گڕوگاڵـە

نـەرسی کـەرەکـەی جـەجـاڵ خورمایـە
هـەر بـۆ خورمایـە خـەڵـکی لـەدوایـە

ئێمـە خورمایـشمان هـەیـەو نایکـڕن
لـە هـەر سـێ لاوە هـەر بـە نـەوت خـڕن

بـاوەگوڕگـوڕ شـەخـسەکـەی خۆمـان
ڕوونـاکی یـەکـت بـێ بـۆ خۆمـان



زۆر کەس لە ئاگر قازانج ئەبینێ
کەچی بۆ نەزان دەست ئەسووتێنێ
ئەوی بیزانێو بیهێنێتە کار
لە ئاگر ئاڵتوون ئەبا بە خەروار
ئەوەیش نەیزانێ کە چی پێ ئەکرێ
دووکەڵ و خۆڵو گەرمای پێ ئەبڕێ
گەروەیش بە سروشت وەک ئاگر وایە
خراپەو چاکەی وا لە بارایە
بەلام بەو شەرتەی بە عەقڵو فنوون
یا بۆ ماکینە یا بۆتەی ئاڵتوون
بە کاری بێنێ نەوەک بۆ خەرمان
پێی بسووتێنێو زبان بۆ خزمان
ئەڵێن: کە قەومێک ئاتەش‌پەرست بوون
ئەو خەرافاتە ئێستا بەرسەرچوون
ئایینی ئیسلام دیموقراتییە
موسوڵمانی راست رووڵەهاتییە
ئێمە عەقڵمان وەها بیبڕێ
لەملاو لاومان ئاگر ئەگرێ
وا چاکە وەک ئەو ئەسحابەی سەفەین
لە هەرا خۆمان بێ‌تەرەف لادەین
نانی موعاویەو نوێژی پشت عەلی
لە مەعرەکەیشدا (جلوس التل)



مانگی سەفەری ئەمساڵ زۆر تووش بوو
گێچەڵو شەڕو هەرامان تووش بوو
دەعوای فەلەستین وەک غەزای خەیبەر
جیهادی دینی هێناوینە بەر
لەم لایشەوە وا موعادهەدەیە
لە سیاسەتدا موزایەدەیە
گەڕەکی خوارو یۆنان بۆی دەرچوو
گەڕەکی ژووریش قەوامی تێکچوو
مەکتەبەکانیش کەوتنەوە غریو
سەر کێوی قافیش پڕی بوو لە دیو
دنیا کەوتبوە شەڕە کەڵەشێر
سەری جووجوولە ببوە کەللەی شێر
هەموو گێچەڵی مانگی سەفەر بوو
کولە چوارشەموو دوێنێ تێپەڕ بوو
ئیتر خوا فەتحی ئیسلامی هێنا
دیارە نامێنێ نەگبەت لە بەینا
دوای تەنگانە خوا خۆشی ئەنێرێ
هەندێ جاریش مەڕ بە گورگ ئەسپێرێ
خوا هیچ کارێکی بێ حیکمەت نییە
کەم کەس ئەزانێ مەبەسی چییە
بزانین چۆن ئەبێ ئەم ئازو گوێزە
ئاوی زۆر ئەوێ ئاردی بەپێزە



کە کار کەوتە دەست تەبیعەت مردوو
فاتیحە دادەن بۆ ڕوحی زیندوو
سەرم سوڕماوە لە کردەوەی خوا
زۆر مردوو بەشی زیندووان ئەخوا
هیوایش ئەبینی کە تێ هەڵچۆیە
بە بێ لێخورین خۆی سەرەڕۆیە
شوێنیوا هەیە کە ئاوی زۆرە
هیچی لێ ناڕوێ زەویەکەی شۆرە
خوا ئەگەر بیدا ئاوو ئەرازی
بیهێنە بەرهەم پێی دەبن ڕازی
ئەویش ئەبینێ مسکێن ڕەنج ئەدا
زۆردار نایداتێ بیستی لە سەدا
خوا بۆ ئەویشی تا سەر ناهێڵی
ئەمرێو بۆ مێردی ژنی جێدێڵێ
ئەمانە هەموو لە پێش چاومانە
تەماع بۆ چاومان بووە بە تانە
لەو ڕۆژەی کە خوا دنیای داناوە
هەر بەش خوراوی بۆ هەژار ماوە
خوا لەوەو دنیا (تۆڵە) ئەسێنێ
هەرچی کە کۆن بوو کەڵکی نامێنێ
ڕاستت پێ بڵێم سەبر زۆر تاڵە
خۆ ئەڵێن: سەبری خوا چل ساڵە



زەروو کە خوێنی پیسی پیاو ئەمژێ
لە مارچاکترە بە ژار ئەکوژێ
خۆ هێجگار دووپشک لە کردەی بەدا
هەرچی هاتە پێش پێیەوە ئەدا
لەم دوانە بەدتر بەنی ئادەمە
وەزندمان بۆ یەک بە دەستو دەمە
بۆیەکێ نالێم کەس گوێی لێ بگرێ
ئەم ئاگرە تا بێ زیاتر گڕ ئەگرێ
باقل ئەم جارە ئاگری زەردەشتە
مووشەدەمەکەی شێوی بای وەشتە
وا دەردەکەوێ ئاخر زەمانە
چونکوو دەورێکە باوی ژنانە
کە پیاوان ڕیشو سمێلیان تاشی
من وتم ژنان ئەبنە یێگباشی
دەمێکە بە دڵ من چاوەڕوانم
چونکوو من ڕەسمەن کوێخای ژنانم
وا جینسی خەشین سەرو دەست ئەبڕن
هەر جینسی لەتیف دڵنەرم ترن
کە ژنان دەستیان گەیشتە کوتەک
پیاوان ناچارن بچنە بەر خەرەک
هەلی هەلهەلەی کچانمان هەڵکەوت
سەردارو سەرەک وەک بێسەری کەوت



هـــەر بـــڵێی ئـــەزم وا هـــەڵـــدەبـــەزم
هـــەمـــوو شـــەویکـــت نابـــێ بـــە بـــەزم
(پیروەیسی خلک) ئەیگوت سەردەمێ
مێ بووگــە وە نێـر، نێـر بووگــە وە مـێ
خـــوا ژنی بـــە ژن دروســـت کـــردوە
مـــاڵو زاوزێـــــی پـــێ ســـپاردوە
موویـــان درێـــژە عـــەقـــڵیان کورتـــە
ئیتـــر چیانـــە لـــەم جـــرتوفرتـــە؟!
ئەوەی لـە کـاری خـوا ڕەخنـە ئـەگـرێ
هەر دەردی سـەری‌و شـەڕی پێ ئـەبڕێ
ئێمـــە هـــەر بـــەوە ماڵـــمان وێرانـــە
کلکـــی تـــەورەکـــە لقـــی خۆمانـــە
خۆشـــە ڕوویـــەڕوو دوژمنـــت دیـــار بـــێ
نەک بە دەستی خـۆت پێت برینـدار بێ
بـــۆ ئـــازادیی گـــەڵ مـــردن شـــایە
لـەگـەڵ خـۆ هـەرچیـت کـرد خۆڕاییـە
ئـەمانـەی خۆیـان کـردوە بـە گـەورە
دنیـــای دینـــارە تێکـــڕا بـــە دەورە
سـا خـوا لـەمانـەی گیانیـان فیـدا کـرد
بـەیـداخی بـەرزی گـەلیـان بـەرپـا کـرد
هێنـدێکی وامـان بـۆ پـێ بگـەیـەنـێ
میللـەت لـە چنگـــی زۆردار دەرێنـــێ



دەستەی کاربەدەست لێیان بوو بە (خوو)
وەک دووبەرەکی لێک کەوتوونەڕوو
هەرکەسێ لە پێش خۆی دانرابێ
ئەبێ ئەو لایبا، ئەگەر برا بێ
پیاوی خۆی دێنێ بۆ سەر ئەو کارە
ڕاستە کە بزن شیری بۆ کارە
پیاو ڕماندنیش هێندە ئاسانە
سێ حەرفا سێ بەردی دەستی ژنانە
(ف) و (ص)و (ل)ە مەرگی ئەم فەسڵە
بۆ هەندێ فەسڵە بۆ هەندێ وەسڵە
بیست ساڵ لەمەوپێش پەندی پێشینان
ئەم پیشە حیزهی خستبوە مەیدان
«فرە مێرد بەریبۆ تایەتەبەر
بریسی یاپەر، ئەوبەری بۆ زەر»
ئیتر ئەمەک عیلم و ئیقتیدار
ئەو سێ بەردەیە کە ئەکرێتە کار
ئەوهیە دەردی ئەم مەئموورانە
ترسی دواڕۆژو هەوڵی گیرفانە
دەردی گرانتر کە گرانییە
بەوە مەعاش‌خۆر گیانی‌تیا نییە
هەرچی ئەیکرن بوو بە یەک بەچل
مەعاش زیاد ناکا تەوقی چۆتە مل



خـوا فریـشتەی وای سروشـت پـێ داوە
نیـوەی لـە ئـاگر نیـوەی لـە ئـاوە
زۆری‌وا هـەیـە کـە بـاوەڕ ناکـا
مـن لـەمـە ئـەدوێم لـەگـەڵ پیاوچاکـا
ڕۆژێ کابرای جاف کە پێـی پەتی بـوو
دڕکێکـی لـە بـن پـێ هـەڵـچەقیـوو
هاوڕێکـەی گـەیـە فریـای دەسـت‌وبـرد
دڕکـی دەرکێـشاو لـە پێـی دەرهـاورد
پرسـی ئـابرا! توخـوا پـێم بێـژە
ئـەم دڕکـە بـە چـی ئـەمـەنـدە تێـژە؟
وتی بـێ‌فـەڕ تـۆ شـێتی‌و گێژوویـژ
کە خوا فەرمووی تێژ گشتی بووگە تێژ
چـەنـد خۆشـە ئینـسان بـاوەڕی وا بـێ
بـێ ڕەنگاندنـەوە خـوای لـە لا خـوا بـێ
بەڵێ خـوا هـەنـدێ پیـاو دروسـت ئـەکـا
کە بە چاووڕاو (بـسمارق) پـەسـت ئـەکـا
خـۆی وا ئـەداتـە قـەڵـەم وەک کوێخـا
کـە شـوێنی کـەوتـن میللـەت سـەرئـەخـا
تا هەندێ لاوی خوێن گەرم هەڵـدەستن
بـۆ فیـداکاری کۆمـەڵ ئـەبـەسـتن
هـەر ئـەمـەنـدەیـە تـا ئـەو دێتـە نـاو
ئیتـر کـار تـەواو ئێلـیش بـەش خـوراو



ئـەوانــەی کــەوا کاریــان بــە دەســتە
کە هـات لـە ڕەئیا بـوون بـە دوو دەستە
ئەگەر هـەردوو لا بـۆ گـەل خێرخـوا بـن
هیـواداری ڕاسـت بـە خێـری خـوا بـن
بـە حوسـنی نیـەت کـار ئـەبـەنـەسـەر
درەخــتی ئــەمــەل بۆیــان دێتــەبــەر
فـەرمـووڕەی (نـەبی) بۆمـان حوججـەتـە
کـە ئیختــیلافی ئوممــەت ڕەحمــەتــە
بـەلام غـەرەزی شـەخسی کـەوتـە نـاو
ڕەحمــەت زەحمــەتــە دراومــان دۆڕاو
من لاوی وام دی کە (شەشی ئـەیلـوول)
بەردەرکی سەرای کـرد بـە گـەردەلـوول
مـەتـەرالیـۆزی بـە خـەنجـەر شـکاند
ئازایــــەکـــــی شـــێرانەی نوانـــــد
ئـەوکـەسـەی خۆیـان بـۆ دا بـە مـردن
ئەو بە دەستی خۆی کـەلـەبچەی کـردن
شـینم بـە شـیعری ئـەکـرد ئـەوسـایە
ئێــستەیــش گریــانم وا لــە قوڕگایــە
کــورد تابڕێتــەوە خــەیاڵــی خــاوە
بـەراتی نـەجـات بـە خـوێن نووسـراوە
مـن بۆیـە ڕەنگـی سـوورم خـۆش ئـەوێ
مـژدەی شـەفـەقـی لـێ دەردەکـەوێ



زەمانـــەیێکـــە کـــار بـــە زوبانـــە
تیغمـــان زوبانـــە چـــەوری هـــەسانە

دەســـتو زوبـــانی پـــاک بـــێ زیانـــە
بـــــەد زوبانییـــــە ئافـــــەتی گیانـــــە

هـــەر، هـــەرو گیـــڤە، هیچـــەو پـــروپووچ
لـــە پـــڕ خـــاوەنـــدی ئـــەخـــا لنگـــەوقـــووچ

درۆزن چـەرمـی ڕووی هێنـد ئـەستوورە
درۆشـــی ئـــەگـــرێ ئـــەو بـــێ فتـــوورە

ئـــەو جـــارێ درۆی لـــێبـــووە بـــەخـــوو
پێـــی تـــەرک نـــاکرێ بیـــشکەویتـــەڕوو

(پواســـون داویـــب) یـــەکـــی نیـــسانە
هـــەمانـــە هیـــوا، پـــڕ بـــە هـــەمانـــە

دوور نییـــــــە دەوری درۆ بگـــــــۆڕێ
ناڕاســـت گـــۆڕ وایـــە بیخـــەیتـــە گـــۆڕێ

دەرگـــای درۆمـــان دروومـــان بکـــرێ
درەخـــتی هیـــوا بـــەرمـــان بـــۆ بگـــرێ

ئـــەمـــڕۆ بـــە حیـــساب چلـــە تـــەواوە
شـــینەکـــەی خـــاتوو زەمهـــەریـــر مـــاوە

ئێمـــە لاوانمـــان هاتوونـــە مـــەیـــدان
خوایـــار بـــێ لامـــان بـــەهـــارە زســـتان

بـەردیکیـش ئـەدەیـن لـە (بـرد العجـوز)
ڕزگارمـان ئـەبـێ لـە دەسـت نـازونووز



ئـەمـە پـەنـدیکی بـاوو بـاپیرە
کـە ئـەڵـێن خـاکی وەتـەن دڵـگیرە
بـەلام هـەنـدیکی‌تـر وتوویانـە
ئـەم واتـەیـەشـم لـەلا زۆر جوانـە
ئەو شـوێنە خۆشـە کـە دڵ لێـی خۆشـە
دڵ تەنـگ بێ باخی (ئیرەم)یش بۆشـە
کـەوابـێ خۆشـیی جیهـان بـۆ دڵـە
زەوقـی ڕۆحیـشت بـە دڵ حاسـڵە
هـەنـدێ کـەس دڵـی وا بـە پـارەوە
ئـەچرووسـێتەوە بـۆ لـەپـارەوە
دڵـی هێنـد پـڕە لـە دەردی پـارە
لـە یـادی قـەوم قیلـەی بێـزارە
عـەشـقی نیـشتمان لای ئـەفـسانەیـە
بـۆ چـرای زەردی زەڕ پـەروانـەیـە
هـەنـدیکیش هێنـدە دەماخیـان بـەرزە
بـۆ وەتـەن فیـدای ڕۆحیـان لا فـەرزە
سـەرتاپـای لـەشیان پڕیـە لـە غـیرەت
نـەرەشـێریکن ئـازاو بـە هـەڵـمەت
لە مەرگ ناترسن کە هاتنە سەر قین
نـامرن لـە دڵـی میللـەتدا دەژیـن
میللـەتێـک ڕۆڵـەی وا بـە کـاری بـێ
هـیچ کـەس ناتوانـێ بـەرەنگـاری بـێ



تاڵیو شیرینی لێک جوێن ئەم دوانە
یەکێ بۆ دەمە، یەکێ بۆ گیانە
ئەوی بۆ دەمە بە چاو ئەیبینی
کە چێشتت دیارە تاڵیو شیرینی
بەڵام ئەوانەی کە وا نابینرێ
جوابی ناخۆشە لە دەم ئەبیسترێ
ئەسڵ ئەوەیە کە ڕۆح تاڵ ئەکا
بە ئازاری گیان پیاو بەدحاڵ ئەکا
ئەگینە ئەوەی کەوا ئەپچێژی
تفی کەیەوە تاڵ بێ ئەیرێژێ
برینی نێزە دەرمان ئەکرێ
برینی زوبان جەرگت ئەبڕێ
جوێنی بێگانە کەمتر کار ئەکا
توانجی دۆست دڵ بریندار ئەکا
کەواتە دڵی دۆست مەڕەنجێنە
زانیت توورە بوو وازی لێ بێنە
دۆست کە دڵسۆز بێ ئەو واز نایێنێ
دۆستت ئەوەیە کە ئەتگرێنێ
بەڵام هەموو دەورانە دەورەی تازەیە
دەوران دەورانە دەورەی تازەیە
ئێستا هیچ کەسێ گوێ لە کەس ناکا
تەنانەت فرزەند لە باب بێ باکە



کوفرەحمەد شەڕیە لە سەر کەرو گا
لە کردەوەی خوا هیچکەس تێ ناگا
کێ بە عەقڵی خۆی نانی خواردوە
داناکەی خۆشی ڕابواردوە
«هارونالرشید» میسری بۆ گیرا
چشتێکی سەیری هاتبوو بە بیرا
وتی: فیرعەون چۆن داوای خوایی بوو
تەنها بەم موڵکی میسرە بایی بوو
لەو قینە میسری بە (خضیب) سپارد
یەکێ بوو بۆ ناو گاگەلیان ئەنارد
ساڵێ بەر (نیل)یان کردبوو بە پەموو
(نیل) گەڕایەوە خەسار بوو هەموو
هاواریان بۆ برد دەستەی زەرەرمەند
وتی خوریتان بۆچی لێ نەچەند
ئێستا هەڵکردی جیهانی دوانە
یەکێکیان خەمە، یەکێکیان نانە
هوشیار غەمبارە بێعار پارەدار
تۆ مەڕوانەرە عەقڵو ئێختیار
من بۆیە (ئەحەی جاوم) خۆش ئەوێ
کەللەی هێند ڕەقە بە هیچ نانەوێ
کە کەوتیتە ڕێ بارمان زۆر سووکە
ماڵو دەوڵەتمان لە لا مەهتووکە



هەتاو بێ‌و باران ئەوە گورگ ئەزێ
بەهارەو گەرای ناوە ماسیی زێ
پشیلەیش حەوت ماڵ بێچووی ئەگێڕێ
کە چاوی پشکووت گوێبەند ئەگێڕێ
دوای ئەوە ڕاوەمشکمان بۆ ئەکا
بەڵام خۆی ناگرێ لە ڕاستی سەگا
هەرچەند سەگ لە ناو ماڵا گڵاوە
زۆر جاریش وەفای لێ بینراوە
ئەم سەگ‌و گورگ‌و پشیلەو مشکە
ئەم زەردەواڵەو مارو دووپشکە
کەس نازانێ خوا بۆچی خەڵک کردوون
بڵێین هێندێکیان مێملی مردوون
خۆ هیچیان لەگەڵ یەکتر هەڵناکەن
زۆر پیای سپڵە دوژمنی چاکەن
ئەمە خووێکە خوا بۆی داناون
بە قەستی بەگژ یەکا کراون
مەبەست ئەمەتە کە وابزانی
ئاشتی تیا نییە جیهانی فانی
کێ لەگەڵ کێدا بە ڕاستی دۆستە
ئەم ڕاوە ڕێویە هەمووی بۆ پۆستە
لەگەڵ ئەوەیشدا ئەزانین وایە
دینمان دائەنێین بۆ ئەم دنیایە



بەهار هەر ڕۆژە ڕەنگێ ئەنوێنێ
هیچ جارێ لە سەریارێ نامێنێ
گاهێ وەک دەرویش هەور ئەهاڕێنێ
گا بە سەر هارا خۆڵ ئەبارێنێ
وتمان نیسانەو باران ئەبارێ
تنۆکی لە چاو نایێتە خوارێ
درۆی (نیسان)یش ئەمساڵ کار ناکا
هیچ کەس نازانێ بۆ کام لا ڕاکا
لایی بە لافاو پیاو ئەخنکێنێ
ئێمە بێ‌ئاوی ئەمانخنکێنێ
برسیەتی چاکە گژو گیا ئەخورێ
بەلام تینوەتی چاری ناکرێ
جاران ئەچوونە نوێژە بارانە
ئێستا بێ‌تۆبەی گوناهبارانە
کەسیش باوەڕی بە خوا نەماوە
لە شوێنی تەوبە سین و تێ باوە
چەندێ کەوتینە سەر یاریی پۆکەر
هەرچیت ئەبینی بووبوو بە جۆکەر
ئێستا کاربەدەست کەوتوونە دامە
هیچکەس نازانێ ڕێ‌و شوێنی کامە
وەک داشی دامە مەئموور لێ ئەخورن
بە ئازو بە گوێز هێزیان لێ ئەبڕن



کە شێرت خستە سەر ئاگری گڕ
بە جۆش هەڵدەچێ‌و ئەڕژێ کوتووپڕ
هەر قەیماغێک‌و توێژی لەسەرە
کە نەما ئیتر نابێ بە کەرە
دۆکەڵیویش تێکی نەدەی ئەبزڕکێ
ئاگری بن کایش هیچ دانامرکێ
ئەو کەسەی ئاگر ئەخاتە بن کا
وەبزانە خۆیشی بە دووکەڵ خنکا
فەرمودەی خوایە گوێی لێ ڕاگرە
فیتنە لە کوشتن بەشیددەت ترە
هەر منداڵێکی لە دایک ئەبێ
لە سەر فیترەتی ئیسلامی ئەژێ
دوایی دایک و باوک دەرسیان دائەدەن
بۆسەر ئایینی خۆیانی ئەبەن
هەندێکیش کە وا بە گیانێکی پاک
خولقاون ئەڕۆن لە ڕێیەکی چاک
بەدکار بە قسەی لووس تەفرەی ئەدا
لەگەڵ خۆی ئەیبا بە ڕێگای بەدا
ساخوا ئاگرێکی وای بەرداتە ماڵ
خۆی‌و گشت کەسی بن بە کۆی زوخاڵ
ئەوەی کە خولقی دڵ ساف ئەگۆڕێ
خوا لە ناوی‌بات بیخاتە گوڕێ



ڕۆژی درێـــژی بــــەهـــار هاتـــەوە
وا ڕۆژی ئێمـــەیـش هـات بـە هاتـەوە
شـەوی تـاریکی زسـتان بـەسـەرچـوو
بەرخی هیوامان لە دەست گورگ بەربوو
گورگـــە شـــینەکــە وای ڕاوەشـــاندین
بـەنـدی بـەنـدەیـی بـەخـتی پساندین
بـە کـەیفـی خۆمـان لـە کوردسـتاندا
ئـەگـەڕیـین بـە نـاو گوڵـی نیـساندا
بـــەڵام ئاگامـــان لـــێ بـــێ کـــە زوورە
تـــازە وا درەخـــت گۆپکـــەی کـــردووە
دەست بە سەر چڵی مەبەن بۆ سەر چڵ
کــە گۆپکــەی وەری داخ ئـەبـەنـە دڵ
دانیـشن لــە نــاو گوڵــدا بــە خۆشـــی
بـــە پیرۆزانـــەو بـــە بـــادە نۆشـــی
لاوکــی کـــوردی بــڵێن بـــە قــەتــار
دەنــگ بداتــەوە لــە دەشــتو کۆهــسار
بەڵام هەر دەنگ خۆش کەم بڵێ نەک زۆر
گـــەڕەلاوژە ئـــەبـــێ بـــە گـــابۆڕ
ئـەگـەر هـەر سـەرێ کـەوتـە سـەدایـی
خۆمـان لـێ ئـەکـا بـە شـا گـەدایـێ
ئەو سایە هیچ کـەس هـیچ کـەس ناناسـێ
خــۆ هــەڵــدەکێـشن پــڕ بــە کراســێ



دێ مەرەنجێنە تووشی قین ئەبێ
بە دڵ ئازاری نائەمین ئەبێ
لێکی بەرەوە کە وا کەسێ هات
جنێوی پێدای چەند گرانە لات
دیارە ئەوکەسەیش دڵی ئێشێنێ
ئیتر دۆستی تێدا نابینێ
کە خۆت بە ئێشی دەرزی ئەناڵی
سووژن بە خەڵکا بکەی منداڵی
بە چاکە دڵی عالەم ڕائەگری
بۆچ خراپ بێو خەڵک لە دەستت بگری
هەر ئیشێ ئەکەی دوایی بڕوانە
پیاوی بێ غایە هەر سەرگەردانە
ئەگەر تۆ هەوڵت تەنها بۆ خۆت بێ
لەناو میللەتدا ئەبێ چۆن ڕووت بێ
کە لەگەڵ ئاوەڵ بکەویە کایە
هەرچی دەستکەوێ بەشی تۆی تیایە
ئەوسا ڕابوێرە بە دڵنیایی
لەگەڵ ئاوایی نەک بە تەنیایی
لە ناو یارانا ساتێ ڕابوێری
پوولێ نایەنێ پایەی وەزیری
وەزیریی ئێستا خەویکی کەمە
کە لە خەو هەستا تەمەو ماتەمە



تــوکاتــێ بچــۆ بــە گــژ یــەکێکــا
بتـــوانی تێکـــی شـــکێنی پێکـــا
کـــە دەرەقـــەتی زۆرداریێ نایـــەی
پــشێتە ســەر ڕێــت ئــەبــێ لێــی لادەی
جنێوفرۆشـــی لای مـــەردان عـــارە
شــەڕە جنێــوە ســوحبەت لــەم شــارە
جــەوادو قــەواد بــە شــێوەی میــسری
هــەردوو گــەوادن مــەعنــای کــە بگــری
هــەرچەنــد کــە نــاوی گــەواد بــەدنــاوە
لـــە دز چـــاکترە بۆیـــە وا بـــاوە
دز مالـــت ئــەبــاو دڵـــت یێــشێنێ
ئەو خزمــەت دەکــاو دوو دڵ پێــکدێنــێ
ئــایینی ئیـــسلام وا قـــاڵ کـــراوە
دەســـتووری وامـــان بـــۆ دانـــراوە
ئــەگــەر بێ‌و لــە ســەر ئــەو ڕێیــە بــڕۆین
هێند سەرئەکەوین نەزانین لە کوێین
خــۆ، ئــەگــەر یێتــوو ســەر دەرهــەوا بــین
تــا ئــەمــانێژن ئــەشــێ هــەر وا بــین
هێنــد دەرکــەنــارین ئــەوا لــەم پــەڕیــن
بۆچبە بلــوێری خــەڵــکی هــەڵــپەڕیــن
هــەڵــپەڕکێکــەیــشمان دووبــەرەکییــە
خــووی کۆنمــان شــەڕی ناوگــەرەکییــە



کاتێ کە وتیان بێستان بەرەڵدا
کوڕوکاڵ تێکڕا ئەیکەن بە هەڵدا
ئەگەرزرکێکی کاڵ بدۆزنەوە
پەلامار ئەدەن زوو ئەیقۆزنەوە
بێستاڕن گوردی خۆی لێ گرتووە
لە پێشدابەشی خۆی لێ بردووە
ئێستا پاشەرۆک گێچەڵ ئەگێڕێ
تێر بۆ برسی تێر سلاو ئەنێرێ
کە بێستانەوان ئەمە تێبگا
نامێنێ تاکو بێستان پێ بگا
بە ناهومێدی لە کولیوو کاڵ
هەرچی بۆ ڕێکەوت ئەیکاتە جەواڵ
پێچکەی دەرگاکەی حەوشەم سواوە
لە گرێژەنەی خۆی ترازاوە
هەرچی ئاژەڵێ کە مالا بوون
کردیانە قارە بە جارێ دەرچوون
بە گەدی گەدی ناگەڕێتەوە
خەریکن لە چەم ئەپەڕێتەوە
نالێن پاشەڕۆژ کە سەرما بزووت
هەلامەت ئەگرین وا بە سەری ڕووت
نازانین بەیتی گورگو مەڕ چییە
دووگی خۆم خۆش بێ خانووم بۆ چییە



لە ڕاستی خواو خەڵک ڕاستو دڵپاک بە
لە واتەی هەموو عالەم بێباک بە
تۆ کە ئایینی خوا ڕابەرت بێ
مەترسە ئەگەر قەستی سەرت بێ
ئومێدی دۆستی لە بەدخوو مەکە
ناگۆڕێ ئەگەر بیشچێتە مەکە
بۆ ئەو بەدبەختەی خولقی گۆڕاوە
خوێندن شووشەیە لێی بارکراوە
دەورێکە دەوران وا دەنوێنێ
ئیمان پشکۆیە دەست دەسووتێنێ
نیشان بەو نیشان بچۆ بۆ مزگەوت
چەند کەست بانگ کرد کەست شوێن نەکەوت
بەلام بۆ شوێنی کە پێشەی شەوە
تۆ دەریشیان کەی وان لە پێشەوە
هەنگوین شیفایەو ئارەق وەک زەهرە
کامیان کڕیاری زۆری لەدەورە؟!
خۆ هیچگار هەروا بە چاولێکەری
هەرچی ئەڕوانی داویەتە بەری
کەم کەس دەزانێ ڕێگای بۆ کوێیە
پێشینان ئەڵێن: سەیرە لە کوێیە
نالێن:حەیفە بۆ ئەم بالاو بەژنە
ئەڵێن: مەرگ لەگەڵ ئاوەڵان جەژنە



هـــەرچـــی کـــە زانیـــت ڕووبازاڕییـــە
مـــەیکـــرە ڕەنگـــی تـــەفـــرەکارییـــە
هـەرچیش کـە مـەیلـی بـە لاسـارییە
لێـی مـەگـرە ئـەوەی لـە بێکارییـە
بـەلام هـەنـدێکیان لـە بـەدخوویـە
کـــە وا کـــردەوەی هـــەر دووڕوویـــە
هـەنـدێ ئـەیناسـن کـە وا بـەاخوایـە
بە تەفرەی شەیتان خەڵکی لە دوایە
ڕۆڵـەی نازدارمـان ئـەخاتـە ژێـر پێـی
ئـــەوان بخنکـــێن بـــەرز بێتـــەوە پێـــی
لاوان خوێن گەرمن ئەوەند بە جۆشن
وائـەزانـن بـۆ گـەل تـێ ئـەکۆشـن
خـــوا ئـــەوە بگـــرێ ئـــەم دڵ پاکانـــە
تووشـــی شـــەڕ ئـــەکـــا بـــە بـــێ باکانـــە
لـــە ڕێـــی مـــرمیاوی کتـــکو داودا
لە بەغدا کەرگەل خۆی بە کوشت ئەدا
ئەم شەڕە لە سەر کورسیی دوو کەسە
مـن بـۆچ بکـوژرێم بـێ هۆشـی بـەسـە
هەر ئەوەندەیە گەیە سەر کورسی
لـــە دەردە دارو برســـیی نـــەپرســـی
ئەمین زەکی بەگ یا عەلی کەمال
وا بـــە خـــۆڕایی نیـــشتوونەتـــە بـــاڵ



گایەک کە کەوتە پەلە پێستانێک
ئەبێ بە جەزا تێکرا بۆ ڕانێک
بەلام بە چاوی ئینساف بڕوانی
خەتای ئەم ئیشە لە شوان ئەزانی
شوان کە ڕانی خۆی پێ داگیر نەکرێ
یەکێکی باشی لە جێ دائەنرێ
خوا بنیادەمی کە سروشت داوە
گەورەو بچووکیی ئەوسا دانـاوە
لە ئـادەمەوە بە پێغەمبەری
یەکێکی ناردوە لە شوێن ڕابەری
لەگەڵ ئەوەشدا ئەخلاقی بەشەر
هەر لە ئەزەلدا مائیلە بە شەڕ
چەند پێغەمبەری خۆیان کوشتوە
چەند پادشایان لە ناوبردووە
هەرگا ترسێکی حوکومەت لاچێ
وەک سمێڵ ئەویان ئەو هەڵدەپاچێ
هەر ئیجادێکی لە عیلم و فەندا
کە ئەیهێننە مەیدانی دنیا
هەر بۆ ئەوەیە یەکتر بکوژرێ
ئیتر حورییەت چی پێ ئەبێژرێ
ئەو ڕێی شەرعییە کە خوا داینـاوە
لێمان لاداوە، حورریـیەت باوە



ماران گاز ئەگەر جارێ بڕەخسێ
لە خشەی مارو مێروو ئەترسێ
پیاوی‌واش هەیە هێندە لاسارە
ناسرەوێ مەگەر لە پای سێدارە
وەنەبێ کە مرد لەکۆڵبێتەوە
ئیلی لەگەڵ خۆی ئەبڕیتەوە
یەکێ دێ ڕەنگی باغێ ئەڕێژێ
درەختی هیوا بە ئەرک ئەنێژێ
خزمەتی ئەکا هەتا بەر ئەگرێ
لاپلەرەسەنگێ لە پڕ ئەیبڕێ
کە دنیا بووە گاڵتەی منداڵان
ماڵی باوانمان ئەڕوا بە تاڵان
گەورەو پچووکی خوا خۆی داینـاوە
ئێستا واپارتی‌و تەحەڕرور باوە
قیبلەی قەدیمان لە دەست دەردێنن
دەرسی شیووعی‌و ڕووسی ئەخوێنن
ئەگەر ئایینی ئیسلامی بگرین
ئەبێ فەلەستین هەموو بۆی بگرین
ئەوەی کە پشتی (سهیۆنی) ئەگرێ
ئەبێ لە خوامان بوێ کە بمرێ
خوا کە عێراقی بە ئێمە داوە
چیمانە لە سەر پاسی جرتاوە



بۆ نەتەوەی چاک دوو چشتە ڕەهبەر
کە وا حەیانی پێ دەباتە سەر
ئەووەڵ تەربیەی دایکو باوکە
کە بۆ ڕێی تاریک وەک چراوکە
کە ڕابەری بوو ڕێی لێ گوم نابێ
هەرچەند ڕێی ژیان پێچو پەنا بێ
کە بە منداڵی تەربیە نەدرێ
بە گەورەیی خووی خراپان ئەگرێ
ئەوسا کە کەوتە سەر ڕێی بەدخووی
نەگەڕایەوەو لە سەری ڕۆیی
ئینجا حوکومەت ناچار ئەمێنێ
جەزای قانوونی دەرحەق بنوێنێ
ئەوەی تەربیەی ئەولادی نادا
هەموو ڕەنجی خۆی ئەدا بە بادا
ئەولادی بەدخوو کە بە شەڕ فێرن
جنێو بۆ باوکو دایکیان ئەنێرن
بێحەیالەککەی ڕووی کەسو کارە
کەچی بۆ ئێستە هیوا بە کارە
بێ نامووس یەعنی مێشولەی نییە
مێشی نەیێتێ کوڵلەی بۆ چییە
بەلام بێ شەرمی هەر بێ ئەنوایە
ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆی لە دوایە



چاکی‌و خراپی خۆ بە دەست خوایە
بەڵام سووچێکی بەندەیشی تیایە
چۆن ئەبێ بڵێن: خوا خۆی داینـاوە
کەچی جەزایشی لە سەر داناوە
ئافەریدەکار کە خۆی حاکمە
چۆن ڕێ ئەکەوێ بڵێن زاڵمە
خوا خۆی فەرموویە سروشتی خوایی
بۆ بەندەییە نەک بۆ کوێخایی
(و ما خلقت الجن و الانس)ە
بۆ پەرستشە نەک بۆ هەوەسە
ئێمە بە تەفرەی شەیتانی لەعین
خۆمان بەد ئەکەین لائەدەین لە دین
ئەوسایە هۆشمان دێتەوە سەرمان
(مەرنەمووکە گورز ئەدا لە سەرمان)
سا چی بکەم ئەوا ناوێرم بیڵێم:
زۆر نەشارەزا رائەپەڕن لێم
ئەگینە ئەمگوت باوکمان ئاوی ڕشت
سروشتیش بە ئیرس هات‌و پێی لێ خست
هەر ئەو ئیرسەیە بابیمان ئەکا
ئیستیغنا ئینسان لە ڕێ دەرئەکا
شوان کە سابرێتێ ئەلەوەڕێنێ
لەگەڵ تیری خوارد قۆچ ئەوەشێنێ



ئـــەوی بـــە هێـــزی قۆڵـــی ئـــەنـــازێ
زوو پـەکـی ئـەخـا سـەختیـی هـەورازێ
ئـــەوی کـــە بـــە بێـــشایی هـــەڵـــپەڕێ
وەک ئاشـی بـێدان بـۆ خـۆی ئـەگـەڕێ
بـەرداش بـێ بـاراش پـەکـی ئـەکـەوێ
کاتـــێ کـــە ســـوا بـــیرازی ئـــەوێ
چـەکـوش لـە گـەڵـێ ئـیش‌دا بـە کـارە
حـوکمی بـۆ کـەللەی فیلـی بـێ عـارە
کـەر کـە وتـت (وۆش) ئـەو ڕائـەوەستێ
نـەوەسـتێ خێـوی قـاچی ئـەبـەسـتێ
جاران ئـەچوونـە سـەیـران ئـەهلـی شـار
بـۆ سـەیـر پاشـایان ئـەکـرد بـە گاسـوار
ئێـــستا ئـــەو یاریـــە نـــەمـــاوەتـــەوە
شـــایی‌و ســـەیرانمـــان بـــڕاوەتـــەوە
بـــابی بابیمـــان وا لـــە ناوایـــە
حیکمـــەتی تیایـــە ئـــەم کـــاری خوایـــە
ئـــەوی گلـــەیـــی لـــە بـــەخـــتی خۆیـــە
پێـــی بـــڵێ دەوری کـــەوا بخۆیـــە
هـــەرزەچـــەنـــەیـــی کـــار ناباتـــە ســـەر
ئـەبـێ تـەسـلیم بـین بـە قـەزاو قـەدەر
بـــەڵام بـــۆ ئـــەوەی کـــە ســـەرەڕۆیـــە
کوتـــەک ئـــەزانـــێ قونـــاغ لـــە کوێـــیە



خـوا، ئێمـەی بۆیـە خـستە سـەر زەوی
لەگـژ یـەک هـەڵچین بـە بـێ بـەزەوی
لە لامان وایە کە یەکێ بۆ دێو زۆر ئەژین
عومری ئەویشمان بـۆ دێو زۆر ئـەژیـن
نـــازانین ئێمـــەیـــش نامێنینـــەوە
دوابـەدوای یـەکتـر قـلـپ ئـەبینـەوە
ئـەوەنـدەی هـەیـە ئـەوەی کـوژراوە
بـۆ ئـەوە دنیـا ئـەو خـوا پێـداوە
شەربەتی مەرگی لەمەو دنیا چەشت
بێترس‌و بێپرس ئەچێتە بەهەشت
ئینجـا وەرنـە سـەیـر ئـەم زاڵـمانە
بـە شیـشی ئـاگر ئامـان ئامانـە
ئـەیانـسووتێنن تـا بـە ئـازار بـن
مـردنیش نیـە تـا پێـی ڕزگـار بـن
ئـەوەی کـە فێـڵی دنیـایی زۆرە
بەشی خەڵک ئەخواو بە زوڵم‌و زۆرە
هـەروا ئـەمـەنـدە لێـکبداتـەوە
لێـان پرسـی، چـی جـواب ئـەداتـەوە
بڵێن پێت خۆشە تۆ بە ڕەنجی شان
نان پەیداکەیت‌و لێت سەنن ئەوان
دیـارە کـە ئـەوەی زۆری لـێ ئـەکـەی
لـە لای ناخۆشـە تـۆ ماڵـی ئـەبـەی



خۆزگە ئەمزانی ئەم ڕەشەبایە
کە هاوینان دێت بۆچ وا گەرمایە

کەچی زستانان کە ئەلرفێنێ
هێند بەتەوژمە گا ئەفڕێنێ

های شەماڵ خۆت و شەماڵت بژین
فێنکیی دڵە شنەت بە هاوین

شەماڵ خەرمانی پێ بە شەن ئەکرێ
ڕەشەبا کەڵکی کام ئیشمان ئەگرێ

تۆزی ڕەشەبا چاوی کوێر کردین
شەو لە سەربانا ئابڕووی بردین

بە هەموو بایەک ئەلەرینەوە
بە هۆرتەو بەرە ئەگەڕێنەوە

ئەم گێرەو کێشە لە بێکارییە
ماڵەومال گەڕان لە ناچارییە

ئەوی ئیشێکی بۆ خۆی پێکهانی
ناپەرژێتە سەر واتەی دیوانی

ئەوی لە ژنۆ ماڵی مەمنوونە
چی لە قومارەو ئەم توونەوە توونە

ئەوی بۆ قومار ئەچێتە جێیان
شەو ئەباتە سەر تا بەری بەیان

دیارە دەربەستیماڵو جال نییە
شەیتانیش لەدوا هیوا شەقییە



چاکـەو خراپـەیـش ئـەنـدازەی هـەیـە
کـەم کـەس ئـەزانـێ حـەددی تـا کـەیـە

ئەندازەی چاکەیـش کـە هـات تـێپەڕی
نابـەکـار تـا بـێ ئـەیداتـە بـەری

بـە خـۆوەنـەدیـو سـورمەی لـەبـەرکـەی
ئـەبـێ زۆر پیـاوی کاردیـدە دەرکـەی

ئـەسپی عـەرەبیـت دابـە گـۆلـی سـوار
سـەرکێشی ئـەکـاو بـۆی نایـەتـە بـار

هـەرچـی هاتـە پـێش تێـوە ئـەگـلی
دیـارە کـە دوایـی خـۆیشی ئـەگـلی

کاربـەدەسـت لـە سـەر تـەجرەبـە ئەڕوا
گـۆشـت بـۆ قـەسـابو نـان بـۆ نانـەوا

جـاران منداڵـمان ئـەنـاردە حـوجرە
فـەلاقـە ئـەکرابـە داری گـزرە

بـە مامۆستامان ئـەگـوت وەک دوژمـن
گـۆشـتی بـۆ تـۆ بـێو ئێسقانی بـۆ مـن

بـەڵام کاتـێ کێـرد گـەیـە ئێسقانی
جـەرگمان ئـەسوتاو دەرمان ئەهـانی

بـاوک بـۆ ئـەولاد هـیچ چـاری یـەیـە
ئـازاری هـەیـەو بێـزاری نیـیـە

کـاری تـەریـە ئـەنـدازەی ئـەوێ
لـە حـەد تـرازا پـەکـی ئـەکـەوێ



ئــاگرێ کــەوتۆتــە ئــەم جیهانــەوە
دۆســتیش ئــەســووتێ بــە بێگانــەوە
هـەرچـی کـە بـەرگـی مێردیـی لـەبـەرە
ئـەمڕۆژە هــەولـی قـەومـی لـەسـەرە
ئەگەرگشت لایی نەکەونە غیرەت
نـەکـەونـە فریـای وڵاتو عـەشـرەت
ئـەم گێـژەگێـژی تیـا ڕسـگار نابـێ
مـەلـەی پـێ دەوێ بـە هـاوار نابـێ
ئــەمــڕۆ پێویــستە کــە تــۆ تێکۆشــی
نـەک دوایـی بـەرگـی ماتـەم بپۆشـی
هـەتا تـەڕ نـەبووی ئەبـێ تێهـەڵچی
ئەڵێن پاش باران کەپەنەک بۆچی
خـۆت خوێنـدەواری کوڕیشت فێر کـە
نانـێ کـەم بخـۆ برسـییەک تێـر کـە
کە لەگەڵ عەشرەت کەوتیە هەرزانی
ئـەمـەنـدە بخـۆ هـەتـا ئـەتـوانی
ئێـستا ئاگامـان لـە خۆمـان نییـە
تـێناگـەیـن مـەکـری پیرێـژن چییـە
ئەگەر لێک بیڕین لە (ژین) ئەبڕین
ئـەبـێ بـزانین کـە وا لـە سـەر ڕێـین
لـە تـەنگانـەداین، دوژمـن بـەدبـەختـە
دەستی یەک بگرین، پلەکەی سەختە



ئـەلـف بۆیـە پـێش هـەمـوو حـەرفانـە
لـــووس و باریـــک و راســـت و رەوانـــە
ئـەوی کـە چـەوتـە بـووە بـە حـەڵـقە
یـا، بـۆ پـێ، پێوهنـد، یـا، بـۆ مـل تـەوقـە
دیـارە کـە رێـوی چـەنـد حیلـەکـارە
بـە داوی تـەڵـەی چـەوت گرفتـارە
ئـەوانـەی چـەوتـن گیـانلـەبـەر ئـەگـرن
خـوا، نـەیـداونێ کـە سـەر هـەڵـبڕن
چەند خۆشە ئینسان راست و سەربەرز بێ
نەک چەوت لە برین بە ترس و لەرز بێ
لقـی هـەر دارێ کـە وا خـوار رۆیـی
راسـت نـەبێتـەوە ئـەیبـڕێ خێـوی
مـار بـە گینگـڵەو بـە پـێچ ئـەخـشێ
کـە کـوژرا ئینجـا راسـت رادەکـشێ
ئەوی خۆی لە خەڵک بە فێڵ ئەگۆڕێ
گـۆڕ وایـە بیگـری و بیخـەیتـە گـۆڕێ
کاک ئەحمەد دوعای ئەکرد بۆ باجگر
نـەمـرێ و نـەبێتـە بـاجگر ئـەوی تـر
ئێسـتا بـاجگری پیـشەی رەسمیـە
کاسـبیی حـەلال روو لـە کـەمیـە
تـۆ واتـەی مچـە بـێمـەعنا مـەگـرە
گـەواد لـە جاسـووس بـێمـزەرەتـرە



هەر لەو ڕۆژەوە دنیا دانراوە
لەسەر تەجرەبە زۆر چەشت بێژراوە
یەکێ لەوانە ماڵو دەولەتە
کۆبوونەوەی لای دانا زەحمەتە
زۆر پیاومان دیوە بە فەزڵو هونەر
لەگەڵ زەمانا بۆی نەچوەتەسەر
ئەوەندەی نەبووە کتێبی بکڕێ
یا کەوایەکی شیرداخ بدڕێ
ڕوویشی لە پیاوی چرووک نەناوە
وایش ڕێکەوتووە کە برسی ماوە
لە پاش مردنی قەدریان زانیوە
ئینجا بە چاکە ناویان هانیوە
زەمانە وایە لەگەڵ پیاوچاکا
سەریەبڕێو ڕیشی بە شانە ئەکا
مەشهوورە ئەڵێن (هارونالرشیدن)
کاتێ میسری گرت تا پۆرتی سەعید
قولە ڕەشێکی دانا بە والی
پەموو چێنرابوو نیل هات ڕایماڵی
هاورایان بۆ برد زۆریان لێ توند بوو
وتی خوریتان بۆچ نەچاندبوو
گولوستان ئەمە ئەگێڕێتەوە
هەروا تاریخەو ئەگەڕێتەوە



کارشـــناس گـــەڕا شـــوێنی دانـــا
لـە شـوێنی نـەزان هـات دانـای دانـا
حیکمـــەتی (اعـــط القـــوس باریهـــا)
لـە گـەلێ کـارا دەرکـەوت دیـاریی‌دا
ئـــەودەمـــەی پیاویانلـــە دار ئـــەتاشـــی
ئیـــشیان نـــەئـــەدا بـــە پیـــاوی ناشـــی
دارتاشـــێ لـــە نـــاو کاروانێکـــا بـــوو
بـۆ سـەنعـەتی خـۆی بـۆ لادێ ئـەچـوو
جەردە هات لە ڕێ کاروانی ڕووت کـرد
لـەخـوا نـەترسـێ تـەشـویی ئـەوی بـرد
پیـــاوێکی‌تـــریش ســـەد لـــیرەی بریـــا
ئـــەوبـــاکی نـــەبـــوو دارتـــاش ئـــەگریـــا
وتیـان ئـەم خـەڵکە کـە ڕووت کـراوە
ســـەد ئـــەوەنـــدەی تـــۆ ماڵـــی بـــراوە
ئـــەوان نـــاگرین تـــۆ شـــینت چییـــە
وتی دەردی مـــن بـــۆ تـــەشـــوێ نییـــە
نـازانن بیـسوون دەمـەسـویی ئـەکـەن
ئابـڕووی سـەنعـەت‌و وەسـتایی ئـەبـەن
سەد جارمان نووسی کەس گوێی نەدایە
هـەر کـەس پیـاوی خـۆی دیتیتـە کایـە
پیاو بـۆ ئیش نییە هـەر ئیش بـۆ پیاوە
کـــاری دیـــوانی وەک خـــۆم شـــێواوە



ئـەڵـێن تـەنگانـە خۆشـی لـە دوایـە
بـاوەڕم هـەیـە فـەرمـوودەی خوایـە
بەلام سەبری خوا ئەڵێن چل ساڵە
مـن مانگـێ نـاژیم بـەم حاڵـە تاڵـە
خـۆ مـن تـەنهـا داخـی خـۆم نییـە
نـازانم خواسـتی خـوایی چییـە
بە جارێ باری نەگبەتمان بۆ هات
گـەرمـاو گـرانی ڕوی کـردە ولات
جوولەکە جاران هامانیان ئەکوشت
ئێستا لە عەرەب بەردیان گرتە مشت
سـاخەوداى عـەرەبتـۆ بیتـو قورئـان
وا بکـە ببیتـە جوولـەکـە قـڕان
جـارێ جارپـان دابـەراز بکـوژرێ
کـێ گوێچکـەی هێنـا پـارە وەرگـرێ
خۆزگـە جـارێکیش بـۆ جـوو ئـەدرا
لـەنـاو ئێمـەدا تۆیـان ئـەبـڕا
هـیچ بـاوەڕ مـەکـەن زەمانـە وابـێ
سووی تەڵە ڕیشیان لە بیر نەمابێ
ئـەوی کـە بـە جـوو ئـەکـرا لـە پێشا
پیـاوی بـەویجـدان جـەرگـی دەئێشا
چەرخی فەلەکە کە سواری دەبین
گـا لـە سـەر، گاهـێ لـە خـواری دەبین



عیلمـــی قیافـــەت چـــشتێکی خاســـە
ئـــەوی بیزانـــێ مـــەردوم شوناســـە

کـە پیـاوی ناسـی زوو لێـی نـاگۆڕێ
بـە کۆسـە کۆسـە نایێتـە گـۆڕێ

هـەیـە ڕەنـگ پیـاوەو جووتـەوەشـێنە
هەر بە دەماخ خۆی لە خەڵک خشێنە

هـەیـە بـە پـاروو دەسـتت ئـەگـەزێ
وا هـەڵـدەبـەزێ بـە بـەرزیـی گـەزێ

ئـــەوی ناســـینی لـــەماتـــە دوورە
کە دوور بێ قۆچی نابێ، ڕەنگ سوورە

ئیمـساڵ زۆر لـە بـەر بـێ ئـاوی ترسـاین
وا گـەلاویـژ کـەوت جارێ خـەلـەساین

بیـستو حـەوت کـاریز وا لـە شـارایە
تـەنهـا بـەلووعـەی ڕووت لـە کارایـە

ئـەگـەر ئـەوانـە پـاک بکرێتـەوە
وەک جـاری جـاران وا بژێنـەوە

ئـەبـن بـە ئـاوی کـەڵـەگافـرێن
لـە هـەمـوو ماڵـێ حـەوزی قوڵـەتـێن

جـاران کـە ئـاوی بـەلووعـە نـەبـوو
خـەڵـک بـە ئاویـشار بـەرێـوە ئـەچـوو

ئێـستا بـۆچ وامـان لێهـات تـێناگـەم
جارێ بـا بچم پـرس کـەم لای کاکـەم



دنیــا وا شــێوا بــەکــەس چــا نابــێ
سا مەگەر دەوری (مەهدی) پەیدا بێ
سێ چشت کۆن بووبوو کەوتوونەوە کار
درۆو دووڕوویـــــیو بلــــۆفی قومــــار
ئەم سیانە هەرچەند هیچیان چا نییە
هیچ نەبێ قەسدی گیانی تیا نییە
هەندێک هەن کەوا بێ گومان زۆڵن
دەستیان بوو چاوی چاک هەڵدەکۆڵن
بەسەر زاری دۆست کەچی بەدزی
کاتێک زانی وەک مار پێی گەزی
ئەوانە تەنیا بە پیاو چاک فێرن
لە ڕاستی دووپشک حیزن ناوێرن
من لەم دواییەدا یەکێکیوام دی
کــردەوەیــەکــیوای لــێ هاتــەدی
لەگەڵ یەکێکدا دۆستی سەرزای
لەپڕ لێی کەوتە گەستنی ماری
گەستنێکی وا قەسدی گیانی بێ
حـــەرامـــزادەیـــیو نائینـــسانی بـــێ
نازانێ ئەمە دێتەوە ڕێی خۆی
ئەبێ بە لەکەی لە خۆی پیستر بۆی
خوا چۆن پاک ئەدا بە دەم پیسەوە
هاکـــا نالانـــدی بـــە دەم لیـــسەوە



شـیر کـە یـەکڕووە ئالـەتی شـەڕە
شـانە دووڕووە وا لـە سـەر سـەرە
نالـێن کـە شـیرە تۆڵـە ئـەسـێنێ
هـەر ژن بـە شـانە سـەری دادێنێ
تـا شـیرت ئـەبـڕێ شـێرانە هـەستە
نـاوی پیـاوەتیـت بمێنـێ بـەستە
بـەڵام پیـاوەتیـت بـۆ گـەل وریـا بـێ
نـە وەک بـۆ شـەڕی نـاوخۆ ئـازا بـێ
جـاران کـە نـەیـان ئـەهێشت بخـوێنین
ئـازا بـین ڕەگـی یـەکتـر دەربێـنین
چونکـوو خوێنـدەوار لێـکئـەداتـەوە
ئاشـووب ناخاتـە نـاو وڵاتـەوە
ئێستە مـەکتـەب بـوو بـە ئـاووڕەشـە
هـەر تـەلـەبـەیـە وا بـە گـەردشـە
لـە نـاو عالـەمـە بـووین بـە داسـتان
خوابمـانخاتـە سـەر ڕێـی ڕاسـتان
ئەوکەسەی کە وا کەوتە سەر ڕێی چەوت
کاتێکت زانی هەڵئەنگووتو کەوت
تـۆ پـاڵ بنێـتو خـەسمت نـەکـەوێ
ئـەوسـایە کـەوتـن بـەر تـۆ نـەکـەوێ



خـوا خـۆی ئـەیزانـێ زوبـان نـاوەسـتێ
هێنـای حـەپسی کـرد هاویـشتیە بـەستێ
لـە پـووکـو لـە دان کردیـە دوو دیـوار
دوو لێـو بـەسـەریا دیـوار بـوو بـە چوار
بـەم چـوار دیـوارەش هێـشتا بـەنـد نابـێ
ئـەبـێ لـەوەوە گـەردش بـەرپـا بـێ
مـەتـەڵـی کـوردی بـۆ ڕێـکـخـراوە
بـە گـورگێکی هـار نـاوی بـراوە
ئـەم لای دیـوارە، ئـەولایـشی دیـوار
حـەپـسخانەیـە بـۆ گـورگێکی هـار
لـەگـەڵ ئـەوەیـشا کاتـێ دەرفـەت بـێ
نایـەڵـی سـەری خێـوی ڕەحـەت بـێ
خـۆ ئـەگـەرێتـە سـەر بـاری چاکـە
لـە هـەمـوو عـوزوی بـەدەندا تاکـە
ئـەوە لـە حـەیـوان جـوێی کردووینـەوە
گـۆی ئیمتیـازی بـۆ بردووینـەوە
ئـەو نوقتـەی کـەوا ئـەدرێ بـە زوبـان
پیـاو پێـی ئـەبێتـە پـەسـندی جیهـان
لـەگـەڵ ئـەوەیـشدا کـەموتـن چاکـە
ئـەوی زوبـانی خـۆی گـرت بـێباکـە
هـەر دادی خوایـەو خواسـتی کردگـار
زوبـان بـە چاکـە بتهێنێتـە کـار



هەندێ تەبیعەت کە ئەڵێن: دزە
لە وەرگرتنی پیشەی چاک کزە
ئەبینی شوێنێ مەجلیس گیراوە
شیعرو ئادابی ئەدەب لە ناوە
ناتوانێ ساتێ لەوێ بوەستێ
هەر باوێشک ئەدا هەتا هەڵدەستێ
ئەچێ بۆ شوێنێ قوماری لێ بێ
تێ هەڵدەقوتێ هەرچەند بێجێ بێ
لە ئێوارەوە هەتا نیوەشەو
لە یاریدایە بێ‌وچانو خەو
خۆ ئەگەر هاتو ڕووی کردە دۆڕان
بۆی دائەنیشێ تا بەری بەیان
قوماری کافر ئەمەندە خۆشە
ئارەق‌و ژنو ماڵی لا بۆشە
خواردنو کردن پیاو لێی تێر ئەبێ
تێری لێ ناخوا ئەوی فێر ئەبێ
کە ئەیدۆڕێنێ‌و پارەی نامێنێ
بە سوێندو تەڵاق، وازی لێ دێنێ
هەر ئەمەندەیە تا پارەی چنگ کەوت
مارە بە جاشە تەڵاقی کە کەوت
.... و قومار دو بران هاوپشت
کاتێک زانی خۆیاندا بە کوشت



ئەڵێن: خەر بەستەو خاوەندی ڕەستە
پەند بگریتە گوێ ناکەوی بەستە

هەندێ کەر هەیە هەوسار ئەپسێنێ
کە بەربوو جووتەی پیس ئەوەشێنێ

ئەوە وا چاکە باری گران بێ
کە مانیشی گرت بەشی لێدان بێ

هەرچی بە لەقە لە خەڵکی بەربێ
بۆ ئەوە دەشێ کەرسمەی دەربێ

ئێستر لە گوێ درێژ بارەبەرترە
حەرام زادەیە بەخەتەرترە

خۆزگە هەرکەسێ وا زۆڵ بوایە
نەسلی نەبوایە لەم سەر دنیایە

باوەڕت نەبێ بە حەرامزادە
لە حەج بیبینی خۆتی لێ لادە

پیاوی موسوڵمان ئەبێ سالم بێ
دەستو زوبانی بۆ خەڵک خادم بێ

چەند خۆشە ئینسان لە خوا بترسێ
ڕێگەی ڕاست بگرێو لە شا نەپرسێ

خزمەتی قەومو قیلەی خۆی بکا
نەیەوێ هیچ کەس تکای بۆ بکا

هەرچۆنێک ئەژی خۆشە نەک بە شەڕ
خۆت خۆشەویست کە لای خواو بەشەر



خۆزگە پێستێکی ئەستوورم ئەبوو
لە تەستوورەکەم ئەخستە سەر ڕوو
کە بە هیچ تەریق نەبوومایەوە
ئەکەوتمە کایەی ئەم دنیایەوە
پێکەوە دنیاو دینارم ئەبوو
بە دەولەمەندی ناوم دەرئەچوو
کە دەولەمەند بم کەسیشم نەوێ
خەڵک لە خۆیەوە شوێنم ئەکەوێ
لە هەموو شوێنێک نە وەک لەم شارە
دینار بە مەعنا دنیاو دین ئارە
شای شاعیرانمان وەک مودەقیقە
هێندە غەدری دی بە سیل‌و دیقە
هەندێ ناموسیان ئەوێ بە لاتی
حەلاڵ‌خۆریەوە کەم دەسەلاتی
لوغەت بە ناموس ئەڵێ: مێشوولە
قەدری ئەم دەورە بە پارەو پوولە
خەڵک لە مەعاریف بۆیە ڕائەکا
خوێندەوار بێ‌کار بەرد بە با ئەکا
ئەنجامی خوێندن مەئموورییەتە
جێگا نەماوە تەعیین زەحمەتە
خۆ کەسیش ئەمە لێک‌ناداتەوە
تۆ لە چیت، بڕۆ بە ڕێگاتەوە



جـاران هـەر شـاریٚ بینـا ئـەنـرا
قـەلایـەکـی بـۆ دروسـت ئـەکـرا
کـە دوژمـن زۆری بـۆ بهێنایـە
خـۆی ئـەکوتایـە نـاو ئـەو قـەلایـە

ئـەوسـا تـۆپی وا پـەیـدا نـەبووبـوو
بـڵێی قـەڵاکـە ئـەرووخێنـیٚ زوو
تـا ئـەم دوایـە کـە وا ئـەڵـەمـان
تـۆپێکی وەهـای هاویـشە جیهـان

قـەلای (لی‌یـژی) بـەو تۆپـە لێـژ کـرد
بێلژیـکو پارسـی بـە جـاریٚ گێـژ کـرد
چالـی لـە ڕێگـەی هاوسـیٚدا هـەڵکەنـد
کەچی خۆی تیٚ‌کەوت خوا تۆڵەی لیٚ سەند

دوای تۆپو بوبمای بۆ مەرگی گیان‌دار
زیـرەی قونبـەڵـەی زەرڕیـە کـەوتـە کـار
یا خوا ئەهلی فـەن هـەموو بـە پـەنـد بـن
خۆشـی نـەبیـنن گـیرۆدەی بـەنـد بـن

لـەگـەڵ چاکـەدا ڕۆحتـان دوژنـە
هونـەرو فـەنتـان بـۆ پیـاو کوشـتنە
لـەبـاتی تۆپـو قونبـەلـەو بومبـا
حـەبی دروسـت کـەن برسـیەتی لابـا

بـۆ خواردنـە خـەڵـک وا هـاوار دەکـا
هـەر برسـیەتیـە کـە پیـاو هـار دەکـا



مایـەی سروشـتی کـچ هــەر بـۆ شــووە
نـیرو مـێ یـەک کـەوت ئـاگرو پووشـووە
لــــە ئـــادەمــــەوە هــــەروا هــــاتووە
گیـانلـەبـەر بـە جـووت پێـی ڕهـاتووە
ئەمەی کچو کـوڕ یـەکیان خـۆش ئـەوی
ســـرێکی خـــوایی تیـــا دەردەکـــەوێ
ئـەم جـووت گرتنـە بـۆ نـەتـەوەیـە
نەتـەوەیـش بـۆ بـاوک بـە ئـەرکـو وەیـە
خـوا ئـەو شـەفقـەتـەی نـەدایـە بـە پیـاو
بـەم ئـەرکـە ئـەولاد چـۆن ئـەهاتـە نـاو
هەرچەنـد کـەس ڕۆڵـەی بـە کـاری نیـە
ئـــازاری هــــەیــــە بێــــزاری نیــــە
خـوا خـۆی فـەرمویـە ئـەولاد عـەدووە
خـۆ ئێـستا هێجگـار لـە ڕێ دەرچـوو
ئــەوی هــــەیــــەتی وا لێــــی بێــــزارە
ئـــەوی نیــــەتی بـــۆی دەغـــــەزارە
ڕۆژێ ســـندووقی لــــە مــــەزاتـــا بــــوو
دەلاڵ بەو خەڵـکەی ئـەگـوت ڕووبـەڕوو
هــــەرچــــی بیکــــڕێ وا پــــەشــــیمانە
ئـەویـش نـەیکـرێ خـەفـەتی گیانـە
لـەم موعـەممایـە مـەبـەسـت ئـەولادە
بـاوکی ئـەم عـەسـرە ڕەنجـی بـە بـادە



پێشینان دەڵێن: گورەی بۆرە پیاوە
هەڵدەبلۆقێ وەک بلقی سەر ئاو
لەگەڵ بایەکی لێ بکەویتە کار
لە چاو گوم دەبێ بە بێ شوێنەوار
بەلام یەکێکی دانای خوێندەوار
بیشکەویتە بەر زللەی رۆژگار
عەقڵو تەجرەبەی پێ زیاتر دەبێ
بۆ کاری گەورە بە کارتر دەبێ
تا نەکەویتە بەر پەلی زەمان
دۆستو دوژمنی ناناسێ ئینسان
وا بە چاوی خۆم دیم کە هەندی خەڵک
یەک ماڵ بوون لەگەڵ پیاوێکی بە کەڵک
هەر ئەوەندە بوو تا ڕەتێکی برد
وەرگەڕانەوە وەک نیسک دەست و برد
بەوە نازانن کە خۆیان دەرخست
ناویان لێ ئەنێن بێبەرو بێپشت
با ئەوکەسەیش خۆی لێیان بیورێ
پیاوەتی وەفا لێیان ئەتۆرێ
سەهوون کە ئەڵێن ئێستا لەم شارە
پیاوی دوودەکو دووڕوو بەکارە
ڕۆژێکیان ئەبێ کۆمەڵی پیاوان
کە ڕووبەڕوو تف بکاتە ڕووی وان



ئـــەو رۆژەی جیهـــان تـــەرتیـــب دراوە
ئینـــسان لـــە نیـــسیان دروســـت کـــراوە
ئـــەگـــەر مردنمـــان لـــەبـــیر بوایـــە
کـــێ وا ئـــەکـــەوتـــە دووی ئـــەم دنیایـــە
ئـــەگینـــە ئـــەوا لـــە پـــێش چاومانـــە
ئـــەمانبـــەنـــە ئـــەم گـــردی ســـەیوانـــە
بە ڕووت‌و قووتی‌و بە شەش گەز کفن
ئـــەمانخـــەنـــە نـــاو گـــۆڕێکی بـــێ‌بـــن
ئەوی کە ئێمە بۆی بە جوستۆجۆین
بە حەسرەتیەوەین تێری لێ ناخۆین
یـــا بـــە مێردیکـــی‌تـــری ژن ئـــەبـــڕێ
یـــا میراتیـــەو شـــەڕی بـــۆ ئـــەکـــرێ
ئـــەگـــەر ئـــەمانـــە بێنینـــە بـــەرچـــاو
بـــەم کـــوێرەوەریـــە ناکـــەوینـــە داو
خۆ هێجگار ئەولاد کە جەرگی پیاوە
خـــوا بـــە دوژمـــن‌و فیتنـــەی دانـــاوە
تـا بـۆت پـێ‌ئـەگـا بـە کولـەمـەرگـی
تـۆ تـەقـەلاتـە بـۆ نـان‌و بـەرگـی
هـای ئـەمـڕۆ شـەڕو گـەڕی کـردوە
یـا بـە زۆر مالـی خـەلـکی بـردوە
ئـەگـەر لـە پێـشت ئـەمـەت بـردوە
نـە دنیـات ئـەویـست نـە ژنـت دەهـانی



منــداڵ کــە شــیری بێعــار ئــەمــژێ
پێــشین زوبــانی بــە جنێــو ئــەپــژێ
ئــەوی منداڵــی ئــەدا بــە دایــەن
تــەربیــەی نابــێ ئــەبــێ بــە خایــەن
چونکــوو تــەبیعــەت لــە خۆیــدا دزە
دایــەن لــە ڕاســتی تــەربیــە کــزە
شــیری گامێــشت دابــێ بــە جوانــوو
لەگەڵ گەیـە ئاو، تیا ئەگەوزێ زوو
ســەر بــە ولاخــی ڕەســەن بــسپێرە
لــە پێــشدا ڕەســەن پــەســەنـد بــوو لێــرە
ئێــستا کــێ ڕەســەن دێنێتــە کایــە
ســەروو لــە پێــشەو بزمــار بــە گایــە
(کفر ئەحمەد) دوعـای لـە (گـا) کردبوو
قەزای (گا) لە (کەر) کەوت، ئەو مردبـوو
(پاس) و (لۆری) و (تانغ) کەوتوونە ڕووی کار
هێــشتا کــەرو گــا ئــەکێــشنە ژێــر بــار
(کونـدە)و (مـەشـکە)مـان هێشتا لا مـاوە
مــەشــکە بــۆ دۆیــە، کونــدە بــۆ ئــاوە
ئەیان گـوت: شـەیتان بە کـۆڕ پێکـەنـێ
(سـنرشـد)یـە کـە پێـی تـێ ئـەنـێ
شــەیتــان بــە کــوڕان وەهــا پێکــەنی
کـە دایـکـو بـاوک کـەوتنـە شـیوەنی



هەندێ عادەتی کۆنی ئێرە بوو
کە بە خۆڕایی خەڵک تێک بەرئەبوو
جارێ لە پێشدا بە شەڕە گەڕەک
دەستیان لە یەکتر ئەدایە کوتەک
شوێنیان جوێ بوایە زاواو خەزووری
نەدەکرا بە لای مالیا ڕابووری
هەموو ئێواران لەو قەراغ شارە
ئەتبینی تێکڕا وا شەڕەدارە
جارێ منداڵان دایان ئەمەزراند
ئینجا گەورەیان تێوە ئەئاڵاند
کەم منداڵمان بوو سەری نەشکابێ
کەم شەڕ بوو خوێنی تیا نەڕژابێ
هیچکەس نەی ئەگوت: ئەمە بۆ چییە
هەموو ئەیانگوت: شەڕ ئازاییە
بە شەو ئەچوونە حەمام کوڕوکاڵ
لە پڕ ئەبووە شەڕە پەشتە ماڵ
خۆم کە یەکێک بووم لەو شەڕکەرانە
ئێستایش نازانم چی‌بوو ئەمانە
ئا خۆزگە ئەمە غایەی تیا ئەبوو
بمزانیایە ڕێ بۆ کوێ ئەچوو؟
ئەوسا بەم پیرییە شوێنیان ئەکەوتم
بیشکوژرامایە لەولا ئەسرەوتم



بەخۆوەنەدیو چەشت بوو لە پلاو
دەست بە سەر ئەسرێو چەور ئەبێ کلاو

گەدا کە (چلم) بە قۆڵ ئەسرێ
سەرکەوت کلکی گا بە مەندیل ئەگرێ

لە (توونچێتێ)یەوە بووی بە (حەمامچی)
لە کاری خۆتا بە غەڵەت ناچی

عیزەت پاشایێک بە عەجەم مەشهوورە
ببوە بە والی وڵاتێکی دوور

هەرچی بۆ ئیشێک ئەچوو بۆ دیوان
ڕجای لێ ئەکرد، ئەیگوت بە چاوان

کابرا ئەڕۆیی ئەو بە زەریفی
ئەیگوت: (قاندیردک .... هەریفی)

(صدر اعظم) بانگی ئەکاتە لای خۆی
ئەڵێ وەزیری خارجیە تۆی

بە خۆشی، خوشی ئەچێتە شوێن خۆی
چاوەڕێ ئەبی فەرمان ئەچێ بۆی

نووسرابوو (قالدیر ملتی بویلە
جزا من جنسی العملاء شویلە)

با سیاسەتیش درۆی پێ بوێ
درۆزن شایش بێ، دوایی ئەکەوێ

کەواتە پیاوی ڕاستو کارشوناس
ئەتوانێ لە قەید بمانکا خەلاس



تـا پێکـوڕەی خـۆت لـە لاوەسـتابێ
بێگانـەت نـەوێ، بـا لات وەسـتا بـێ
ئـەگـەر لـە مـاڵا نانـت بـۆ بکـرێ
لـە بـازاڕ مـەکـرە کـەلـکت نـاگرێ
ئەگەر لە شاری خۆت دۆستت نەگری
بێگانـەت تـووش دێ نـەتکاتـە گـری
خوا لەگەڵ هەر چی کردتی بە هاوماڵ
وا بکـە هـەردوولا پێـی ببن خۆشحاڵ
تـۆ لـێم ئـەپرسـی: جامیعـەت کامـە؟
مـاڵ ڕاوەسـتابێ، (جـامع) حـەرامـە
ئـەوی کـە لـەسـەر تـەجروبـە بـڕوا
هـەرچیـەک بـڵێت پێـی بکـە بـڕوا
پیرەمێردێک زوو پێی وتبووم بەستە
پـەل مـەهـاوێژە، بـۆ خـۆت بنج بـەستە
مەڕوانە وەعدەی هیچ قەومو خوێشێ
هـەموو کـەس بـەلای خۆیـا دەکێشێ
(بسمارک) زانیویـە سیاسـەت چییـە
هـەل هـەڵکەوت مـامو برایـی نییـە
بـۆ ئیـسلام وەفـای وەعـد ئایینـە
ڕابوورد ئەو عەهدەی عەهدی پێشینە
دیموقراتییـــەو لافی وەتـــەنی
بـەم دوو تـەفرەیـە شـەیتان پێکـەنی



ئەڵێن سەردەمێ شیعر باو بووە
شاعیر یا بەناو، یا بەدناو بووە
هەندێ پادشاه شیعری ویستووە
ڕجای شاعیری زۆر جار بیستووە
ئەڵێن ڕوودەکی لە لای سامانی
لە ئەندازەدا نەبوو سامانی
بە قەسیدەیێک ئەمیری سوارکرد
بە لەشکرەوە بۆ (بوخارا)ی برد
زۆر شاعیری‌تر لە برسا مردوون
یا لە زیندانا دوساخیان کردوون
خۆ هێجگار ئێستا شیعر بەلایە
سەرقەڵەمانەی تف و تێلایە
جایزەی جاران بووە بە جزیە
دەروونی شاعیر هەز چزەچزیە
نە گوزەرانە، نەکارو کەسپە
جەرگو هەناوی بریە لە کسپە
(اثیرالدین)ی ئەومانی ئەڵێ:
کە شاعیرت دی، ڕاکە لێی هەڵێ
(ظهیری)یش ئەڵێ: لە دەست شیعر داد
هونەر لە عیراق زۆر عەیبە فریاد
ئەمانە دادیان لە دەست دنیایە
شیعری بە شعوور ئیلهامی خوایە



سالانی پێشوو بەختمان یار بوو
حەکیمەکانمان نەخوێندەوار بوو
نەمانبیستبوو ئەم هەموو دەردە
نەئەچووە زگمان دەرمان بەفەردە
ترس و واهیمە نەبوو لە ناوا
عیللەتمان بە ئاو ئەدا بە ئاوا
بە نوشتەی شێخێک، یا لەرز بڕینێ
نەدەما دەردو ژانی برینێ
هێلانە قولتە لەگەڵ شیری کەر
دەردەباریکەی لا ئەبرد لە سەر
ئەوسا (شیرینقە) شەو هەر بۆ ژن بوو
ئێستا نێرینە لەشی کون کون بوو
دیپلۆمەی درۆ لە ناوی بردین
هەزار نەخۆشیی بۆ پەیدا کردین
خۆ هێچگار دەردی ئیجتیماعیمان
دووبەرەکیی وای هێنایە مەیدان
نایێڵێ ساتێ سەرمان ڕەحەت بێ
بەشمان بۆ سەردار، سەر دارو پەت بێ
هەرچی هەڵئەسێ ئەڵێ: من حیزبم
برا لێم لادە، نامەوێ حیزبم
ئەحزاب جوێ‌بەجوێ کەوتنە شەڕە جوێن
ئیسلامیەت و عەسەبیەت جوێن



بەخۆوە نەدیو کە گەیە پاڵتۆ
خۆی بۆ هاوشانی ئەکوتێتە پاڵ تۆ
کەولی سمۆریان دایە کەروان
کەری پێش خۆی خست، کردیە سەرکۆپان
(گەدا) سەرکاریی ئەگەر پێ ببڕێ
پیاوماقووڵ ئەشێ وەک کار سەر ببڕێ
هەر لە سەرەتای جیهان تا ئەمڕۆ
نادان بە کەیفە و دانا بە ڕۆ ڕۆ
هێشتا تێناگەن کە خواستی خوایە
بە خۆی بنازێو دوایی لە دوایە
ئەبینی ئەوەی کە خاتر جەمە
لە هیچ تێناگا بۆیە بێغەمە
چرایە کەوا هەڵێ گیرساند
ئەوی فووی لێ کرد ڕیشی خۆی سووتاند
هەندێ ناسراون بە خەڵک ئەوەڕن
نانێ لە بەشەر بە شەڕ ئەپچڕن
گۆڕی ئەوانە بە (سەمەندۆک)ە
دەمیشیان بگری پڕ زگیان نۆکە
بە بای نۆک ئەترن ئەدەن لە پۆوە
پیسایی توولە ئەکەن بە بۆوە
نان ئەفرێنن لە (مەردەلۆخە)
لەولادە ژنیان ئەدەن بە (دۆخە)



هــەر لــەورۆژەوە جیهــان دانــراوە
ئــەهــل و نائــەهلــی تیــا فــەرق کــراوە
ئەشکالی بــەشــەر کــەس لــە کــەس ناکا
تــاکوو یــەکسان بــێ بــەد لــەگــەڵ چاکا
هــەروا هــاتووەو وایــش ئــەچێتــەســەر
تــازە ئێــسترمان بــۆ نایێتــە بــەر
ئــایینی ئیــسلام تــەســاویی دانــا
بــەلام فــەزلیــشی بــۆ دانــا دانــا
من بە ڕەنجی شان پارەم دەست کەوێ
تــەمــەڵ لــەلاوە چــی لــە مــن ئــەوێ
بــەڵــێ حــەقــی کــەس بــە کــەس نابــڕێ
ناحــەقــی نــاوی بــە خــراپ ئــەبــرێ
یاریــدەی کــەوتــوو ســەدەقــەو زەکــات
بــە ئــەمــری خــوداو پێغــەمبــەر داهــات
نــەک ئــەمــەی بــڵێی بــە (بۆلــشەویکــی)
هــەرچــی پــەیــدا بــوو بیێتــە شــەریکــی
تــازە ... لــە گیــان وەڕســتن
بــە ئێمــە ئــەڵــێن کۆنــە پــەرســتن
خۆزگــە ئــەمــزانی تــازە چیــان کــرد؟
ئــەمــەنــدە بــەنــدەی خوایــان لــە نــاو بــرد
دیموکراتیــــە (زەڕە)ی داهێنــــا
ڕەگــی هــەژاری لــەبــن دەرهێنــا



گونـاهو تۆڵــە، زۆر کــەس تیـا کۆڵــە
خـۆ هێجگـار تۆڵـەی بـاوک بـۆ ڕۆڵـە
بــاوک لــە ئــەولاد ئینکــاری نیــە
ئــازاری هــەیــەو بێــزاری نیــە
ئەمەیە کە خووی فرزەند ئەگۆڕێ
هـەر بـە زینـدوویی ئـەیخاتـە گـۆڕێ
کــە بــە منداڵــیی تــەربیــەت نــەدا
ئـەو ئـەڕوا بـە شـوێن کـردەوەی بـەدا
ئـەوسـا قـانوونی جـەزای حکوومـەت
مـەحکـوومی ئـەکـا، بـە پێـی عقوویـەت
ئــەبــێ گونــاهی بــاوکی لــێ بگــری
خۆی خووی وا لێ کرد با هەر بۆی بگری
مـن بـاوکم دیـوه کـە چـاوی لـێبـوو
کـوڕەکـەی لـە شـوێن ئۆتۆمۆبیـل چـوو
ئەو بە فەخرەوە ئەیگوت: کوێ ئەچێ
چۆن لە چنگ ئەحەی کوڕم دەردەچێ؟
خـۆ ئـەگـەر کـەوتـە ژێـر ئۆتۆمۆبیـل
ئــەچێتــە شــکات بــە دادو دەخیــل
ناڵێ کوڕەکەم ڕای کرد شوێنی کەوت
خوێ هەڵاوەستی دەستی بەربوو، کەوت
ئـاخ خۆزگـە چـاوی ئـەمـە ئـەکـرا
بــاوکی ئــەوانــە جــەزا ئــەدرا



جەوهەر لە بەختی ڕەشەدا دیارە
شەوقی مانگەشەو لە شەوی تارە
ڕشتەی زیرەکی کە خوا پێی داوین
بووە بە پەتێک پێی پێ لە داوین
(قونبەلەی زەڕە) لەولا ئەتەقێ
چاوگەی (ئاوەڕەش) لێرە ئەتەقێ
هەوری (بڕووخێ) کە ئەگرمێنێ
(لافاو) هەر ماڵی خۆمان ئەڕمێنێ
قوڕیان گرتەوە بۆ نەوجوانان
وا خۆیان بونە (بەرزەکی بانان)
هەر دەڵێم ناوی کوردیەتی نابەم
چی بکەم تینومە بێ ئاو دەر نابەم
(بەفر) وەک سەرم باری بە سەرما
کوێستانی مباکم نییە لە سەرما
هێند (پەل)یان پیادام بووم بە منارە
کەس لە من بەرزتر نییە لەم شارە
بومە چرایێک لە سەر منارە
من ئەسووتێم و ڕێی خەلک دیارە
خشتێ بڕووخێ لێم بوو بە دیوار
هەر هاوار ئەکەم لێم نابیەن هاوار
ئەگینە هەر من هاوارکەریان بووم
بە (ژیان) و (ژین) من ڕابەریان بووم



باران کە باری خاک ئەشواتەوە
زبڵو پشقلی پاک ئەکاتەوە
بە هاوین زەمین کەڵلەی گەرم ئەبێ
بە پەڵێ پەڵەی باران نەرم ئەبێ
بە کەڵلەڕەقی هیچ ناچێتە سەر
بە نەرمی زەوی‌و درەخت دێتە بەر
بە زستان مارو دووپشک نەچنە کون
سەرما دەماریان دەردێنێ لە بن
(بێورە) ترسی کە هات بە سەرا
کونە مشکی لێ ئەبێ بە سەرا
هەندێ هەمیشە ئەڵێ: سەرمامە
بن کلکی کەری لەلا حەمامە
سەرما نەچێژێت ئاگرت ناوێ
زستانان ئەچنە بەر خۆرەتاوێ
تا ساردی‌و گەرمی جیهان نەچێژی
هەرچیت هاتە پێش خامی ئەیرێژی
بە زلەی زەمان کە گوێت نەزرنگی
(تەمێ خواردوو) نیت، پێت ناڵێن: زرنگی
بەخێرو بێرە ئەوەی کە فێرە
بزن بە بێرەو گاجووت بە گێرە
مام ڕێوییش خواردی شیری پیرێژن
کلکە قولیان بڕیبوو لە بن



هەرکەس ئەبینی هەوڵی خۆیەتی
بۆ گیرفانی خۆی چڵۆچۆیەتی
ئەم نەرە و ئەم سەرەو سەرە
(ماریقە) درۆزنەی نیشتمان پەروەرە
ئەگەر هەر (مەلێ) هەنجیر خۆر ئەبوو
هەنجیر بە کاڵی ئەبڕایەوو زوو
ئەوانەی کەوا سەرکەوتن تەواو
بە فیداکاریی لاوان هاتنە ناو
ناوی (شووتیەکە) ئەکەن بە سندان
توێکڵی ئەهاونە بەر پێی لاوەکان
(دڕک) لە پاڵووی ئێستری تۆڕ ئەنێ
سوارەکەی بگلێ ئەویش پێ بکەنێ
(لیس کوێری)یە کەوتۆتە ناومان
هەروا ئەکەوێ لە سەرو چاومان
بۆ هەموو کارێک غایە پێویستە
پیاوی بێ مەسلەک هەر نەنگەویستە
ئەوی ئەخوێنێو ئەیهێنێتە کار
ئەلەکتریکە بۆ ڕووناکی شار
هەندێکی وایش هەن چراوەکوژێنن
کەڵەکی (میری سوور) ئەڕووخێنن
ئەوانە ئەبێ (ئەشکێل) بکرێن
یا لە ناو گەلا دوورەوەخرێن



وا چلەمان چوو، شوكور نەمردین
خوا لە دەست (شەوە)، ڕزگاری كردین
ئینجا مایەوە هیمەتی پیران
جنۆكە نەمانهاوێتە بیران
جنۆكە دەستی خۆی لێ وەشاندین
گەلێ نازداری لە گەل تەراندین
ئەمجا دوای شێتی نۆرەی ژیرییە
خەڵك لە ناو خۆیدا ڕاو تەدبیریە
بەڵێ كەس لە پڕ نابێ بە كوڕێ
تا پێت ئەگا سەد كفن ئەدڕێ
ئێمەیش وا چەند جار تەجروبەمان دی
ئەوەی ئەترساین لێمان هاتەدی
با ئیتر نۆرەی هوشیاریمان بێ
بەس هەرزەكاری‌و بێعاریمان بێ
نۆرەی خوێندن بێ، كە هەر بە خوێندن
ڕزگاریمان دێ لە فێڵی دوژمن
شەرتی ئەوەڵمان ڕێكیی ناوخۆیە
ناڕێك بین نابین بە هیچ، درۆیە
هەموویان دزی گاكەی خۆمانین
جاسووسی یەكین، هەتا ئەتوانین
كێ لاولاوە هات (ژورنالمان) لێدا
بینووسێ هەرچی ئەڕوا بە ڕێدا



یـــادی ڕابـــووردوو چـــەنـــد دڵـــگیرە
غـەم و شادیـــشی وەک یـەک لـەبـیرە
لــە زینـــدانا بـــووم کـــە بمخنکێـــنن
ئـەیانویـست گیـانم لـە لـەش دەربێـنن
ئێـــستا جاریـــەجـــار دێتـــەوە بـــیرم
بـە یـادێکی خـۆش هـەڵـی ئـەبژێـرم
چەنـد جاریش کـەوا لـە سەرای شـادا
سمێـــڵم بـــادا بــــە دڵـــی شـــادا
ئێستا هەردووکیان وەک یـەک دێتە یاد
ئـــەمـــەتـــە حاڵـــی دنیـــای بـــێ‌بنیـــاد
هـەرچـی ئـەبـینی وا لـە پـێش چـاوە
کـە گـوم بـوو، خـەوە، خـەیاڵـی خاوە
ئـەگـەر ئـەنجـامی ئـەمـە بـزانی
خـۆت هـیلاک ناکـەی بـۆ دنیـای فـانی
کـە خۆشـیو تاڵـی هـەروا نـەمێنـێ
ئیتـر چیـت داوە لـە ئـەمـڕۆو دوێنـێ
لـە تـەنگانـەدا هیـوای خۆشـیت بـێ
بـا بـەوە لـە خـەم فـەرامۆشـیت بـێ
خـۆ ئـەگـەر بێـتو قـەناعـەتکـار بی
ڕەزا بـــە قـــەزای پـــەروەردەگـــار بی
لـــە مـــەلیـــک خۆشـــتر ڕادەبـــوێری
دنیـا هـی تۆیـە کـە بـەرچـاو تێـری



خــوا شــەوو ڕۆژی دانــاوە بۆمــان
لەوحەی عیبرەتن بۆ ئەهلی جیهان
جارێ لە پێشدا دەرسن بۆ ژیان
یەعنی کە تا سەر نامێنێ بۆ ئینسان
دووەم تاریکیو ڕووناکیش وایە
کە خۆشیو تاڵی وا دوابەدوایە
دوای تاریکی شەو ڕۆژ کە دێتەوە
بۆیە کە قەدری بگیرێتەوە
ئەگەر هەمیشە هەر ڕۆژ دیار بێ
وای لێ دێ ئیتر خەڵک لێی بێزار بێ
خۆ ئەگەر تا سەر تاریکەشەو بێ
ئەوسایە ئەبێ پێشەمان خەو بێ
کەواتە خوا خۆی باشی داناوە
ئەندازەی ڕۆژو شەومان خەو بێ
شەو بۆ نوستن و ڕۆژ بۆ ئیشو کار
ئێستا شەو بووە بە ڕۆژ، بۆ قومار
لای خوداپێداو بە شەو بێداری
لاولا پێ لەداو بە داوی یاری
هەردوو لایێکیش لەلایان خۆشە
بەلام قومارکەر مادەیان بۆشە
هەندی ڕەحمانی، هەندێ شەیتانی
شەیتان خۆی تێکەوت، دوایی نەهانی



خزمینـــــــــه دڕەدن ... داهــــــــات
ئیتــــر ئــــەبێتــــه دهــــوی مــــساوات
كوڕوكــاڵ بــەوە كــەوتوونــە ســەمــا
كـە گوایـە بـاوی دەوڵـەمـەنـد نـەمـا
ئــەوی بــەش كــرێ بــە جــەماتــەوە
ئــەبــێ بــەش كــرێ بــە جــەماتــەوە
شەوی یەكشەمموویش ئەوی ڕەبەنە
بێ‌ترس ئەچێتە لای دەست‌بەخەنە
نــازانن بــەشــەر مایــەی بــە شــەڕە
سروشتی ئەسلیی تەشقەڵەوە گەڕە
لــە ئــادەمــەوە دوو بــرای هاوپــشت
لە سەر هەوای نەفس ئەویان ئەوی كوشت
خــۆ براكــانی یوســفیش هــەروا
تێكــڕا لــە نــەسـلی پێغـەمبـەری خـوا
لــە نــاو خۆیانــا كــەوتنــە تــەدبــیر
ئــەو فریــشتەیــان هاویــشتە نــاوبیر
ئێستا ئەم نەسلەی كە لە ئەزەلدا
هاتوونــەخــوارێ بــە شــەڕو هــەڵــدا
بــێ ترســی دارو جــەزای حكومــەت
چــۆن دادەنیــشن بــە عــارو حورمــەت؟
هــەرخــوا ناسیونیو شــەرعی پێغـەمـەر
كە خستوونیە ژێر ئەمری (اولو الامر)



خـوا هـەر پیـاوێکی کـەوا نـاردووە
ئێـشێکی گـەلی پـێ سـپاردووە
هەنـدێ بـۆ ئـەوەی ڕێـی چـاک بنوێنن
لـە زۆردار تۆڵـەی هـەژار بـستێنن
هـەنـدێکیش ناویـان پێغـەمبـەر بـووە
فـەرمـوودەی خوایـان بـۆ ڕەهبـەر بـووە
بـە زوبـانی لـووس، وەعزیـان داداوە
هـەر قـسە بـووە، باویـان نـەمـاوە
کـە زانیویانـە قـوەتیـان نییـە
وتوویانـە ئـەم درۆیـە چییـە
هەندێکیان کوشتوون، هەندێ هـەڵاتـوون
بـە ئاسمانـا، بـە تـرس سـەرکـەوتـوون
تـا ئایـەی (قتـال) نـەهاتـە خـوارێ
پێغـەمبـەریـش خـۆی ئـەکوتایـە غـارێ
دوایـی بـە شـیری (عومـەر) و (عـەلی)
هاتینـە سـەر ڕێ، پێـی بـووین بـە (وەلی)
ئێـستا ئـەو شـیرە ژەنگـی هێنـاوە
تیـژیو بڕشـتی کـۆنی نـەمـاوە
هەرچیش هـەڵـدەسێ لـە ئـەبنای زەمـان
ئیـسلامیەتی کـردووە بـە قـەڵـغان
خوایـەا دیانـەت زۆر کـزە لێـرە
محـەمـەدیکـی مـەهـدی بنێـرە



تا گوێت گران بێ باری خەم سووکە
چاو لە لووس ئەکەس قینت لە تووکە
پیرێـژنی چـەرخ بـە نووکـەنووکـە
هەزار مێردی ناشت هێشتا هەر بووکە
هـەزاری سـوارەو ئێمـە ئـەیخـوازین
بـەو ڕەنگـەیـش هێشتا ئاواتـەخـوازین
ئـەوەی بـۆ ژنی بـەدخـوو بـەخـەمـە
ناویـان لێنـاوە بـە (مامـە حـەمـە)
ئـەگـەر خـوا ئـەمـەی وا دانانایـە
ئـەشـیا هـیچ کـەسـێ تێـدا نـەمایـە
خـوا شـەیتـانێکی بـۆ دروسـت کـردین
وردو درشـتی لـە خـشتە بـردین
ئـەو کـە باوکمـانی وا هـەڵفریوانـد
لـەو شوێنە خۆشـەی بـە فێڵ دەرپـەڕانـد
ئێمـە لـە باوکمـان دیـارە زیـاتر نـین
ئـەو پێغـەمبـەر بـوو، خـۆ ئێمـە ئـۆمین
مـەگـەر کـەرەمی خوامـان لـە سـەر بێ
کـە تـەفـرەی شـەیتـان وا بـەخـەتـەر بێ
ئـەگینـە کـە ئـەو لـە ڕێمـان لادا
هیـوای لای خوامـان ئـەدا بـە بـادا
ئـەم بـەاکـرداری‌و یـەکتـر کوشـتە
فـیتی شـەیتانـە، کـەوا دوژمنـە



شـەوگـاری پـایز نـەئـەچـووە سـەر
ڕۆژ نـەئـەبـووەوە، مـەگـەر بـە (پۆکـەر)
ڕوونـاکی کـەمو تـاریکی زۆر بـوو
دەسـتەی ... دەسـتی پـڕ زۆر بـوو
... (سـەنـدەڵـقو) هـەڵـیەپـەڕانـدن
(تـەگـەو بـەران)ی لیکیـەپـەڕانـدن
ڕمـەڕم (ڕم)یـان ئـەدا لـە سـەرا
وەختـەبـوو سـەرا، بـڕمی بـە سـەرا
(بلـوێری شـەیتـان) کـەوتبـوو مـەقـام
(سـێپێـی) ڕەقـسین پێـی سـێ قایمقـام!
تـاکوو (پـەڵـە)یدا پـەلی دیـوانی
پـەلی دیوانـەی پـەل کـرد ڕایهـانی
نـەورۆز شـەوو ڕۆژ بـوو بـە مـساوی
نـووری ڕۆژلای بـرد، مـسای مـساوی
بـارانی نیـسان، ڕەحمـەتی ڕەحمـان
نوقتـەی زەحمـەتی کڕانـد لـە سـەرمان
ئیتـر حـەفلـەیـەو شـادی ئیـستیعراز
بەرخی (حـەمـەلیـان) سـەربڕی سـەربـاز
سەرۆکی نائیب سەر سەرەو کێش هـات
هاتمانـە بـەخێـر، بـە سـەر سـەردان هـات
مـاوەتـەوە سـەر تـەنهـا ئاواتـێ
(بـاوەگـوڕ گـوڕ)یـش کوڕیکمـان باتـێ



هەموو کارێک بە ئەندازە بێ
جزدانی خولقت بە شیرازە بێ
زۆرت چنگ کەوێو کەمی ببەخشی
چاویان لەدوایە دوایی ئەلەخشی
کەمت بێو بیدەی زۆر قەرزدار ئەبی
کە قەرزداریش بی شەرمەزار ئەبی
خۆت بەدناو مەکە بە بردەی باری
لای خوایش بەرمەدە بە ستەمکاری
سەد چاکەت بێ ئەروا بە بایە
برینێکی دڵ سارێژی نایە
هەتا ئەتوانی لادە لە دیوان
دیوانە نەبی وەک دیوان دیوان
هیچکەس بە مەعاش دەوڵەمەند نابێ
سا مەگەر گوردی بەرتیلی تیا بێ
بەرتیلیش مایەی گرو پفێکە
ئەنجامی هەردوو دنیای تفێکە
نانو دۆیەک و دڵێکی رەحەت
نەک ترس و خەمی پادشای سەرتەخت
چونکوو هەردوولا رێیان ئەولایە
هیچ نابەی لەگەڵ خۆت لەم دونیایە
ئەم واتەیەمان ناچەسپێتە دڵ
ئاواتە خوازی ئەبەینە ژێر گڵ



ئــەوانــەی کــە وا خۆیــان ناســیوە
(ئیـدمان)یـان دیـوە لـەم دیـوەو دیـوە
کاریـــک بـــزانن پێیـــان نـــاکرێ
نایگرنـە ئـەستۆ، گـەرچـی بـە کـرێ
هیـوایش ئـەبینم کـە تـێ هـەڵـچۆیە
پـەلامـار ئـەدا بـە دەنکـە جۆیـە
کە کەوتـە سـەر ئیش ئەوسا ئەزانێ
ئـەو بـارەی گرتیـە ئـەسـتۆ نایتوانـێ
بـەڵام فایـدەی چـی مـەشـکە دڕاوە
کـــــاتێکی زانی دۆکـــــەی ڕژاوە
بۆیـــە پێـــشینان وایـــان دانـــاوە
ناســـینی ڕەش و ســـپی بـــە ئـــاوە
ئێستا دەرویکـە دوو چـشت بـە کـارە
بـۆ خـۆ چـەسـپاندن، ڕەجایـەو پـارە
بـا لێـرەیـش نـەبـێ ئـەم فروفێـڵە
لـــە ســـەرچـــاوەوە ئـــاوەکـــە لێـــڵە
لـە (گونیـە)دا پێـی لاوان ئـەبـەسـتن
پێشیان ئـەڵێن: (دەی) ڕاکـەن مـەوەستن
ئاخ پیـاوی خۆیـان بـۆ ئیش نـەدەنارد
بۆ ئیش هەر پیاوی خۆیان هـەڵـدەبژارد
(ســـوریەو زەعـــیم) کاریـــان تـــەواوە
چـارەی ئیـسلاحیان بـە سـوێند دانـاوە



هەرچی بەشەرە و گیانی لەبەرە
لە سەر سەفەرەو ڕێگەی لەبەرە
سەیریش ئەمەیە کە هاتە جیهان
ڕووتو قووت کز بێ ئاوو بێ نان
کە دیت هیچ لەگەڵ خۆیا نایێنێ
کە ئەشڕوا نایا لێی جێ ئەمێنێ
ئیتر لەو ڕۆژەی فام ئەکاتەوە
ئەچەوسێتەوە، بە نەهاتەوە
هەمووی‌شی دەردی دیزەڕەشیەتی
تا دەمرێ هەوڵی خواردن بەشیەتی
چونکوو برسێتی چاری نەکراوە
کە هیچی نەخوارد هێزی نەماوە
بەرگو پێلاوو هەوای نەفسانی
نەیشبێ چارێکی هەیە ئەتوانی
بەلام نەخواردن بۆ کەس نەلواوە
ئاوێکە ڕۆژی ئەزەل ڕژاوە
ئەمەندەی هەیە قەناعەتکاری
واسێتەیێکە بۆ سەبەبکاری
ئەویش یەگانە چارەی بە دینە
ئاینی ئیسلام بۆ نەفسڵ پەرژینە
ئەخلاقیش بە دین دێتە ڕێی چاکە
داخەکەم لێڵە ئەو ئاوە پاکە



ڕێــی دڵو زوبــان هێجگـــار گــۆڕاوە
ئاشـــنایەتییـــان لـــە لا نـــەمـــاوە
ئەویان بوو بە قیر، ئەوی‌تر وەک شیر
خزمایـــەتییـــان نایـــەتـــەوە بـــیر
دڵ عـــەهـــدو وەفـــای لـــە لا نـــەمـاوە
زوبـــان بـــۆ درۆ تـــەڕو پـــاراوە
ئـــەمـە سیاسـەت وای بـەسـەرهێنـان
دیانەتیـان ئاشـت لـە (گـردی سـەیـوان)
ئـەگینـە شـەرتـێ ئـایین ئـەیـەوێ
دڵو زوبانمـان بـە جـووت یـەک کـەوێ
هـەرچـی زوبـانی ئـەیـلێ بـە دڵ بـێ
نەک لە لای خـوداو بەنـدە خـەجڵ بێ
موسوڵمان لەگەڵ یەک هـام‌حـاڵ ئەبوو
یـەکێکیـان بـەسـەر (دە)دا زاڵ ئـەبـوو
ئێستا کـە لـەگـەڵ یـەک درۆئـەکـەن
حەوتیان بۆ جوویـک سـەر فـرۆ ئـەکـەن
ئـەم تـەجروبـەیـە هـی هـزار ساڵـە
نـەسـرەت بـە دینـە، نـەوەک بـە ماڵـە
سیاســەت بـــازی لـــە ئێمـــە نایـــە
ســـەدهـــەزار چاڵـی نـەدیـدەی تیایـە
دینی ئیسلام بـوو ئێمـەی لـە سـەر بـووین
بـەوە نـائیلی فـەتـحو زەفـەر بـووین



ئەو کەسەی کە خووی خۆی لە لا خۆشە
بـــا خـــراپیش بـــێ، نـــایگۆڕێ بۆشـــە
زۆرتـر خـووی خـراپ کـە بـاو ئـەسێنێ
وا لـــە پیـــاو ئـــەکـــا چـــاری نامێنـــێ
هـی ئـەوتـۆ هـەیـە بـە چاولـێ کـەری
هـەرچـی هاتـە پـێش ئـەیداتـە بـەری
ئـەمـەوێ ڕۆژێ هـەر بـۆ تـەجـرەبـە
لە شوێنێ تووشی چوار پێنج کەس ببە
بـــڵێ: کوڕینـــە وا لـــەو مزگـــەوتـــە
بـــانگی‌داو نـــوێژی بـنـەجـــەماعـــەتـــە
وەرن بـــا بچـــین، بـــزانین کـــێ دێ؟
دیـــارە کـــە هیچیـــان ڕووناکـــەنـــە وێ
ئینجـــا بـــڵێ: ئـــای کوڕینـــە وەرن
تیاتـــرو هـــاتووە، کـــچ هـــەڵـــدەپـــەڕن
سـنگ‌و قۆڵـی ڕووت، گـۆرانی ئـەڵـێن
(ویزیتە)یـش هـەیـە بێ (ئینتـر)ەو بـەڵـێن
ئـەوسـا بـڕوانن چـەنـدی لـە شـوێنە
وای لـێ هـاتووە ئـەم ڕێو ئـەم شـوێنە
خـۆم لـە بیرمـە پیـاوی داویـن‌پـیس
ئەکەوتە بەر (حەد) ئەیان‌کوشت بە لیس
ژنـیش خـۆڵ‌و دۆی ئـەکـرا بـەسـەرا
شـار بـەدەر ئـەکـرا بـە چـەپـڵەو هـەرا



ئەهلی فەن ئەڵێن کە گەرمای هاوین
تاوی هەتاوە ئەیدا لە زەمین
ڕۆژ، ساڵێک لە ناو دوازدە بورجایە
سیانی سەرمایە و سیانی گەرمایە
کە زەمین لە ڕۆژ نزیک کەوتەوە
گڕ بەردەبێتە کوورەی نەوتەوە
ئەمە وادیارە زۆر چاک زانراوە
خەتی دەورەیە بۆ ڕۆژ کێشراوە
بەڵام ئەهلی حاڵ باوەڕیان وایە
جەهەننەم لەناو قوڕگی مارایە
ئەو مارە ناویان ناوە (غاشیە)
هەناسەیێکی (نار حامیە)
کە ئەو هەناسە ئەدا بە جارێ
تینی ئاگری لە دەم ئەبارێ
گەرمای هاوینان هەناسەی ئەوە
ترسی سووتانی جەهەننەم لەوە
ئەمە یادێکە خۆفی خوای تیایە
هەموو ژیانی مەرگی لەدوایە
دوای ئەوەی کە وا گیانمان ئەکێشرێ
لەلا خراپەو چاکە ئەکێشرێ
ئەگەر خراپەت بووبێ بۆ بەشەر
فڕێت ئەدەنە ناو ئاگری (سەقەر)



زک تـیرم کـاری دەسـتی ماندوومـە
تـۆوی عیـزەتی نـەفـسە چاندوومـە
ئـەو چـاوە بیـرە کـە ئـەیبڕیـە دەسـت
تـەماع ماریکـە پێـی نامووسـی گـەست
حیکمەت فرۆش بی بێقەدەر ئـەبێ پێی
شەرت ئەوەتە خۆت وابی کە ئەیڵێی
بـێ گـوزەرانی دەردێ هائیلـە
نوقتـەی نـەگبـەتـە بـۆ سـەر عائیلـە
کـە منداڵـەکـەت لـە برسـا ئـەگـری
ئیتـر نـازانی چ ڕێـەک ئـەگـری
نـەبوونی دەسـتی شـێرگیر ئـەبـەستێ
ماکینـەیـش بـەنـزین نـەبێ ئـەوەستێ
کـەم دەستی ئـەگـەر هـەوڵـی تێـدابێ
(عوسـر)ێکـە ئـەبی (یوسـر)ی لـە دوابێ
دەردی گـرانی ئینـسان حـەسـەدە
فـەرەحـی نـادا بـە دڵ، زۆر بـەدە
بـەغیـل بیـشیێ دایم غـەمبـارە
چونکـوو حـەسوودی لـە سـەر دڵ بـارە
ئـەو کـەسـەی دڵو دەروونی پاکـە
خەڵک خۆشی ئەوێ، بۆ خۆیشی چاکـە
ئـەمانـە هـەمـووی کـە دادی خوایـە
هـەر قـەناعـەتـە خێـری لـە دوایـە



ڕابواردنمـــان هـــەر بـــە قومـــارە
قومارســەریــشی بیــری هــەر مــارە
هـەمــوو حـەرامــێ زەوقێکــی تیایــە
هــــەر قومارבــازە دوایـــی ڕســـوایە
ئـافرەتێکـی جـوان حـەزی لـێ ئـەکـەی
عـەشـق‌و زەوقێکـی تیایـە، تێـی دەگـەی
هـیچ نـەبـێ لـە دوای وەسـڵ تێـر ئـەبـێ
ئەم شەویش نانوێ، تا بـۆی کـوێر ئـەبێ
ئەم خەڵکە لەگـەڵ یـەک دۆسـت و یـارە
ئامۆشـۆو ڕەفتیـان، لـە لای یـەک دیـارە
(ئـەنگـاژە)ی قومـار کـە یـاری نـەبـوو
جوولـەجوولـێتی لـە پـڕ بـۆی دەرچـوو
زۆریـشمان هـەیـە هێنـدە (ئـەحمـەق)ین
نـازانین، دۆسـت نـین، بـۆ قومـار شـەقـین
(خومـــار) و (قومـــار) جووتـــە بـــوارە
ڕەشـــــی‌و ســـــپێتی تێـــــدا دیــــارە
بـەڵام بـۆ ئـەهلـی مـەراق هێنـد خۆشـە
بۆ شـەوێـک هـەرچیـت هـەیـە، بیفرۆشـە
هەرچیم دەست ئەکەوت ئەمدایە کایە
ئــەیـانگوت (پۆکــەر) زەعیمــی تیایــە
وەک (حوسنی زەعیم) مارشاڵ جۆکەر بووم
کـە پۆکـەر نـەما، ڕوانـیم (نۆکـەر) بـووم



زۆر کەس ئەبینی لە گیان بێزارە
کە سەری ئێشا، دەم بە هاوارە
تا ئەچینە خاک هەولی ژیانمانە
هیچ ناشلێین ئەجەل کە کەمینمانە
گۆڕەوشار نوقتەی غافل لێک ئەدا
ئەیکا بە عاقل ئەوسا لەویدا
بەلام فایدەی چی ناگەڕێتەوە
دنیا بە تەنیا لەو ئەبڕێتەوە
بە خواجەیان گوت: قیامەت کەیە؟
وتی: کە مردم، مەحشەر ئەوەیە
ئەڵێن: فەلەستین لە دەست حەوت دەولەت
چۆن وا بە ئاسان دەست جوولەکە کەوت؟
وتیان لە پێشدا قووەتی ئیمان
ئەو فەلەستینەی دا بە موسولمان
ئەوانیش چاویان لە موسولمان کرد
بە عەزم و ئیمان فەلەستینیان گرت
ئەم ئالو گۆڕەی موسولمانو جوو
بە ئیستیغفارێک وەرگەڕا، تێکچوو
گەڕاینەوە سەر جیهادو ئیمان
هیچ کەس لە گەلمان نایێتە مەیدان
ڕێی ڕاست ئەمەیە گەر ڕاستت ئەوێ
کە دیوار ڕووخا، بانیش ئەکەوێ



چەقۆی (مالووم)و کێردەکەی شەیتان
تا خوێن بڕێژن، تیژن، بێ (هەسان)
زۆرتر لە ڕۆژی موبارەکدایە
ئەم پیاو کوشتنەو شەڕو هەرایە
ماتەمەی گەورەی نۆزدەی ڕەمەزان
بریندارکرا کە شێری یەزدان
(عەلی) (لافتی)ی (بەدر)و (حونەین)بوو
هەم بابی عیلمو بابی (حوسەین)بوو
ئێشی برینی ئەو هێشتا ماوە
برین لە لەشی ئیمان کراوە
ئەمە تەقدیری ئەزەلیی خوایە
لەولاوە دەستی شەیتانی تیایە
ئەمە ئەساسی دەوری جیهانە
کە نەڵێن کەسی تیا شادمانە
لەلایێکەوە پیاو پیاو ئەکوژێ
مایشەوە برا خوێنی ئەمژێ
دوێنی (شێخ غەزبان) لە حیللە هەروا
برای خۆی کوشتی بە نای ناڕەوا
خۆیو کوڕێکیو ژنو منداڵی
کوشتو ئاگری بەردایەماڵی
ئیرسی (قابیلە) پێمان بڕاوە
بە دیموقراتی کارمان تەواوە



فـەنـدو فێـڵێکیوای هـەیـە شـەیتـان
لـە کـەتـنو پـەتـنی تێناگـا ئینـسان
(چۆلـەکـە)یێکـی شـوان خـەڵـەتینـە
ئـەخاتـە پـێش شـوان، هـا بگـرەو بێنـە
وا لـە بـەردەمیـا (قونـەی) بـۆ ئـەکـا
هـا لێـرەو لـەوێ، گاڵـتەی پـێ دەکـا
دەسـتی بـۆ دەبـا ئـەو هـەڵـنافڕێ
بـە قونـە نـەختـێ، لێـی تێئـەپـەڕێ
بـەو ڕەنگـە هـەتـا دووریـەخاتـەوە
(ڕانی) لـە بـیرو هـۆش ئـەباتـەوە
لـەولاوە گـورگیش وا لـە کـەمینـدا
بـۆ هـەل دەگـەڕێ، لـە سـەرزەمینـدا
کـە زانی وا شـوان ڕانی لـێ گـوم بـوو
پـەلامـاریدا، لـە مێگـەل بـەربـوو
مـەڕ ئـەبارێنـێو گـورگ ئـەیفـڕێنێ
شـەیتـان پیشەی خـۆی وا بـەجـێ دێنـێ
شـوانێ کـە ڕانی پـێ سـپێرراوە
شـەرتـە شوانیـشی خـۆی پـێ دراوە
بـۆ پـارویێ گۆشتی چۆلـەکـەی هـەژار
ڕان بە جێدێڵێ بـۆ گـورگی خوێنخـوار
کاربـەدسـتێکە کـە بـۆ قرۆشـێ
بـە تـەفـرەی شـەیتـان میللـەت دەفرۆشـێ



گـــوێ لـــە پـــیرانو بـــاپیران بگـــرن
لـە هـەر خـەسـلوێ پـەنـدێ وەرگـرن
دەســـتێ نـــەتـــوانی بـــە زۆر بیبـــڕی
ئـەبـێ مـاچی کـەی، بـە چـاو بیـسڕی
ئـەگـەر (تـەناسـوخ) ئـەسـلی ببوایـە
بهاتنایـــەوە ســـەر ئـــەم دنیایـــە
ئـەشـیا زەرەرمـان لـە هـەرچـی دیبـوو
بـۆی نـەچووینایـە، هـەروا زووبـەزوو
بـــەلام بنیـــادەم هێنـــدە لاســـارە
گـوێ ناداتـە ئـەم تـەجروبـەو کـارە
خـۆ نـەخـوازەلا، ئێمـەی خـۆش بـاوەڕ
کـە بـۆ گـەورەکـان بـووین بـە بـارەبـەر
چۆنمـان لـێ خـوڕن ئـەو ڕێیـە ئـەگـرین
دوایی هـەر خۆمـان بـۆ خۆمـان ئـەگـرین
خۆ ئەدەین بە کوشت گـشتمان بـەرەودوا
ئـەڵـێن: بـە دەردی خـۆی مـرد، بـا بـڕوا
بە خەنجەر چووینە سـەر سوپای دوژمـن
پێیـان ئـەگـوتین: (بـە کۆمـەڵ بمـرن)
لەوەیش ڕزگار بووین، دیسان نەسرەوتین
لـە جـاران زۆرتـر، ڕەدوویـان کـەوتـین
وا (بـڕووخێ)یـشمان تـاقی کـردەوە
بـەس بـێ ئیتـر ئـەم پیـشەو کـردەوە



کاری بۆ ناکرێ دەستی بێ پەنجە
ماڵداری بێدۆست، بە خەم و ڕەنجە
قاڵب و قیافەت چ دادێک ئەدا
سەیرکە وەلەکێک حوستر یخ ئەدا
لە سەر ئیشێک بێ و دڵێک بشکێنی
لێت ئەسێننەوەو دۆش دائەمێنی
کە بەرامبەری دوژمنت نووستی
بە هیوا مەبە کە ساغ هەڵدەستی
ئەو خەوت خۆشە کە بێ دوژمن بی
نەک لە ترسانا لە کون و قوژبن بی
کە تۆ بە خەیاڵ زۆر بەرز بفڕی
کە کەوتی پەتۆ نابەی ئەمری
هەرچەند بە چنگ و گورج و چالاک بی
نابێ لە مەکری فەلەک بێ باک بی
چاری گوزەران بەرچاو تیرییە
دۆست پەیدا کردن، بە چاودێرییە
ئەوەی کە ئەتبێ و لێی ئەدەی بە خەڵک
بە هەردوو دونیا بۆت ئەبێ بە کەڵک
ئەوی خۆی ئەیخواو هەر بە تەنیایە
لە بین ئەگیرێ، چاوی لە دوایە
خۆ هەرچۆنی بێ، هەر ئەبڕێتەوە
کەواتە، وابکە بێتە ڕێتەوە



خـــوا دەســـــتووریکی دادی دانـــاوە
ئەوی کـە کوشتی، ئـەویش کـوژراوە
گـەورەیـی خۆشـە، خـوا بیـدا بـە پیـاو
بــەڵام نــەک لــە پــڕ هاتبێتــە نــاو
چونکـوو لـە پـڕێ کـە بـوو لـە کـوڕێ
زوو بـایی ئـەبـێ، کـەڵـکی ئـەبـڕێ
ئەو بایی‌بوونەیش، هەر خواستی خوایە
(ان الانـــــسان لیطغـــــــی)وایــــــە
غورروور بوو، (حوسنی زەعیمی) فەوتانـد
بـایی بـوو، دڵـی زۆر کـەسـی ڕەنجانـد
بەڵام ئەو خوێنی کەسی‌وای نەڕشت
هێجگار (موحسین)یان بە ناڕەوا کوشت
ئــەم کــارە لکـــی لـــێ ئـــەبێتــەوە
هـــــەروا بـــــە ئاســـــان نابڕێتـــــەوە
هــەویــری فیتنــە زۆر ئــاو ئــەکێـشێ
دوژمـــنی نـــاوخۆ ڕەگ دەردەکێــشێ
کە (ئەهلی سەلیب) هاتنە فەلەستین
ئینگلیـزو فـەڕەنـگ، لێـک کـەوتنە قـین
بۆ (سەلاحەدین) فرستەت پەیدا بوو
ئـــەگینـــە دونیـــای لـــێ خرۆشـــابوو
خـوا لـە گـەردشـی عـەسکەرو فـەقێ
بمانپیـــارێزێ و بۆمبـــا نـــەتـــەقـــێ



ئەوەی لە لای تۆ زەمی دۆستی کرد
بە بێوەفایی ئابڕووی خۆی برد

بە دزبان نوقتە ئەچێتە سەر (بێ)ی
ئاخری زیانی زوبان دێتە ڕێی

کەس ناکەسیش بێ، لێت نابێتەوە
تفی بەرەو با ڕیش ئەگرێتەوە

ئەوی بێبەشە لە عارو ناموس
هەر لە خۆیەوە ئەبێ بە (جاسووس)

ئەوی نەزانی کە کوڕی کێیە
لە گەڵیا مەچۆ، بۆ هەموو جێیە

عیلمی قیافەت بکەی بە ڕەهبەر
ڕێی پەشیمانیت هیچ نابێتە بەر

گەنمی ئادەمین هەرچەند هاڕاوین
ئاردێکین بە ناو درکا چێنراوین

پیاوی بەد ئەخلاق هەتا بخوێنێ
شەیتانەتەکەی شێدەت ئەسێنێ

خوێندن خولقی چاک بەهرە دەردەخا
ئەخلاقیش خوێندن بنج بەستی ئەکا

هاوین پایز هەر ڕەشەبایە
بۆیە ئەم شارە کوێری زۆر تیایە

چاوساغی کوێریش، هێند کەوتۆتە ناو
زۆر کەس ناچارن بە بەستنەوەی چاو



هەندێ پیشەی من لەگەڵ خەڵک جویە
خۆش گوزەرانیم زانی لە کویە
من ئەگەر ڕاست بێ، پیریکی ژیر بم
نابێ لە تانەی دوژمن دڵگیر بم
ئەوی پیم ئەڵێ ئەگەر بێو وابێ
نەسیحەتێکە ماڵی ئاوا بێ
ئەبێ ئەو خولقە خراپەم چاک کەم
خۆم لە توانجی بەدگۆ بێ باک کەم
کاتێ لە خۆما نەقسم نەمێنێ
کردەوەیچاکم لای خەڵک ئەنوێنێ
خۆ ئەگەر تانەی دوژمن درۆ بێ
با ئەو بەدناو بێو هەر ڕەنجەڕۆ بێ
ئەوسا بۆ منیش ئەبێ بە عیبرەت
بە درۆ لە کەس ناکەومە غەیبەت
بەڵام کە وابم لێرە هەڵناکەم
زەحمەت بێ غەیبەت ڕەفیق پەیدا کەم
چارەی غەیبەتمان بە (قومار) ئەکرد
پارەمان نەما، وا دەرمان نەبرد
ئێستا بە ناچار وەک ئەحمەد حەیتە
ئەکەوینە سەر ڕێگای ئەم بەیتە
قوماران نەکەن، قورئان دەخوێنم
بە درۆ خۆم وەک عابید دەنوێنم



خـــووێکی بـــەدە بـــۆ فـــەرو مایـــە
شـــەڕ بـــە کۆنـــەقـــین دێتـــەوە کایـــە
بیـــستوومە ئـــەڵـــێن قـــین ژەنگـــی دڵـــە
دڵ کە ژەنگی گرت بۆ شەڕ بە کوڵە
لامواپـــە ئـــەوەی کـــە ڕەق هـــەڵـــگرە
لـــە دوژمنـــەکـــەی نـــاڕەحـــەتتـــرە
ئـەیچێنێتـە دڵ کـەی بـۆی هـەڵـکەوێ
دوژمـــن بدانـــە بـــەر خـــەنجـــەر شـــەوێ
هـــەر بـــەو داخـــەوە ســـرەوتی نابـــێ
بـــە قوڕگیـــا ناچـــێ نـــانو کـــەبابـــێ
موسوڵـمانی ڕاسـت ئـەوەی زۆر چاکـە
کـــە لـــێبـــوورد ئیتـــر دەروونی پاکـــە
بـــەڵام لـــە پیـــاوی سپـــڵە مـــەبـــوورە
چونکـــوو بـــەدنمـــەک لـــە وەفـــا دوورە
ئـەگـەر چاکـەت کـرد لـەگـەڵ ناپاکـا
خراپـە ئـەکـەری لـەگـەڵ پیاوچاکـا
بـــەڵام ئـــەم چـــاکو خـــراپ ناسینە
خـــراوەتـــە نـــاو لوولـــەی مـــەسینە
هـی ئـەوتـۆ هـەیـە کاتـێ ئـەیناسـی
کـە لـە کـەمـەنـدی فێـڵیا بتاسـی
بـەڵام تـۆ چـاک بـەو لـەمـان مـەپرسـە
بـــڵێ: (بـــەد بـــە خـــوا) ئیتـــر مـــەترسـە



پـەڕەی تـەقویمێـک کـە هـەڵـیەپچـڕێ
ڕۆژێـک لـە عـومری خـۆت دائـەدڕی
پـارەی مـەعاشـت کـە لـە دەسـت ببـڕێ
هـەولـی ئـەوەتـە زوو مانـگ تێپـەڕێ
نـازانی کـە ئـەو مانـگو ڕۆژانـە
عـومری چـەنـد هـەزار ئینـسانە
ئەو عـومرەی ئـەمڕۆ کـە لێـی بێـزاری
بـۆی دەکـەوێتـە شـیوەنو زاری
بـەڵام فایـدەی چـی بـۆت نایـەتـەوە
لێـت تـۆرا ئیتـر ئاشـت نایێتـەوە
تـیر کـە تـرازاو دەرچـوو لـە کـەوان
نایێتـەوە بـە ئامـانو زەمـان
عـومر بـە کـورتیو دریـژی نیـیـە
هونـەر بـە گـورجیو زۆریـژی نیـیـە
عـومرێکی کـەم و بـەخێـرو خۆشـحاڵ
خۆشترە لە عـومری دووسـەد ساڵـی تاڵ
کـە سـەرمای زسـتان هـەڵـی چۆقانـدین
قـەدری بـێبـەرگیـی هـاوین ئـەزانـین
کاتـێ قـەدری دان کـە لات ئـەنوێنـێ
دانی لاعیـدە پووکـت بێـشێنێ
حەسرەتی عومری ڕابوردوویش بۆخۆی
دەردێکـە زیـاتر خـەمـی پـی دەخـۆی



دەوری زەمانـــــە وەهـــــا گـــــۆڕاوە
یـــاریی پێـــشوومان مـــۆدەی نـــەمـــاوە
یاریی ڕۆژ جۆێ بوو، کوڕ گەلیش بە شەو
بەزمو ئاهـەنـگ بـوو تـادەکـەوتنە خـەو
فنجـــانێن، گـــەنم گـــەنم، مـــشعەران
ڕێـوی چـوو لـەگـەڵ سـیخورمە لێـدان
ڕۆژیـش شـەڕەتـۆپ بـە دووبـەرەکـی
کـە ئـەیـشهاتنەوە شـەڕەگـەڕەکیـێ
کەوشەکـو، یـەکـەوحـەیـزەران بـاو بـوو
بـە بـابی بـابی کـەر خـوا پێـداو بـوو
کە ئەیانپرسی کەر سوار بێ یا سوار؟
بیوتایـە کـەرا سـوار ئـەهاتـە خـوار
وەک ئێـستا سـواری ئـەدرایـە کـەر
بـەڵام دەورێکیـان ئـەئـەبـردەسـەر
قـەلـەمـرداریش وەک ئێـستە دوونـان
بـە تـەڕووشـکی ئـەبـوون بـە چـوار نـان
ئـەوسـا ئـەیـانگوت نـادان پـەسـەنـدە
دانـا بـە پـارە ئـەگـا بـە بـەنـدە
گـــــڕو پفێکـــــە ئـــــاگری دزان
دوایـی کـە گـیران ئـەکـەونـە زینـدان
کـەچـی درۆ بـوو ئـەو تـەسـەللایـە
دزو پـــــارەدار لـــــە بـــــرەودایـــــە



شەیتان وا لە سەر کێوی ئارارات
بانگ ئەکا ئۆخەی وا ڕۆژی من هات
دەرسێکی ئەوەی ئادەمم دادا
عومری یەکتری بدەن بە بادا
قونبولەی زەڕیەم پێ ئیجاد کردن
باشە بۆ یەکتر پێ لە ناو بردن
کە لەگەڵ زەڕی ئەو جاشەکەرە
ئەڕوانی شارێک ژێرەوەزبەرە
ئەڵێن لای خواوە غەزەب بباریّ
(قاروون) بەئەرزدا ئەباتە خواریّ
ئەو یەک قاروونی دۆستی منی کوشت
من دونیاکەی ئەو ئەکەم بەروپشت
عالەم بە ملیۆن تەفرەی من ئەخوا
تەرەفداری من زۆرترە لە خوا
ئەو رزقیان ئەداو بەخێویان ئەکا
وا بە قسەی من چوون بە گژیەکا
ئەو شێخو مەلا دێنێتە ڕووی کار
من ئەهلی فەنیان لێ ئەخەمە کار
تف لەوەی کە وا بە تەفرەی شەیتان
وا بە جاریّ قڕ ئەخاتە ئینسان
ناوی سەگ لەوان بە چاکتر بەرە
سەگ لەوان گەلیّ بیّزەرەرترە



دراوسـێش زەرپـەی دەنگـی دایـەوە
هـەر تـەنها (ئینگلیز) بێ دەنگ مایەوە
تـەمـەو بارانـەو ئاگربارانـە
بارانـەی کوشـتار بـۆ هـەزارانـە
(ورچیش) لە بەشەر خۆی کردووە بە شێر
بـە نیـوەی دنیـا، چـاوی نابـێ تێـر
سـا (ئـەمـەریکـا)ی لـە سـەر نـەبوایـە
بـا لـە (قاریـات)دا وا گـیر بمایـە
لـە (مـازوری)دا تـێلا بـە دەسـت بـوو
لە نـاو زۆنگـاودا گـیرۆدەو پەست بوو
کـە تـۆ یاریـدەی زاڵـمێکت دا
دوایـی چـەپۆکـت بـەسـەرا ئـەدا
لـە خۆیـایی بـوون، کـەوتـنی لـەدوایـە
سـەیـری (هیتلـەر) کـەن، دنیـاکـە وایـە
بـەشـەر تاقـەتی شـەڕی نـەمـاوە
تـا چـاو کـار ئـەکـا، دنیـا خوێنـاوە
نـازانم مـردن بـۆچ وا ئاسـانە؟
بـەرەوپـیری مـەرگ شـایی‌و سـەیرانـە
هـەر دیـنی ئیـسلام ڕێـی سـەلامـەتـە
(لا تلقـوا...) ئـەمـری خوایـەو ئایـەتـە
مـن چـیم لـەمانـە؟ هـەر پۆکـەر خۆشـە
نامپـەرژێتـە سـەر ئـەم واتـەی بۆشـە



دەوری هـات، دۆسـتت لـە دەورت زۆرە
بـە (نـەهـات) هـاتنی خزمیـشت زۆرە

تـۆ تـوورە مـەبـە، دنیاکـە وایـە
وەک (سەعدی) وتی: نان بۆ کەوایە

جاران ئەم کوردە هێند بەوەفا بوو
دزیشیان قەدری وەفای لە لا بوو

دز چووبـوە ماڵـێک لـە کوپـەیێکـا
خوێی دیبوو کە خوێیش لە شەکر ئەکا

کە لێی چەشتبوو زانیبووی خوێیە
ئەڵێ: (نمەکم کردن) لەو جێیە

هەرچی دزیبووی، دای ئەنێتەوە
لە (بەدنمەکی) ئەسڵەمێتەوە

ئێستا کە پارووت کرد بەدمیەوە
پەنجەیشت ئەخوا، هەر بەدەمیەوە

تۆ تێری ئەکەی لە نانو کەرە
ئەو کە تێری خوارد، پێت ئەڵێ کەرە

من شەویکیان خۆم ئەمەم گوێ لێبوو
تاریک بوو یەکێ کە لە سەر ڕێ بوو

ئەیگوت ئەم کەرە بۆچی وا دەکا
ئەم هەموو چشتە چۆن پەیدا ئەکا

هەیشە کە ئەڵێی سەروماڵییە
ئەو کەماڵەیشیان، لە کە ماڵییە



هەر داری لقی زۆر لێ بێتەوە
ئیتر ئەوەندە بەرز نابێتەوە
ڕووباریش جۆگەی زۆری لێبووەوە
گۆڕەی نامێنێ لە پڕ چووەوە
ولاتێک حیزبو میزبی تێکەوێ
هەرچی دەستی بوو، بەشی خۆێ ئەوێ
دووبەرەکانی ئێلێکی فەوتاند
سەودای سەرکاری زۆر دڵی ڕەنجاند
زۆریوا هەیە خۆی خۆی ناناسێ
خۆی هەڵدەکێشێ پڕ بە کراسێ
خۆی لە ئاوێنەی دیوارئەبێنێ
خەریکە بە (گەڕ) کڵاو بفڕێنێ
ئەگەر بە (تۆپز) قۆڵی نەشکێنێ
ئەکەویتە ژێر بار، دۆش دائەمێنێ
ترسی دیوانی نەبێ لە ناوا
بناوانی حەق ئەڕوا بە ئاوا
ئەم دەردی سەرییە خواستی خواییە
هەرچی ئەبینی لە خۆی باییە
لە بێ کارییە ئەم کاروبارە
تاریکایی شەو ئێوارە دیارە
کەوا، کەوتووینە تەنگو چەڵەمە
گای گێرەشێوێن بخەیە (کەڵەمە)



عەیبی خۆت زانی، ئەوسا غەیب‌زانی
غەیبەتت ناکەن ژنان لە کانی

مەدحی شاعیرو دۆستی سەرسفرە
لە خشتەت ئەبەن، گوێیان لێ مەگرە!

چاو لە ماڵی خەڵک مەبڕە، حەرامە
بەشی خۆت بەس بێ حەلال بەتامە

چاوبرکێ مەکە، چاوت ئەبڕن
پەردەدڕ مەبە، پەردەت ئەدڕن

تۆ بزانە ئەگەر زۆریان لێ کردی
هاتنە ماڵەکەت چشتێکیان بردی

چەند پێت ناخۆشە، لای خەڵکیش وایە
دەستت درێژ کرد، کورتی لەدوایە

با وجوود ئێستا دەوران گۆڕاوە
تاریکەشەوەو (جەردە) لە ناوە

هەرچی ئەیبینی فڕان فڕانە
بۆ خۆیشیان نییە، بۆ گەورەکانە

لە مەڕ ئەفڕێنن، ئەیدەن بە گورگان
حیزی مایەپووچ، بە فڕکان فڕکان

ئەمانە هەمووی بێ ئیمانییە
لە ئاین لادان ڕێی شەیتانییە

ئەم بێدینیەو خوا نەناسی
کاری کردۆتە ڕوکنی ئەساسی



لامواپــــە ئیتـــــر دنیـــــا ئـــــاخرە
نیـــشانەكانــەی یــەك یــەك زاهــیرە
ئیمـــان بـــووەتــــە پـــشكۆی ئـــاگری
هـــیچ كـــەس ناتوانـــێ لا دلا ڕایگـــرێ
بـــە جـــارێ بـــرا لــــە بـــرا بـــڕاوە
ئـــەولاد لـــە بـــاوكی خـــۆی وەرگـــەڕاوە
فیتنــــەو درۆزن باویــــان ســــەنـــدووە
تـــۆوی فـــەســـادو شـــەڕیـــان چانـــدووە
دڵـی كـەس لـەگـەڵ كـەسـدا پـاك نیـە
لـە گـەورە شـەرمو لـە خـوا بـاك نییـە
ئـــەســـناف ئینـــسانی نـــاوە بـــەلاوە
حوقفەی ڕاست لە لای كەسیان نەماوە
سەنگی كێشانە، هەمووی هەر سەنگە
(بـــازاڕ ئاغاســـی)ش لێیـــان بـــێدەنگـــە
یـەكبـەدەی جـاران ئـەرزاق ئـەفرۆشـن
بۆیـــان هـــەڵـــكەوێ نێـــریش ئـــەدۆشـــن
هاكـــا ئیـــسرافیل ســـووری خـــۆی لێـــدا
دنیـــــا گیانـــــداری نامێنــــێ تێــــــدا
ئـەوسا پـارەو مولـك بـە جـێئـەمێنـێ
(مـەڕنـەموو كـە)یـش گـورز ڕادەوەشـێنێ
مـــاڵو دەولــــەتیـــان بـــۆ بـــار نـــاكرێ
پـــەشـــیمانی و داد كـــەڵـــكیان نـــاگرێ



چەرخی فەلەکی سونعی کردگار
هەر لەوڕۆژەوە کە کەوتۆتە کار
ئەسووڕێتەوە لە دوازدە بورجا
ئێمەیش لەگەڵ ئەو هەر واین لە ڕەنجا
ئەم دوازدە کەلوەیش ناویان نراوە
یەکی سی ڕۆژە مانگی تەواوە
بە سێ سێ مانگ فەسلێک ئەگۆڕێ
چوار فەسلە سالێک کە ڕائەبووڕێ
بەهارەو هاوین پایزەو زستان
لە سەر هیچ بارێ نامێنێ جیهان
زۆر کەس بەهاریان کە لەلا خۆشە
دەشتێکی سەوزو گوڵو وەنەوشە
بەلام هاوینان فەقیرو هەژار
لە بەرگ و ئاگرو ژوور ئەبن ڕستگار
ئە ڕۆژ ئیش ئەکەن شەویش بە بێ نوێن
لە لادیواری هەروا هەڵئاژێن
هەر پایز خۆشە بۆ پیاوی نەوسن
میوەو سەبزەو گۆشت تێدا زۆر ئەبن
دوڵەمەند خوانی ئەرازێتەوە
فەقیر بۆ نانێک ئەپاڕێتەوە
ئەم دوو ئەحواڵە هیچیان تا سەر نین
چونکوو هەردوولا بۆ مردن ئەژین

پیـاو لـە لاوە بێـت لاویـش بـێ ئـاوە
وا ئـاو ڕۆیـوە، هێـشتا زیـخ مـاوە
لەگەڵ ئەوەیشداکە زیخ بێ کەڵکە
غەیرەیش بێ بەرە، وەک داری پەڵکە
هەمووی یەتە سەر ئیستیعدادی خۆت
ئەگەر خۆت باش بی، عالەم چاکە بۆت
چـاکیی بنیـادەم دڵو دەروونـە
کە تۆ دڵسۆز بی خەڵک لێت مەمنوونە
چاوت لە ماڵی کەس نەبێ مەردی
کە بەخشنڕەیش بی، وا جەوانمەردی
دڵئازارییـە زاری لـەدوایـە
خـەجاڵـەت بـاری قـاپی خودایـە
زاڵـم زەواڵـی بـۆ دانـراوە
لـەم دنیایـەدا زۆری بینـراوە
بەڵام هەوای نەفس پیاو بێعار ئەکا
هەرزەچەنەیش خەڵک بێزار ئەکا
پیـاوی نـەزان دوو دڵ ئـەڕەنجێنـێ
سـەگـی هـەڵـەوەڕ دزت بـۆ دێنـێ
کـەمتیـار لـە لای گفتگـۆی چاکـا
قوله پێی ئەسمی ئەو هیچ دەنگ ناکا
بـرینی لـەشـت چـاری دەوایـە
بـرینی دڵـت سـارێژی نایـە



پیـاو لـە کـاری خـوا سـەری سـڕماوە
لـەم دنیایـەدا مـەحـشەر هـەڵساوە
ئەڵێن ڕۆژی حەشر نەفسی نەفسیە
نە باوک و برا، نە کەس کەسیە
ئەگەر باوەڕت بەو ڕۆژە نییە
بچۆرە بازار بزانە چییە؟
لە هەموو لاوە پاش قولەو چورتم
نەشارەزاکان کەوتوونە سەرسم
ئەیانگوت کاسب حەبیبی خوایە
کاسبی حەلاڵ بەرەوی تیایە
ئێستا کاسبی حەلاڵ نەماوە
بۆیە بەرەکەت وا هەڵگیراوە
خۆ ئەوەی کە سەنگ لە خەڵک ئەگۆڕێ
خۆیشی ئەیزانێ نایاتە گۆڕێ
لەگەڵ ئەوەیشا تا بۆی هەڵکەوێ
تەرازووبایی زۆرتری ئەوێ
ئەمانە هەمووی تەفرەی شەیتانە
نیشانەی دەوری ئاخر زەمانە
بە مەلایان گوت قیامەت کەیە؟
وتی کە مردی مەحشەر ئەوەیە
تا خۆمان نەمرین نازانین چییە؟
بە مردنی خەڵک باوەڕمان نییە



حیکایەتەکەی تەلیسم و جادوو
ئێستا لە ئێمە وا کەوتۆتەڕوو
بە فێڵ کەوتووینە ژێر ئەم زەمینە
هێزمان بڕاوە و بارمان سەنگینە
هیوامان تەنها لە لای خوا ماوە
دوو بەران لە ژوور سەرمان وەستاوە
یەکێکیان سپی، یەکێکیان ڕەشە
دیارە بەرانی ڕەش، بە گەردشە
ماوەتە ئەوەی خۆمان بهاوین
سەر سپی کەوتین، وا خەڵەساوین
کەوتینە سەر ڕەش، ڕۆژی ڕەشمانە
تا دەمرین شەڕ و نەگبەت بەشمانە
تەجروبەی تالع شەرتێکی تیایە
پەنا بە حەول و قووەتی خوایە
ئەبێ ئیبتیدا بە بیسمیللا بێ
با ناوی خودا دەفعی بەڵا بێ
ئێمەیش وەک کابرا، یا جنۆکەو خێو
بیسمیللایان کرد، کەوتووینە جێو
کەواتەی مەڕی ڕەش بەختمانە
مایەی ڕزگاریی ئێمە ئیمانە
کاتێ بە جەزبەی ئایینی ئیسلام
هاوار کەینە خوا ئەگەینە مەرام



سەعاتێکم بوو، بە شەرت سەعات بوو
ئەوسا بۆ نوێژو جەمات میقات بوو
کارخانەکەیشی (ئەبو تەمغا)بوو
لە ناو سەعاتی‌تردا ئاغا بوو
ڕۆژێ لە ناکاو زریزەی پچڕا
کەوت بە بەردێکا خوستی لێ‌بڕا
سەعاتچییەکی مامناوەندی بوو
بەردۆ ناوی (سالحە فەندی)بوو
سەعاتم بۆ برد، بۆی خستەوە گەڕ
دوایدوو ڕۆژ کە نووست لێمان بوو بە شەڕ
ئینجا بردمە لای وەستایێکی‌تر
بەلام فایدەی چی؟ یەک لە یەک بەدتر
هەر بۆ ئەوەبوو پارە بستێنن
بە فێل‌و فەرەج لە خەلک دەربێنن
ڕۆژێ یەکێکیان بە ڕاست پێی لێ نا
وتی کەسی ڕاست نەما لە بەینا
کە ئێمە سەعات باش چابکەینەوە
پارەمان نابێ چا بخۆینەوە
دەورێکە ئەبێ پیاو سفرەدڕ بێ
بازار هەلگیرا گیرفانی پڕ بێ
مندالی زۆرو مەعاشێکی کەم
دەست‌زەنی نەکەم، بە چی هەلدەکەم



پارەی پیاوی ڕژد، کە هەڵی ئەگرێ
خۆیشی لێی ناخوا هەتاکوو ئەمرێ
شووشەی نوقڵێکە بە سەر ڕەفەوە
تامەتامییە، هەر لەدوورەوە
کە خۆی مرد شووشەیش کەوتۆتە خوارێ
چەکمەبۆر نوقڵی خوای بۆ دەبارێ
میراتگر لە پڕ پارەی دەستکەوێ
ئەیکا بە شڵپەو کەیف هەموو شەوێ
خۆزگە مردوەکە کە چاوی لێ ئەبوو
ئازاری گۆڕی گرانتر ئەبوو
خۆزگە ماباقی دەوڵەمەندەکان
کە ئەم حاڵەیان ئەدی بە چاوان
ئەم دەردە بۆیان ئەبوو بە عیبرەت
نەیان ئەخستە دوای خۆ، بە حەسرەت
نەک بە سەفاهەت، لە ڕێی خوادا
بەشی فەقیرو هەژاریان ئەدا
خو ئەگەر ئوای خۆی میراتگر زۆر بێ
ئەبێ بەشی ئەو هەر گۆڕبەگۆڕ بێ
چونکوو ماڵی ئەو میقرۆبی شەڕە
لەگەڵ یەکتردا دەعوایەو گەڕە
ئێستا خۆ پارەی زەکات نەماوە
قەرزی ئاینیان ناوە بەلاوە



چلەی زستانەو چلەی هەژارە
شەڕەدار لە سەر خەڵووزەو دارە
دەرەجەی هەوا، وا (تحت السفرە)ە
دەرەجەی فەقیر، لە چەپدا سفرە
بێ پارەییەو نینساف نەماوە
خوا بەردی بەستووەو سەگی بەرداوە
خوا نەناسینە وامان لێ ئەکا
خوا کێو ئەبینی بەفری تێ دەکا
چونکوو کاسبیی حەلاڵ نەماوە
بەرەکەتی ڕزق وا هەڵگیراوە
کردەی ئێمەیەو بردەی شەیتانە
چۆن سەر ئەگرێ ئەم دەورو دووکانە
ئەمە دەردێکە لە زۆر جێ عامە
خەتا سوورەیە و نزیک بەشامە
خوا لە گوناهی ئێمە ببوورێ
ئای خەتەسوورێ، لە ئێمە دووری
ئێمە مەلیکمان بە نووهاشمە
لە لای خوا پشتمان بەوان قایمە
ئەڵبەتە سایەی نەسلی پێغەمەر
بۆ ئەم عیراقە ئەبێ بە ڕەهبەر
بەلام وا چاکە کە خۆمان چاک بین
پشت بە خوا بەستین، بەوە بێباک بین



خـوا (قـەومـی نـووحی) لـە ئـاوا خنکانـد
(قـەومـی عـاد)یـشی بـە بـا هـەڵـفڕاند
(شـەداد)و قـەومـی سالـحی شـەقـی
بـە نـەعـرەی مـەلـەک زراویـان تـەقـی
ئێمەیش وا لـە ژێر بەفرا ڕەق هەڵـدێین
نازانین لە دەست غەزەب چۆن هەڵدێین
خۆ (بەغدا)یش دیارە لـە ئـاو ناترسێ
دەورێکە هیچ کەس لە کەس ناپرسێ
دەوڵـەمـەنـد گـەمێـی لـە نـاو ئاوایـە
لـە هـەژاری چـی؟ دنیـا ئاوایـە
(سـاوی الـی جبـل یعـصمی)
هـەر ئـەوەنـدە بـوو، تـا گـەیـە تـینی
ئێـستا لـە بـەفـرا کـەوتووینـە هـاوار
خـوا دێنینـە یـاد ئـەویـش بـە ناچـار
کـە بـەهـار هـاتو تێپـەڕی زسـتان
نـە بامـان دیـوەو نـە بـەفـرو بـاران
دیـارە کـە مایـەی ئینـسان، نیـسیانە
لـە ڕێـی خـوا لادەن تـەفـرەی شـەیتانـە
نـازانین دنیـا بـۆ کـەس نامێنـێ
(عیزرائیـل) لـە پـڕ گیانمـان ئـەسێنێ
هیچیـشمان لـەگـەڵ خۆمـان بـۆ نـابرێ
دەوڵـەت بـە مێردی تـازەی ژن ئـەبـڕێ



جاران ئەگەڕان بۆ ئیش لە شوێن پیاو
یەکێکیان ئەویست ڕەسەنی ناسراو
وەجاغزادەیی بە ئیرس سەندبێ
دەرسی مەجلیسی باوکی خوێندبێ
شەرمی ناموسی باوکی بیگرێ
بە هەوای جاەو مەسنەت نەخۆڕێ
چونکوو ناوەجاخ نۆرەی کەوتە بەر
خۆی لێ ئەگۆڕێ، کار ناباتە سەر
ئەمە ئیجابی چەرخی دنیایە
حوکمی ئەزەلیو تەقدیری خوایە
(ان الانسان لیطغی)ی فەرموو
کە ئیستیغنای دی، بایی ئەبێ زوو
پەست پایە لەگەڵ کەوتە سەرمەستی
جڵەوی هۆشی دەرچوو لە دەستی
بواری ئاوو شەراب ئەم دوانە
مەحەکی لەشو عەقڵی ئینسانە
ئێستا ئەمانە باوی نەماوە
خۆهەڵکێشانو دەم گەرمی باوە
بۆیە وا دنیا تێکچوو بە جارێ
لە ئاسمانیش هەر بەفر ئەبارێ
لە وجوود هەمووی خواستی یەزدانە
چەوتی چەویلی ئێمە بەهانە



هەندێ بەپیری ئاخرشەڕ ئەبن
فێری گەڕ ئەبن ئەوسا كەڕ ئەبن
هەندێكی تریش كە گەڕانەوە
ئەبینی لە خووی بەد گەڕانەوە
هەندێ مێزەری سپی عالمی
دائەگرن ئەبنە پەندی عالەمی
سێدارەدارێ خوا لێی بێ ڕازی
مێزەری بەستو، چوو بوو بە قازی
خوا كە بیەوێ پیاوێ بێدین كا
كردووەوەی بەدی لاشیرین ئەكا
حیرسی دنیاییو ئارەزووی لیرە
هێند بەداخەوە لەشیان بۆی لیرە
نازانن دنیا كورتەو كەم ماوە
مەرگ زۆر نزیكەو عومریش كەم ماوە
بە زللەی ئەجال كە هات بەلادا
لێی لادە، كەسی ناچێ بەلادا
كە كەواو كفن كران ئاڵوگۆڕ
ئەوسا ئەزانێ كە هاتۆتە گۆڕ
دەست ئەكوتێ لەدووی پریاسكەی پارە
هەروا ئەزانێ زیندوەكەی پارە

شــــافیعی شـــێخی دنیــــاو قیامــــەت
کــەوتــە تــەحلیلــی عیلمــی قیافــەت
شارەو شـار گـەڕا لـە شوێن ئـەم ئیشە
زاتــەن حــەدیــسی پێغــەمبــەریــشە
حـەدیـس دوو زاتی جـەزبـە کـردووە
ئـــەوانی‌تـــری وا نـــاو بـــردووە
ئیمام تەشریفی ڕووی کـردە دێیـەک
تووشی یەکێک هات لە سەرەڕێیەک
کورتـە بالاییـەک مـووزەردی چاوشـین
ڕوو، لـچو لێـوی گرژبـوو لـەبـەر قـین
هـەمـوو نیـشانەی خراپـەی پێـوە
هـات بـە پیریـەوە لـە ڕاستە ڕێـوە
ئیمام ئەعوزو بیللای لە ڕاست خوێند
ئـەو میوانـداریی کـرد بـە تکـاو سـوێند
هەر بۆ تـەجروبـە لـەگـەڵ کـابرا چـوو
ئـەیـروانی کـابرا زۆر بـە خزمـەت بـوو
ئـەو شـەوە تـا ڕۆژ نـەنووسـت لـەتـاوا
کـابرا تــەجروبــەی دابــوو بــە ئــاوا
بـەیـانی هـەڵـسا فـەرمـوودی وا ئـەڕۆم
(گــوێ دریــژ)ە کــەم بێنــەدەرێ بــڕۆم
وتی پیـادە بـووی گـوێ دریـژت نـەبـوو
فەرمووی: تەجروبەم وا بە ڕاست دەرچوو



ئــــەمـــــڕۆ وا بــــــورجی پیرێژنانــــە
لــە هــەمــوو لایــی ســەهــۆڵ بــەندانــە
چلــەمــان کێــشا، بــەڵام نــەک چلــە
بــــێتفاقییـــــە کــــە تـــــەوقـــی ملـــە
تــورک وتوویانــە (کــارت گــیری باقــەر
قازمـــە کورکــــگ ســــاپنی یاقــــەر)
من ئەمساڵ کورسیی نووستنم سووتاند
بە کورسیی تەشقی سەهۆڵم شکاند
سەر بەفرەو سەرمایش وای دا بەسەرما
چۆن دەرچووم؟ سەرم لەو سڕە سڕ ما
لافــاو شــارێکی کــۆنی ویــران کــرد
هــەزاران نفــووس لــە نــاو ئــاوا مــرد
خۆ دیارە دیجلەیش ئەمساڵ بە جۆشە
عالــەم بــە برســی تــرس بــەپــەرۆشــە
لـــەم تـــەنگانـــەدا حیـــزبی موعـــاریز
کــەوتوونــە نــەعــرەی (هــل مــن مبــارز)؟
ئێوە لە پێشدا خواردتان، گەڕ ئەکەن
بۆ پاشەڕۆکی خەڵکیش شەڕ ئەکەن
ئـــەوســـایەی ئێـــوە کارتـــان ڕەوا بـــوو
بۆچی ڕێی قسەی هیچ کەستان دابوو
دیــارە نــەگبــەتــە وا لــە یــەک بــەربــوون
دەستی چەور بەسەر خەڵکیدا ئەسوون



خوا لەم بەدەنەی بە ئێمەی داوە
دوو چشتی زدی تیادا داناوە
یەکێکیان ڕوحە ئەو بەو پاکیە
ئەوی‌تر نەفسە بەو بێ‌باکیە
ڕۆح ڕووی لە خوایەو نەفسیش لە شەیتان
عەقلیش خوا داویە بێ بە پاسەوان
بەلام ئەم پەندە هی پێشینانە
کە ئەڵێن عەقل لای پیاو میوانە
ئەو عەقڵەی کەوا میوانە لە لات
ئەبینی لە پڕ لە دەست نەفس هەلات
عاقل ئەڵێ کارێک کە لە ڕێتایە
لێکی بدەرەوە، بزانە چی تیایە؟
ئەگەر ئەنجامی بە چاک ئەزانی
هەوڵی بۆ بدە هەتا ئەتوانێ
خۆ ئەگەر زانیت نەتیجەی نییە
خۆ ماندووکردن فایدەی چییە
بەلام کە شەیتان نەفس ئەجوولێنێ
لە ڕۆح‌و عەقڵێش سەر ئەشێوێنێ
ئێستا نەفس ئەڵێ... باشە
ئەم هەموو ژنە جوانەت یۆڵداشە
تۆیش جلەو لە دەست عەقل وەرئەگری
دوایی کە کەوتی هەر ئەو بۆت ئەگری



پێش پێغەمبەری خاتمونبی
قەهرو جەزایخوا زوو ئەهاتەدی
لە ئاو قەومی نووحی ئەخنکاند
بەسەر قەومێکدا شاخی ئەرووخاند
خۆ ڕەشەباکەی کە بێرە فێرە
خەڵکی ئەفڕاند وەک گای بەرگێرە
هەندێ زراویان ئەتۆقی بە دەنگ
ئەباری بەسەر قەوما گڵ‌و سەنگ
پێغەمبەرەکەی ئێمە پەیدا بوو
ئەم ڕسوایيە هەمووی کۆتا بوو
ئێستا خەڵک ترسی ئەوەی کۆتا بوو
هەموو جەزایێک کەوتۆتە دواوە
هی ئەوتۆ هەیە ئەڵێ ئەمڕۆیە
ئەوی بێ‌کەیفیی کرد، ڕەنجەڕۆیە
بە ڕاست و چەپا دەست ئەوەشێنێ
ئەکوژێ‌و ماڵی خەڵک ئەڕووخێنێ
لە جەجاڵ زۆرتر خەڵکی لە دوایە
لە هەموو لایێک ئەمری ڕەوایە
چوونکە لەم ڕەنگە زۆرداری باوە
کەسیش باوەڕی بە خوا نەماوە
یەک ڕێیە بۆ خوا کە ماوەتەوە
یا چاک کاتەوە، یا پاک کاتەوە



ئـەم دنیایـەیـوا بـۆی بـەچـلوچۆین
بە ڕووتی هـاتووین، بـە ڕووتی ئـەڕۆیـن
هێندە بەجەورین، وەک کاسەی چەوریـن
ئـاو ناگرینـە خـۆ بـە گـڵو دەوریـن
تـەنهـا کفنێکمـان ئـەگـەر پـێ ببـڕێ
ئـەویـش لـە خاکـا بـەرنـاگرێ، ئـەدڕێ
خـوا دەولـەتمـان لـێ ئـەسێنێتەوە
تـەنهـا ناوێکـە ئـەمێنێتـەوە
هـەر ئـەو نـاوەیـە کـە لـە پـاش خۆمـان
واسـیتەی ڕەحمـەت ناردنـە بۆمـان
ئـەگینـە ئـەوا جـەمعـی خۆمانـە
دانیـشتووین تێکـڕا، گفتوگۆمانـە
چاومـان لـە یـەکـەو زوبـان ئـەدوێـین
کە هەڵساین ئیتر لە یەکتر گـوم بـووین
هـەروەکـوو خـەیـاڵ بـیرت ئـەکـەوێ
کـەوتـە بـەیـانی ئـەبـێ بـە خـەوێ
کـەواتـە دنیـا خـەو یـا خـەیاڵـە
شـوێن خـەوو خـەیـاڵ کـەوتـن بـە تاڵـە
شـوێنێک بـوێ کـە هیجگـاری بـێ
دوور لـە بـەدکـارو دڵئـازاری بـێ
ئـەویـش ئـەولایـەو بـە دەسـت مـەولایـە
تـۆ تـەقـەلای چیـت بـەملاو بـەولایـە



کۆ ئەبینەوە لە دەوری (هاری)
بە زۆر باراشمان لە ئاش ئەهاڕی
ئێمەی لەپشتین بەوە ئەخوڕین
تۆبە باراشی بێ دەست ئەبڕین
بە هۆی ئێمەوە هەتا وای لێ دێ
لە پڕێ ئەبێ بە میرکوڕی دێ
کە گەیە ڕیزی ئەلیوەیس پاشا
لە دۆستو دەستەی خۆی ئەکا حاشا
ئەڵێ ئەمانە با لەناوبەرم
نەوەکا منەت بخەنە سەرم
ئەم بەو ئەشکێنێو خۆی لە پەنادا
سەیر ئەکاو چەرازی تری لە دوادا
ئەزانێ ئێمە بەندەی زۆرداریـن
بە کەیفی ئەوان لێک دەست بەدانیـن
ئینجا کە هاتوو تەواو باوی سەند
یاریدەدەری ئەخاتە بەند
تالانیان ئەکاو ژنیشیان دێنێ
ئەمەتە وەفای دۆستەکەی دوێنێ
لە دەست ئەو هاوار ئەبەنە بەر خوا
دەنگی غەیب ئەڵێ: گۆڕتان بێ ئاوا
ئێوە یاریدەی زۆردارتان داوە
هێشتاکوو جەزای زۆرترتان ماوە



پـەچـەیـە جـوانیی پـێ دەردەکـەوێ
شـەو نـەبێ ڕووی مانگ نـابینی شـەوێ
ڕووهـەڵماڵـراوی مـاڵ وێـران ئـەکـا
پـەردەداریـیـە جـوانی جـوان ئـەکـا
جوان لە بەر چاو بێ، تیری لێ ئەخۆی
کـە شـاریەوە شـێتگیر ئـەبی بـڕۆی
بێشـەرمـی شـەڕی زۆر لـێ قـەوماوە
لـەبـەر ئـەوە خـوا شـەرمـی داناوە
ئـاینی ئیـسلام وا قـاڵ کـراوە
هـیچ قـۆرتو قـەڵـبەی تیـاد نـەماوە
ئێمـە ئـەو دینـە پاکـە جێدێـڵین
لـە سـەر ئـادابی ئـەورووپـا وێـڵین
تـازە کچانمـان وەک نێـرە کوڕکـە
لـە ئـەرووپـادا کـەوتوونـە فڕکـە
دیـارە کـە شـەرمیـان لـەلا نـەماوە
باوکانیـان لـە بـەر خـەڕەک داناوە
هـەر واتـان زانی کارێکیـان قـەوماند
وەک (دوختی ئێران) گەوهەریان دۆڕاند
خـوا خـۆی سروشـتی ئـافرەتی داوە
بـێحیکمـەت نیـیە شـەرمـی داناوە
بـەلام شـەیتانمـان بـەسـەردا زاڵـە
لـە ڕێـی ئیسلامی لادایـن بـەم حاڵـە



بــۆ کــاری دەوران خــەم مــەهێنــەبــەر
هــەرچــۆنی بیگــری ئــەو دەچێتــە ســەر

درەخـــتی دنیـــا پڕیـــە لـــە میـــوە
هــیچ کــەســێ تــا ســەر بــەری نــەچنیــوە

هــەنــدێ کــە نــسیب بــۆی ئــەگــەیێنــێ
تێــر ئــەخــواو لــق و پــۆپی ئــەشــکێنێ

هــەنــدێکیش کــەوا قــسمەت نایــداتێ
هــەر هــەڵــدەپــەڕێ و دەســتی نایگاتــێ

ســێبەرەکــەیــشی هــەر تــاوە تــاوە
جــێ جــێ ئــەگــۆڕێ، لــەگــەڵ هــەتاوە

ئــەیشزانین تــا ســەر بــۆ هــیچ کــەس نیــە
کەچی ئەم خەڵکەی لە دوو (شــەقــی)یــە

دوو کــەس گــرەویــان لــێ بردۆتــەوە
کــــەوا پــــشتێنیان لــــێ کردۆتــــەوە

یــەکــەمیــان ئــەوەی کــە لــە هــیچ ناگــا
بــوون و نــەبــوونی کــاری لــێ ناکــا

شــەیتــان بــەم خــەڵــکە وا پێــدەکــەنــێ
ئــەم بــە پێکــەنــین ئــەو دەتــەقێنــێ

دووەمیــان ئــەوەی کــە بــە هیدایــەت
کــەوتۆتــە ســەر ڕێــی عــەقڵ و دیرایــەت

هەمیشە لەگەڵ خوای خۆی هــەڵــدەســێ
بــەوە لایــداوە لــە هــەمــوو کــەســێ



ئـافرەتی زگـپـڕ کــە ژان ئــەیگــرێ
وای لــێدێ هیــوای لـە گیـان ئـەبــڕێ
هـاوار ئـەکاتـە شـەخـس و پـیرەکـان
ئــەلــێ دەخیلـــە بمگـــەنــێ ئامــان
ئەیشلێ تۆبـەم بـێ ئیتـر هـیچ شـەوێ
لاقـم لــە لاقــی مێــردم نــەکــەوێ
کــە ڕزگــاری بــوو جــارێ لــە ڕاوێ
حـەوتـە حـەمـامی بـە وشـکی نـاوێ!!
قومـمـاریش وایـسـە کـــە بیـــدۆڕێنێ
وای لــــێدێ ئیتـسر پـسارەی نامێنـــێ
هـەزار سوێند ئـەخـوا، تـەڵاقیش بـاوە
کــە ئیتــر قومــار نــەکـا تـا مــاوە
هــەر ئــەوەنــدەیــە تــا ئــەگاتــە شــەو
نـانی پـێ نـاخورێ ئـەڕوا بـە سـەرڕەو
لـە هـەر شـوێنێ بـێ پـارە ئـەسێنێ
گـەوتـە کـۆڕ ئـەوەیـش زوو ئـەدۆڕێنـێ
دەردێکـــە قومارکـــە بـــێدەوایـــە
کــەچــی لای هــەمــوو عالـەم ڕەوایـە
ئینسان لە (زینا) و (شـەراب) تێر ئـەخـوا
قومــار هــەتــا بــێ شــێتگیرتر ئــەڕوا
جـاران بـە قـانوون مـەمنووع بـوو قومـار
ئیـستا بــەڕەسمــی هاتۆتــە ڕووی کــار



ئــەوەنــدەیــان گــوت بــاران نابــارێ
تــا دەرکــی (کونــدە) بــەربــوو بــە جارێ
کاتــێ کــە (خــەلــە) لــە (خــەرمانــا) بــوو
فــەقــیر و هــەژار لــە فرمانــا بــوو
کونــدەی ســەرەوژێــر کردیــە ڕەهێــڵە
چــرا هــەڵبــڕەو خــەرمــان جــێ بێــڵە!
پێیــان ئــەگــوتین کــە بــێ ئیمــانن
دەســت لــە کــاری خــوا مــەدەن نــایزانن
حیکایــەتــەکــەی خــدرو مووســایە
هــەمــوو کــاری خــوا ســرێکی تیایــە
خێــر ئێمــە ئــەڵێن وا نــەبــێ وا بــێ
بــۆ ئــەمــەی کــاری خۆمــان ڕەوا بــێ
دە هــەڵــجڕنگێنن لــەم کارانــەدا
بارانــە بــڵێن، لــەم بارانــەدا
خــۆ برووخێــشمان هێــشتا لــە بــیرە
بــە ســەر خۆمانــا تــەپــی ئــەم بــیرە
ئــەمــان ئــەزانی کــە بــە بــەردۆخــێ
بــیری نــەوتی کــۆن وا زوو نــاڕەووخــێ
ئێمــە ئیمانمــان ئــەبــێ بــە خــوا بــێ
کــە ... بــێن لای ئــەومــان نابــێ
ئــایینی ئیــسلام چــی لــێ چــاترە
ئــەتــەوێ پیــاو بی دینــت ڕاگــرە



بـــاوو باپیرمـــان بـــە ئاموژگـــاری
پێیـان ئـەگـوتین بـە ڕاسـتو دیـاری
ڕۆڵـە چـاوی پـیس وەک تیغ کارئـەکـا
زۆر پـەنجـەی بـە هێـز کۆڵـەوار ئـەکـا
کـە چـاو بـە ماڵـی کـەسێ هـەڵـدێنن
بـەردی بنچینـەی لـەبـن دەردێـنن
حـاکمی(بابـان) چـارەیـان دیـوە
زۆر چـاوی پیـسیان کـە هـەڵکۆڵـیوە
هەر وەک چاوی پیس بە تەجرەبەیە
نـەگبـەتی و شـوومیش زۆری بـۆ هـەیـە
نـەگبـەتی لـە چـوار چـشتا بینـراوە
ئێـستایش ئـەو چـوارە شـوومیان مـاوە
یـەکـەم ولاخـە، کـە وا هـەنـدێکیان
شـوومەۆ زەرەری زۆرە بـۆ ئینـسان
دووەم خـانووە ئـەویش مـەعلوومـە
هـەنـدێکیان ڕزقـی تیـا نیـە شـوومە
سێیەم ژن، کـە پێـی بـە مێـرد ناکـەوێ
خۆشـی نـابینن پێکـەوە شـەوێ
چـوارەم پیاوێکـە، تـا بـڵێی عـاقڵ
لـە ئیـدارەدا زۆر زانو کـامڵ
کـە چـی ئـەمـەنـدە نـەگبـەت گرتوویـە
دەسـتی هـەر کـەسێ بـۆ بـێ خـستوویە



بەد کرداریمان هێندە خەست بووە
کە پێی پیاوەتیی تێدا پەست بووە
چاکو خراپی بووە بە هەوەس
هیچ کەسێ ناوی چاک نادا بە کەس
ئەم تەکاپۆیەی ئەهلی دنیایە
یا لە ترسایە، یا لە برسایە
نایشرانن ئەوەی کە لێی ئەترسن
گەیە ڕۆژی خۆی لێی ناخەلەسن
خۆ دەوڵەمەندیش داویەتە بەری
بۆیەکی ئەوێی کە تۆ بۆی بەری
دیوەخانانیش خۆ ئاموشۆی ناکەن
زۆرتر غەیبەتی برای تیا ئەکەن
بەرەکەت ئێستا (پۆکەر) لە ناوە
ڕێی قسەو باسی غەیبەت بڕاوە
بەڵام ئەویشیان کردوە بە قومار
سەرت نەسووتێ لێی نابی ڕزگار
ئەمانەی کەوا لێی بەلەسە بوون
هی بێئیشییەوە مل لە چەقۆ سوون
ئەگەر ئیشێکی بوو نانی تیابێ
کەس دەخلی بەسەر کەسەوە نابێ
ئەگینا کەست بۆ نایەتە دێ
بۆ خورما، کەر شوێن (جەجاڵ) ئەکەوێ



جاران کە کوردی ڕاستو ڕەوان بووین
خاوەندی وەفاو دڵو زوبان بووین
لە وەزیفەیشدا سیاسەت نەبوو
تەفرەمان، تەفروتونا کردبوو
هەروەها گیزریی ئەچوونە مەیدان
ڕێمان نەدابوو بە فێڵی شەیتان
لە پڕ کەوتینە سیاسەت بازی
وەک (پرنس بسمارک) لە دەستە (نازی)
ڕێی سیاسەتیش هێشتا فێر نەبووین
ڕوومان بۆ هەرکوێ نا، بە هەڵەچووین
ڕۆژێ ئاغامان گرتە سەر سەرمان
نەمانبردەسەر تا وادەی فەرمان
وتمان بەگزادە، بزانین ئەو چییە؟
ناشوکری نەبێ بەگزادە نییە
ئینجا وا هۆمان کەوتەوە سادات
لای ئەوان دەستمان کرد بە فەسادات
ئەوانیش چونکوو زۆریان دڵسافن
هۆگری مەدح و لافو گەزافن
بە گوێرادێری لە خشتە ئەچن
لە ناو خۆیانا ئەبن بە دوژمن
هیچیان ناوێستن لە سەر هیچ بارێ
دەسا قەومی وا بەردی لێ بارێ



ڕەحمـــەت لـــە ڕۆحـــی شـــاهانی ...
کـــە دەســـتووریکیان هێنایـــە جیهـــان
قـەت نـاوەجاخیـان نـەخـستە سـەر کـار
پایـــەیـــان نـــەدا بـــە پیـــاوی بێعـــار
کوڕیـــان دائـەنـــا لــە نـــاو مـــەجلیـــسا
تێر تێر گـوێی ئـەگـرت ئینجا هـەڵـدەسا
ئـەو تـەربیـەیـەی لـەوێ وەریـەگـرت
مامۆسـتای مـەکتـەب ڕێـی پـێ نـەدەبـرد
خـوێنی ئـەسالـەت بـەهـرەی ئینـسانە
ڕەســـەن شـــەرەفی جنـــسی حـــەیوانـــە
ئـەمـە بـووەتـە تـەجروبـەی دەوران
زۆرجـار نـەتیجـەی هاتۆتـە مـەیـدان
کـەچـی کـەوتووینـە دەورێکـی واوە
هـەرچـی پـارەی بـوو ئـەڵـێن تـەواوە
بـــەڵـــێ ئـــەبـــینی ئێـــستە کـــە پـــارە
زۆرتـــری لـــە لای پیـــاوی بـــێ عـــارە
بەڵام فایدەی چیێ؟ کەڵکی کەس ناگرێ
بـــە مێـــردی تـــازەی ژنی ئـــەبـــڕێ
ئەوی بە نەسـەب فـەجری ڕووناک بـێ
ئەبێ بە حـەسـەب کـردەوەی چـاک بـێ
بـە ئێسترپان گـوت: بـاوکی تـۆ کێیـە
وتی: ڕەســـــەنی دایکمـــــم پێیـــــە

